# ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون

خۆپاك و چاككردن لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا

THE PATH TO GOD
AND RIGHTEOUSNESS

1442 - 2021

عەلی باپیر




چاپی
06
بە پاڵاوتن و
زیادکردنەوە






رێگای صاڵح بوون و بەرەوخوا چوون

نووسینی: عەلی باپیر



چاپی شەشەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ ز



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی 30 مەتری، تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
رێگای صاڵح بوون و بەرەوخوا چوون، عەلی باپیر (نووسەر)
٤٥٦ لاپەڕە،
١٧* ٢٤ سم
بابەت، تەزکیە
ISBN: 978-9922-632-77-3

لە بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٦٣٠) ی ساڵی ٢٠٠٥ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

خـــەت: نەوزاد کۆیی
دیزاینی ناوەرۆك : جمعە صدیق کاکە

# ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون

## خۆپاک و چاککردن لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

چاپی شەشەم

بە پاڵاوتن و زیادکردنەوە

عەلی باپیر

چاپکردنی نوێی کتێبەکانم بە نۆرە بە گوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو.

وە ئێستا بە هیوام وابوو شێوەی چاپکردنێکی

وابێ تا بۆ بڕە خەرجییەکی کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەران بێ. جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ.

خوا بەرەکەت بخاتە ئیش و کاریانەوە و لەگەڵیان

بێت، هەمیشە سوپاسیان دەکەم.

علی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد ومن والاه

بەندە (عەلی باپیر) ڕێگە بە مامۆستا مخلص و
نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و
بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا ڕێگەی خێری زیاتریان
بخاتە پێشی و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچکەسیدیکە مافی چاپ و
بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧

فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨

قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩

وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠ ﴾

الأحزاب

# پێشکەشە

بەو مسـولْمانانەی کە لە سایەی تەزکیـە بوونیانەوە:

❀ زەین هۆشیارو ،

❀دڵ بێـدارو ،

❀ جوان ئاکـارو ،

❀ خۆش ڕەفتارنو ،

❀ بۆ خوای پەروەردگـار بەندەی ڕاستو پاكو ،

❀ لەگەڵ براو خوشکانیاندا هـەتا بڵـێی وەفـادارو چاکن.

❀لەگەڵ خەڵکدا بەگشتیی، دڵسۆز و بەپەرۆش و بەکارن.

# پێشەکی
# چاپی شەشەم

الحمدلله، والصلاة والسلام على رسول الله، وآله المهتدين بهـداه، مـن الصـحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسانٍ إلى يوم لقاء الله.

**خوێنەری بەڕێزو سەنگینم!**

لەچاپی شەشەمی ئەم کتێبەدا "کە خۆشەویستییەکی تایبەتییم بۆی هەیە" ئەم گۆڕانکارییانەمان کردوون:

**یەکەم:** بەوردیی‌و وشە بەوشە پێیدا چوومەوەو، لە هەڵەو پەڵە پێشووەکان بژارێکی باشم کردوەو، هیوادارم لەجاران پاك‌و پوختتر بووبێ.

**دووەم:** هەندێك دەقی سوننەت باشترو وردتر (تخريج) کراون‌و، چەند ئایەتێك‌و فەرموودەیەکیش کە پێشتر مانا نەکرابوون، مانامان کردوون.

**سێیەم:** بەشی نۆیەممان لـێ زیاد کردوە کە لەبارەی بیرۆکەی: (یەکبوویی: وحدة الوجود)ەوەیەو، هەوڵمداوە بایی بەرچاو ڕوونبوونەوەی خوێنەرو پێویستییەکەی، قسەی لەبارەوە بکەین.

**چوارەم:** بەشی دەیەمان لـێ زیادکردوە، بەناو و نیشانی: (تەصەووف‌و صۆفییەکان) کە لە حەوت کورتە باسدا، پوختەو گوشراوی بیروڕای خۆم لەبارەی تەزکییەو تەصەووفەوە باسکردوە.

**پێنجەم:** ناوەكەیمان ئاوا گۆڕی: **(ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون: خۆ پاكو چاككردن لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا).**

هیواداریشمو لەخوای بەخشەریش داواكارم:

ئەم كتێبە كە هەتا ئێستا (١٠/١٠/٢٠٢٠ز - ٢٣/٢/١٤٤٢كـ) ئەوە شەش جاران چاپ بكرێو، هەزاران نوسخەی لـێ بڵاوبۆتەوەو، لەهەندێك لە مامۆستایانم بیستەوە كە چەندان جار بەدەرس گوتوویانەتەوەو، كردوویانەتە ماددەی وتارەكانی جومعەو، پێم وایە هەزاران گەنجو لاوی پێ بەرچاو ڕوونبوونەوەو، پەروەردەبوونو، لەخوا نیزیك كەوتوونەوەو سالح بوون، لەمەودواش پیتو پێزی زیاتر تێبچێو، چاكتر بۆ خوێنەرانی بەربگرێو، بەتایبەت لەلایەن پەروەردەكارانەوە بایەخیی پتری پێ بدرێ.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك.

١٠/١٠/٢٠٢٠ز

٢٣/٢/١٤٤٢كـ

هەولێر



# پێشەکی
# چاپی پێنجەم

إِنِ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كَلامُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ[1].

---

(١) هذه الخطبة تسمَّى (خطبة الحاجة) وهي تُشْرَعُ بين يَدَي كل حاجة، رواها كل من: الترمذي برقم: (١١٠٥) وَحَسَّنَهُ، والنسائي برقم: (١٤٠٤)، وابن ماجه برقم: (١٨٩٢)، والطبراني في (الأوسط) برقم: (٢٤١٤)، وأحمد برقم: (٣٧٢٠)، وروى طرفاً منها مسلم في صحيحه.

خوێنــەرە بەڕێزو خۆشەویســتەکان !

ئەم چــاپەی پێنجەمی ئەم کتێبــە (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون) بێجگــە لــە ڕاستکردنەوەی هەندێك وردە هەڵــەی چاپیـــیو، چــەند وردە دەســتکارییەکی کــەم، دوو جیاوازیی دیکەی سەرەکیی هەن، لەگەڵ چاپە پێشــووەکان دا:

یەکــەم: سەرجەم فەرمایشتەکان لە سەرچاوە متمانــە پێکراوەکــانی ســوننەتەوە (تخـريج) کراون، لەلایەن برایەکی گەنجەوە، کە نەیویست ناوی بهێنم، خوا پاداشتی بداتەوە، کە دیارە ئەو لە ئەسڵ دا بۆ تەرجەمە عەرەبییەکەی ئــەو ئەرکــەی کێشـــابوو[١]، بــەڵام دوایی (تخريج)ەکانی خســتنە سەر ئەم چاپی پێنجەمە کوردییەش.

شــایانی باسیشــە چەند دەقێك کە لە ڕووی سەنەدەوە بێهــێــز بوون، لامان بردن.

دووەم: لە سۆنگەی ئەوەوە کە زیاتر لە دە (١٠) ساڵ بەسەر دوا پێداچوونەوەمدا بــۆ ئــەم کتێبــە تێپەڕیوە، کە (٣٠/١٠/٢٠٠٠) یە، لە ماوەی ئــەو یــازدە ســاڵەدا هــەورازو نشــێوی زۆرم هاتوونەڕێ، کە کاریگەرییان لەسەر حاڵەتی بەرەو خواچوونم هەبووە، بە پێویســتم زانی، ئەگەر بەکــورتییش بووە، جارێکی دیکــە دوا بۆچــوونو ســەرنجەکانی خۆم، لەبــارەی تەزکیەی نەفسو ســەفەری صــاڵح بوونو بەرەو خوا چــوونەوە، تۆمــار بکەم، بەتایبەت ئەزموونی بیســـتو دوو (٢٢) مانگــەی زینــدانیی کــردنم لەلایــەن ئەمریکــاوە.

هیواداریشــم ئەم کــتێبە لەم چاپی پێنجەمەی دا – بە زمانی کــوردیی- و لــە چــاپە عەرەبییو فارسییەکەیشی دا[٢]، ئەو ئامانجانەی، کە بۆیان نووسراوە، بە جوانترین شــێوە بیانپێکــێو، خــوای بەخشــندە بــە بــەزەیی بێســنووری خــۆی، ئــەم کتێبــەو ســەرجەم بەرهەمەکانی دیکەشم، بکاتە مایەی زیاتر تێگەیشتنو چاکتر پێگەیشــتنی مســـوڵمانان، بەتایبەت چینــی تازەپێگەیشــوو و گەنجان لە کوڕانو کچان، کە بێگومان لەم ڕۆژگارەدا

---

(١) کە ئێســتا (دار الحکمـة)ی لەندەن سەرگەرمی چاپکردنیەتی.

تێبینیی: لەمێژە چاپ و بلاوکراوەتەوە.

(٢) ســوپاس بۆ خوا ئەویش بەرێوەیە.

لە هەموو کاتێك پتر پێویستییان بە لەخوا نزیکبوونەوەو، صاڵح بوونو نەفس تەزکیەبوون هەیە، چونکە لە لایەکەوە گەردەلوولو ڕەشەبای فەسادو داڕووخانی ڕەوشت و خووی پەسند، ئێستاکە توندتر لە هەر سەردەمو ڕۆژگارێکی پێشوو هەڵیکردوە، لە لایەکی دیکەشەوە تەوژمی ئیسلامیی، خەریکی هەرچی زیاتر دەبێتە جێگای هیواو ئومێدی کۆمەڵگاکانی مسوڵمانانو، بەدیلی ڕژێمە خۆسەپێنە سێکۆلاریستەکان!

دیارە هەر کام لەم دووانەش لەسەر تەوژمی ئیسلامییو ئەندامەکانی بەتایبەتو، مسوڵمانان بەگشتی پێویست دەکەن، کە لەڕووی ئیمانو تەقواو تەزکیەی نەفسو لایەنی مەعنەوییەوە، هەرچی زیاتر خۆیان بەهێزو پێز بکەن، تاکو لەبەردەم ڕەشەباو گێژەڵووکەی بەرهەڵدایيو فەساددا، خۆڕاگرو نەلەخشاو بنو، لە بنباری بەرپرسیارێتیی، پاکسازییو چاکسازیی کۆمەڵگاشدا، جێی متمانەو وەك پێویست و شیاو بن.

خوایە ! بە کەرەمو بەزەیی و چاکەی بێ سنووری خۆت، هەرچی زیاتر ئیمانمان کاملترو، پارێزکارییمان زیاترو، خواپەرستییمان چاکترو، ڕەوشتو خوومان جوانترو .... سەرەنجام نیزیکییمان لەخۆت زیاتر بکە.

سبحانك اللهم و بحمدك، أشهد أن لاّ إله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك.

بەغدا

ئەنجوومەنی نوێنەران

٢٨ صفر ١٤٣٣ - ٢٠١٢/١/٢١

# پێشەكی
# چاپی چوارەم

الحمدلله رب العالـمين، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على جميع الأنبياء والمرسلين، خصوصاً سيّدهم وخاتمهم محمد إمام الـمتقين وقائد الـمجاهدين وآله أجمعين، من الصَّحْب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان !

بەپێویستی دەزانم، كە لە پێشەكی ئەم چاپە چوارەمەی (ڕێگای صالّح بوونو بەرەو خوا چوون)دا، كە لەلایەن نووسینگەی تەفسیرەوە ئەنجام دەدرێ، ئاماژە بۆ چەند خالّێك بكەم:

١/ تەزكیەی نەفس: خالّی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسولّمانانو ئەهلی ئیمانەو، لەسەر هەر كامیان پێویستە، كەمو زۆر پشكو بەشی تێیدا هەبێ، ئەگەر بیەوێ بە مسولّمانو ئیماندار لەقەلّەم بدرێ، بەلّگەش لەسەر ئەمە، ئەوەیە كە خوای كاربەجێ سبحانه وتعالى سەرفرازیی (فلاح)ی كردۆتە ئەنجامو بەرهەمی تەزكیەی نەفس، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس.

٢- ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ الأعلى.

وشەی (فلاح)یش، كە ئێمە بە (سەرفرازیی)مان تەرجەمە كردوە، بریتیە لە:

{بە ئامانجو مراد گەیشتنو، لەخەمو پەژارە دەربازبوونی ڕەها لە دنیاو دوارۆژدا}.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە خوای زاناو توانا (جلّ شأنه) ڕایگەیاندوە، کە (تزکیة) سەرفرازیی (فلاح) بەرهەم دێنیو، پێچەوانەکەیشی، کە (تدسیة)یە — واتە نقومکردنی نەفس لە چڵکو چەپەری گوناحو خەسڵەتە پەستەکاندا- زیانباریی و پەشێمانیی (خیبة) وەدی دێنێ، کەواتە: هەر مسوڵمانێك بەتەمای سەرفرازیی و لەخەم ڕەخسینو، بەختەروەربوون بێ، دەبێ کەمو زۆر پشكو بەشی لە تەزکیەدا هەبێ، ئەگەرنا بە مەرەدی ئەو کەسە دەچێ، کە بەبێ مەلەزانین خۆی بە دەریایە دادەدات، یان بە گیرفانی خاڵیی، کەلوپەلی کڕین، سەودا دەکات!

٢/ بەڵام ئەگەر (خۆ تەزکیەکردن) جارێك بۆ مسوڵمانان بەگشتیی، فەرزو پێویست بێت، ئەوە بێگومان بۆ کەسانێك، کە لە مەیدانی کارو چالاکیی ئیسلامییدانو، دەیانەوێ خەڵكو دەوروبەرەکەیان بەرەو خوا بانگ بکەنو، فێری خواپەرستیی و دینداریی بکەن، چەندان جار پێویستە، چونکە ئاشکرایە، کە کەسێك شتێك شك نەبات، پێی نابەخشرێ (فاقد الشيء لا يعطيه)، دیارە پاکسازیی بە پاکانو، چاکسازیی بە چاکانو، (إصلاح)یش بە (صالح)ان دەکرێ !

پێویستبوونی تەزکیەش بۆ ئیشکەران (العاملین) لە مەیدانی کارو چالاکیی ئیسلامییدا، وێڕای مەرجبوونی بۆ سەرفرازیی و بەختەوەریی دوارۆژیان، لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: - وەك پێشتر گوتمان- کەسێك خۆی لەخۆیدا پاكو چاك نەبێ، ناتوانێ پاکسازیی و چاکسازیی لە دەوروبەریدا بکات.

دووەم: کەسێك کەمو زۆر خۆی تەزکیە نەکردبێ، سەختیی و دژوارییەکانی ڕێی خەڵك بۆ لای خوا بانگکردنو، فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەو...هتد پێ تەحەممول ناکرێو، بەرگەی فشارو کۆسپو لەمپەرو سەرئێشەکان ناگرێو، دووچاری پەککەوتنو وازهێنان، یان سەرگەردانیی و لادان دەبێو، کارەکەی نەك هەر بنەتۆو ناکاتەوە، بگرە زۆریشی لەسەر قەرزدار دەبێتەوە ! نموونەی ئەو جۆرە

کەسانەش، چ لە مێژووی مسوڵمانانو، چ لە واقیعی ئەمڕۆشماندا زۆرن[١].

دیارە ئەم ڕاستییەش یەکێکە لە حیکمەتەکانی ئەو هەموو جەختکردنەی خوای پەنهانبین (جل وعلا) دەرهەق بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، کە لە چەندان شوێنی قورئانیداو، لە سیاقی قسەکردن دەربارەی بانگەوازو هەقبێژییو، فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپەو، تێکۆشان لەڕێی خوادا، فەرمانی پێدەکات بە هەرچی زیاترو چاکتر، لە خوا نزیککەوتنەوەو، پشت بە خوابەستنو، خوا بە پاکگرتنو ستایشکردنیو، زۆر یادکردنیو، سەجدە بۆ بردنیو، شەونوێژکردنو، قورئان خوێندنو، دوارۆژ لەبیربوونو، دنیا بە کەمگرتنو...هتد، وەك لەم ئایەتانەدا دەبینرێ، کە چەند نموونەیەکن لەو بوارەدا:

١- ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾ العلق.

٢- ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر.

٣- ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ ﴾ الإنسان.

٤- ﴿ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾ طه.

بەڵێ (تەزکیەی نەفس) مایەی:

أ/ سەرفرازییو بەختەوەریی دوارۆژو،

(١) بە تێوەرامانی دیاردەی لادان (انحراف)ی ئەو جۆرە کەسانەش، بە ڕوونیی دەبینرێ، کە خۆشویستنی دنیاو شوێنکەوتنی ئارەزووەکانو خۆدەرخستنو...هتد، لەپشت ئەو نەخۆشییانەوەیەوەن، ئەمانەش هەموویان نیشانەکان (أعراض)ی نەبوونی تەقواو تەزکیەن.

ب/ سەرکەوتن‌و پیت‌و پێز هەبوون لە کارو چالاکیی داو،

ج/ سەلامەتیی‌و پارێزران لە پەککەوتن‌و ڕووخان‌و بەزین، یان گەندەڵ بوون‌و لادان‌و هەتلەبوونە، لە مەیدانی تێکۆشان‌و کارو جموجۆڵی ئیسلامیی دا.

هەر بۆیەش، من هەر کاتێك بابایەك دەبینم، کە لە مەیدانی کارو چالاکیی ئیسلامییدا، خۆی خەریك کردوە، بەڵام لە خواپەرستییە تایبەتییەکان دا، ساردو سڕەو، هیچی لە خەڵکی عەوام زیاد نیە، یەکسەر لە مێشکم دا نیشانەیەکی پرسیاری گەورە پەیدا دەبێ:

تۆ بڵێی ئەو بەڕێزە ڕاست بکات، کە لە خەڵکی عەوام زیاتر خوای خۆشدەوێ‌و، لێی دەترسێ‌و شەرمی لێ دەکات‌و، لەوان پتر ئیمانی بە ڕۆژی دوایی‌و لێپرسینەوەو بەهەشت‌و دۆزەخ هەیە و...هتد.؟!

ئەدی ئەگەر ڕاست دەکات، بۆچی هیچی لەوان زیاد نیە؟! ئەگەر ڕاستیش ناکات، بۆچی ئیددیعای وادەکات، بابایەك بۆخۆی ویران بێت، چۆن چۆنی غەیری خۆی ئاوەدان دەکات؟!

٣/ وەك چۆن ئەنجام (نتیجة)ێك، کە پەیوەستە بە چەند پێشەکیی (مقدمة)یەکەوە، بەبێ ڕێزکردن‌و ئامادەکردنی ئەو پێشەکییانە، چاوەڕوانییکردنی شتێکی پووچ‌و ناماقووڵە، بە هەمان شێوەش چاوەڕوانییکردنی هاتنەدی حاڵەتی (تەزکیە)، بەبێ ئامادەکردنی هۆکارەکانی‌و، گرتنەبەری ڕێبازەکانی‌و بەکارهێنانی شێوازەکانی، شتێکی بێجێ‌و خەیاڵێکی بەتاڵە!

ئنجا ئێمە لە دوو توێی ئەم کتێبەدا، بە ڕوونیی باسی ئەو بابەتەمان کردوەو خستوومانەتە ڕوو، کە ئینسانی مسوڵمان، چۆن چۆنی دەستی لە تەزکیەی نەفس گیردەبێ‌و، ئەو ئامانجە گرنگ‌و گەورەیەی بۆ مەیسەر دەبێ، بۆیە لێرەدا هەر بە کورتیی وەك ئاماژەیەك دەڵێم:

هەرکەسێك ویستی خۆی لە (فجور) بژار بکات‌و، بە (تقوى) بڕازێتەوەو، ببێتە خاوەنی نەفسێکی پاك‌و چاك (نفس مزکاة) پێویستە:

١) چاو بە بووناسیی و تێڕوانین و ئیمان و عەقیدەیدا بگێڕێتەوە، کە بناغەی دینداریی و مسوڵمانەتییەو، بەو جۆرەی لێیبکات، کە خواو پێغەمبەرەکەی لە قورئان و سوننەتدا ڕوونیان کردۆتەوەو بە ڕاستو پەسندیان داناوە، چونکە بێگومان بووناسیی تەواوو ئیمانی ڕاستو دروست، بناغەو ڕووحو هەوێنی تەقواو تەزکیەیەو، بەبێ وی، ئینسان هەرچەندە خۆی ماندوو بکاتو ڕەنجو تەقەللا بدات، بێهوودەیەو هیچ بە هیچ ناکات، خوای زاناو تواناش بە پێغەمبەری خۆی (صلى الله عليه وسلم) فەرمووە: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد.

وەك دەبینین هەتا فەرمانی پێنەکردوە بە خوا بەیەکگرتن (التوحید)، فەرمانی پێنەکردوە بە داوای لێبوردن لە خواکردن، کە هەنگاوی یەکەمی بۆ خوا صولحان و تەزکیەی نەفسە !

٢) سەرنجی خواپەرستییەکان(عبادات)ی بدات، بەتایبەت نوێژەکەی، کە کۆڵەگەی مسوڵمانەتییەتی و پەیژەی لەخوا نزیکبوونەوەیەتی لەڕووی:

أ- (خشوع)ەوە، کە ڕووحی نوێژو هەر خواپەرستییەکی دیکەشەو، خوای پەروەردگاریش ڕایگەیاندوە، کە مسوڵمانانی نوێژکەر بە گەردنکەچییەوە، سەرفرازن: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾ المؤمنون.

ب- بەجێهێنانی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا: ﴿ ...إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴿١٠٣﴾ ﴾ النساء، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) کاتێك پرسیاری لێکراوە: چ کردەوەیەك لە هەموو کردەوەیەك باشترە؟! فەرموویەتی: {الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا}[1].

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِي برقم: (٥٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٧٠) عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ.

ج- پاراستنی پایەو فەرزو سوننەتەکانو بەجێهێنانی بەو شێوەیەی، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژی بەرپاکردوە، چونکە خوای کاربەجێ، ئەو نوێژکەرانەی بە سەرفراز وەسف کردوون، کە پارێزگاریی لە نوێژەکانیان دەکەن: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ۝٩ ﴾ المؤمنون: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {صَلّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي}(١).

د- ئەنجامدانی بەکۆمەڵ -واتە هەرکام لە پێنج نوێژە فەرزەکان- چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژی بە کۆمەڵی بە بیستو حەوت پلە، بە چاکتر داناوە لە نوێژی تاك: {صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ، أَفْضَلُ مِنْ صَلاَةِ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً}(٢).

ه- کردنی نوێژە سوننەتەکان، بەتایبەت شەونوێژ (صلاة الليل)و وەترو ڕەواتیب، چونکە بە سوننەتەکان، کەلێنو کەموکوڕیی فەرزەکان پڕ دەکرێنەوە، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە.

هەروەها سەرنجی سەرجەم جۆرەکانی دیکەی خواپەرستییە شەخسییو تایبەتییەکانی دیکەی وەك: ڕۆژووگرتن، زیکری خواکردن، پاڕانەوە، قورئان خوێندن...هتد، بداتو، بە ئەمیەت پێدانی تایبەتی بەو جۆرو چۆنیەتییەی، کە شەریعەت بۆ هەرکامێکیان دیاریی کردوە، ئەنجامیان بدات.

٣) چاو بە هەڵسوکەوت (تعامل)و ڕەوشتو خوویدا بخشێنێتەوە، لە هەموو بوارەکانی ژیانیداو، وردو درشتی بە تەرازووی قورئانو سوننەت هەڵسەنگێنێو، هەر شتێك لە شەرعدا جێی نەبۆوە، دەستبەرداری بێتو خۆی لێ بژار بکات.

---

(١) رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٠٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٥٨) عَنْ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

(٢) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٥٠٩) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٠٥٢) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَلِلْبُخَارِيِّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: {بِخَمْسٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً}.

٤/ تەفاعول کردنیش لەگەڵ کتێبی خوادا - کە مەبەستم پێی ڕاستو دروست خوێندنیو لەبەرکردنیو، چاك لێتێگەیشتنیو بە جیددیی پێوەپابەندبوونیەتی- تاکە ڕێبازی ڕوونو بێچەندو چوونو ڕاستو بێگرێو گۆڵی، بەرەو خوا چوونو صالح بوونو نەفس تەزکیە بوونە، ئەدی ئەوەنیە خوا تبارك و تعالى فەرموویەتی:﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الاسراء.

کەواتە: هەرکەسێك دەیەوێ بەرەو خۆ تەزکیەکردن هەنگاو بنێ، با هەتا پێی دەکرێ لەگەڵ کتێبی خوا (کتاب الله)دا خەریك بێتو، زۆرترین کاتی خۆی بۆ تەرخان بکات، ئاشکراشە، کە بەبێ شوێن پێهەڵگرتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، ئاشنایی بە سوننەتو ڕێبازی موبارەکی، چاك لێتێگەیشتنی کتێبی خواو، پێوەپابەندبوونی، مەیسەر نابێ، وەك خوای کاربەجێ جلّ جلاله فەرموویەتی: ﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

سا خوای پەروەردگارمان ! بەناوە هەرەچاكو پەسندەکانت لێت دەپاڕێینەوە، کە یارمەتییمان بدەی، بەهۆی چاك تەفاعول کردنمان لەگەڵ کتێبە بەڕێزو موبارەکەکەتداو، بەهۆی باش شوێن پێهەڵگرتنی پێغەمبەرەکەتەوە (صلى الله عليه وسلم)، بتوانین خۆمان تەزکیەو پاكو چاك بکەین، تاکو صالح بینو بەرەو تۆ بێینو، بە دیدارت شاد بین، ئامین.

عەلی باپیر
٣ ڕەمەزان ١٤٢٦ - ٢٠٠٥/١٠/٦
هەولێر

# پێشەکی
# چاپی سێیەم

إِنَّ الحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ

وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ وَبَارَكَ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدِ الأَمِينِ الْمَبعُوثِ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ، وَآلِهِ أَجْمَعِين، مِنَ الصَّحَابَةِ وَالقَرَابَةِ وَالتَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلى يَوْمِ الدِّين.

خوێنەری بەڕێز !

ئەم چاپی سێیەمەی کتێبی (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون) کە نزیکەی یازدە (١١) ساڵ پاش نووسرانو چاپی یەکەمیەتی ، لە کاتێک دایە، کە مسوڵمانانی دنیا بەگشتییو مسوڵمانانی کوردستان بەتایبەتیی، لە سۆنگەی شەڕو خراپەی دەروونیانو ڕەفتارو کرداری بەدیانەوە، گیرۆدەو دووچاری چەندان گێروگرفتو دەردو نەخۆشییو گرفتارییو ناهەمواریی بوو ون.

بۆیە بەپەسندو بگرە بە پێویستیشم زانی، کە چاوێکی جیددیی بەم کتێبەدا بگێڕمەوەو، گۆڕانکارییەکی گەورەو ڕیشەیی تێدا بکەم، کە لە (ڕێ خۆشکردن)دا ئاماژەم پێکردوە.

بەڵێ، ئێمەی مسوڵمان لە گەرمەی کێشەو قەیرانەکانماندا، زیاترو چاکتر تێدەگەینو دڵنیا دەبین، کە وەك خوای زاناو تواناو کاربەجێ فەرموویەتی، بۆ گۆڕینو چاکسازییو پاکسازیی واقیعو بارودۆخی نارێكو پێك و شپرزو شێواومان، هەر دەبێ لە دەروونی

خۆمانەوە دەستپێبکەین‌و، ئاوێك كە لە سەرچاوە لیڵ‌و قوڕاو بێت، لە جۆگایە بۆت ڕوون نابێتەوەو، دیوارێكیش، كە لە بناغەوە لارو خوار بێت، لە سەرێڕا بۆت ڕاست نابێتەوە:

﴿... إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ... ﴿١١﴾﴾ الرعد.

واتە: خوا حاڵ‌و باڵ‌و واقیعی هیچ كۆمەڵێك ناگۆڕێ، هەتا ئەوەی دڵ‌و دەروونیان پێیەوە گیرۆدە بووە، نەیگۆڕن‌و چاكی نەكەن.

بەڵێ، بەڕاستیی بنك‌و ڕیشەی كردەوەو ڕەفتارە خراپ‌و ناشەرعییەكانمان، لە دڵ‌و مێشك‌و دەروونمان دایە، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فێری كردووین، كە بڵێین: {نَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا...}.

فاكتەرو هۆكاری تێشكان‌و بەزین‌و زەفەر بێبرانیشمان لە بەرانبەر دوژمناندا، بەر لە هەر شتێك هەڵەو ناشەرعیی‌و، كردەوەو سیفەتە خراپەكانمانن.

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ... ﴿٣٠﴾﴾ الشورى.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾﴾ آل عمران.

واتە: ئایا كاتێك بەڵایەكتان تووش بوو (كە تێشكانە لە جەنگی ئوحوددا) بە سەرسوڕمانەوە گوتتان: ئەوە چۆن‌و بۆچی‌و لە كوێوە بوو؟ لە حاڵێكدا كە ئێوەش (لە جەنگی بەدردا) دووقاتی ئەوەتان بەسەر دوژمن هێنابوو،– ئەی موحەممەد – بڵێ: ئەوە لەلایەن نەفسی خۆتانەوە بوو، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك تواناداره.

هەروەها خوای پەروەردگار، هەر لەبارەی هۆی تێشكان‌و پاشەكشەكردنی ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) لە جەنگی ئوحوددا، فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٥٥﴾﴾ آل عمران.

واتە: بێگومان ئەوانەتان، کە لە ڕۆژی بەرەنگاربوونەوەی دوو کۆمەڵەکەدا، پشتیان هەڵکردو ڕایانکرد، تەنیا لە سۆنگەی ئەوەوە بوو، کە شەیتان بەهۆی هەندێك لە گوناحەکانیانەوە خلیسکاندنی، بێگومان خوا لێیان بوردوە، چونکە خوا لێبوردەو هێمنە.

ئنجا خوا بە کەرەمی خۆی هیدایەتمان بدات، کە بتوانین تەزکیەی نەفسمان بکەین‌و، لە ڕیشەو بنکی سیفەتە نزم‌و پەستەکان (رذائل) پاکی بکەینەوەو، بە بژار بڕی تەقوا بژاری بکەین‌و، خۆشمان بە سیفەتە بەرزو جوانەکان بڕازێنینەوە، تاکو زەمینەی بەرەو خوا چوون‌و لە خوا نزیکبوونەوەمان، خۆشتر بکەین‌و، لە سایەی صالح بوون‌و خۆ پاك‌و چاککردنیشمانەوە، سەرفرازیی ڕەها و شەیطان پێ نەویرانمان: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ... ﴿٦٥﴾ ﴾ الإسراء، و لە فێڵ‌و پیلانی دوژمنان پاریزران: ﴿ ... وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا... ﴿١٢٠﴾ ﴾ آل عمران. بۆ خۆمان دابین‌و مسۆگەر بکەین.

١٣ / رەجەب/ ١٤٢١ کۆچی
١١ / ١٠ / ٢٠٠٠ زایینی
ئەحمەد ئاوا

# پێشەکی
# چاپی دووەم

الْحَمْدُ للهِ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلاَلِ وَجْهِهِ وَعَظِيمِ سُلْطَانِهِ، وَصَلَّى اللهُ تَعَالى وَسَلَّمَ وَبَارَكَ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الأُمِّي وَآلِهِ الطَّيِّبِينَ وَصَحْبِهِ الأَكْرَمِين، والتّابعِينَ لَهُمْ بإِحْسَانٍ، الواصلين منهم والسائرين.

مسولمانی بەڕێزو خۆشەویست !

ئەم کتێبەی بەردەستت، کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٤١٠)ی کۆچیی دا نووسراو چاپ کرا، هەوڵێکی بەندە بوو بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنو بۆشاییە زلەی، کە لە لایەنی مەعنەوییەوە لە کاری ئیسلامییدا هەستی پێدەکرد، ئێستاش:

واتە پێنج ساڵ دوای ئەو کاتە، هەرچەندە کارو حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستانو شوێنەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامییشدا، بە شێوەیەکی گشتیی لەچاو ئەوسا زۆر گەشەی کردوەو بەرەو پێش چووە، بەڵام بەڕای بەندە لەرووی مەعنەوییو ئەخلاقییەوە، ئەو کەلێنو بۆشاییە هەر هەستی پێدەکرێ، بگرە لەگەڵ گەورەبوونی قەوارەو کیانی کارو حاڵەتی ئیسلامییدا، ئەویش زلتر بووە!

بۆیە لەسەر داواکردنی چەند برایەکی خەمخۆرو دڵسۆزیش، بەپێویستمان زانی، کە لەم قۆناغەدا بەشێوەیەکی فراوانترو چاکتر لە جاری پێشوو (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون) چاپو بڵاو بکرێتەوە، پاش دەستکارییەکی کەم لە هەندێ شوێنیدا.

١٩٩٥ / ١١ / ٣٠

# بۆچی ئەم کتێبەم ناوناوە ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون ؟!

وەك سەرنجی ئەو ئایەتو فەرموودەو شوێنەواران (آثار)ەم داوە، کە پەیوەستن بە لایەنی مەعنەوییو پاكو چاك (تزكية)کردنی نەفسەوە، بۆم دەرکەوتو، بە تەجرەبەو ئەزموونی کردەیی خۆشم زیاتر حاڵی بووم، کە ئامانج لە پەروەردەکردنو تەزکیەکردنی نەفس، دوو شتە:

یەکەم: چاكو پاكو شایستەبوونو بەکەڵك هاتنو، ئامادەبوونی مرۆڤ بۆ نزیکبوونەوە لە خوای میهرەبانو پەروەردگار.

دووەم: شادبوونو گەیشتنی بە دیداری پڕ خێرو خۆشیو پیتو پیرۆزی خوا ـ سبحانه وتعالى ـ کە لە دنیادا بریتیە لە ناسینێکی ئەوتۆ، کە چاکترین جۆرە بەندایەتییو پەرستنی لێ پەیدا دەبێو، لە دوارۆژیشدا بریتیە لە گەیشتن بە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکەیو، دیتنیو تێوەڕامانی بە چاوی سەر.وەك فەرموویەتی: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾القيامة، پێغەمبەری خواش صلى عليه وسلم فەرموویەتی: {إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ عِيَانًا}[1].

واتە: بێگومان لەمەودوا ـ لە بەهەشت دا ـ پەروەردگارتان بە ئاشکرا دەبینن.

(١) رَوَاهُ البخاري برقم: (٦٩٩٨).

هەروەهــا فەرموویــەتی: {إِذا دَخَلَ أَهْل الْجَنَّة الْجَنَّة، يَقُول اللّٰه تَبَارَكَ وَتَعَالَى: تُرِيدُونَ شَيْئًا أُزِيدكُمْ؟ فَيَقُولُون: أَلَمْ تُبَيِّض وُجُوهنَا ؟ أَلَمْ تُدْخِلنَا الْجَنَّة وَتُنَجِّنَا مِنْ النَّار؟ قَالَ: بلى، فَيَرفع الْحِجَاب، فينظرون الى وجه اللّٰه، فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبّ إِلَيْهِمْ مِنْ النَّظَر إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَة: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ... ﴿٢٦﴾ ﴾ يونس}[١].

واتــە: هــەرکات بەهەشــتییەکان چــوونە بەهەشــتەوە، خــوا تبــارك وتعالــی دەفــەرموێ: چیتـــان دەوێ بۆتـــان زیـــاد بکـــەم؟ دەڵێــــن: ئــەدی ڕوومانــت نەدرەوشـاندۆتەوەو، نەتخســتووینەتە بەهەشـــتەوەو، لــە ئـاگر دەربـازت نــەکردووین؟ دەفەرموێ: با، ئنجـا پەردە لادەدرێو تەماشــای ڕووی خــوا دەکــەن، ئیــدی هیـــچ شــتێکـــیان نــەدراوەتێ، لــە لایــان خۆشــەویســتتــر بــێ لــە تەماشــاکردنی ڕووی پەروەردگاریان، پاشـان ئەمەی خوێندەوە: بـۆ ئەوانـەی چـاکەیان کـردوە، پاداشـــتی هەرەچـاكو زیادەش هەیـە...

هەربۆیەش خوای دادگەر دەربارەی کافرو لاڕێبووانی تاوانبار فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُواْ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ﴾ المطففين.

وەك دەبینین: خوای دادگەر دوای ئەوەی باسی هەڵوێستی چەوتی بێبڕوایانی خراپەکار دەکات، لە ئاقار بەرنامەکەیدا، کە بریتییە لە بە ئەفسانــە لــە قەڵەمــدانی ئایەتــەکانی قورئان، ئەو ڕاستییە گرنگە دەخاتە ڕوو، کە ئەو کافرە تاوانبارانە، لە سۆنگەی کردەوەی

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (١٨٩٥٥)، ومُسْلِمٌ برقم: (٤٦٧)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣١٠٥) عَنْ صُهَيْبٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ.

خراپو شوومی خۆیانەوە، دڵو دەروونیان پەردەی ڕەشی تاوان دایپۆشیوەو، گوناحو خراپەکاریی ژەنگو کەمرەی لەسەر دڵیان پەیداکردوە، ئنجا بە تووڕەیی و تێوەخوڕینەوە ڕایگەیاندوە، کە ئەو بێبڕوا چەتوونو نەگبەتانە، لە ڕۆژی دواییدا پەردەپۆش دەکرێنو، لەدیدارو دیتنی خوای میهرەبان بێبەش دەکرێن، ئاخر چۆن خاوەن دڵو دەروونێك شیاوی دیتنی خوایە، کە لە ژیانی دنیایدا، بە ژەنگو کەمرەو چڵكو چەپەری تاوانو خراپەکاریی، ئەو دەروونەی خۆی داڕزاندوەو بێخێرو بێری کردوە !!

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار، سزای (بێبەش کران لە دیداری خوا)ی پێش سزای (چوونە نێو ئاگری دۆزەخ) خستوە! ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ﴾ المطففين. بەڵێ مادام بەپێی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە (مسلم) گێڕابوویەوەو، پێش تۆزێك نووسیمان، هیچ شتێك چاکترو خۆشەویستتر نەبێ، لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە لە (دیتنو بەدیداری خوا شاد بوون)، دیارە بێبەشبوونیش لەو نیعمەتە هەرە بەرزو مەزنە، لە هەموو ئازارو سزاو ئەشکەنجەیەك بێڕەزاترو ئەستەمترە.

ئنجا ئێمە ئەم کتێبەمان ناونا: (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)، چونکە ئومێدمان وایە هەرکەسێك چاك تێی بگاتو ڕەفتاری پێبکات، کەمو زۆر پێی صالحو چاك دەبێو، لە ئەنجامی ئەو صالح بوونەشدا، شایستەیی ئەوە پەیدادەکات، کە بەرەو ناسینێکی قووڵو ڕەسەنی خوا هەنگاو بنێو، لە دنیادا بەچاوی عەقڵو دڵو، لە دوارۆژیشدا بەچاوی سەری، خوای بێوێنە ببینێو، بە دیداری بەرزو پیرۆزی شاد بێت، بەڵێ، هەروەك چۆن پاکیی و چاکیی، مەرجی چوونە بەهەشتە، وەك خوای کاربەجێ لەسەر زمانی فریشتەکانی بە بەهەشتییەکان دەفەرموێ: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الزمر.

واتە: ئەوانەی پارێزیـان لە پەروەردگاریـان کردوە، دەسـتە دەسـتە بـەرەو بەهەشـت بەڕێخران، ئنجا کاتێـك هاتنەلایو، دەرگاکانی کرانـەوەو، فریشـتە بەهەشـتەوانەکان پێیـان گوتن: سەلامتان لـێبێ، ئێوە پـاكو چـاکن، دەجـا بـە هەمیشـەیـی تێیـدا نیشـتەجێ ببـن.

بە هەمان شـێوەش، چونە نێو بەهەشـتی ناسینو پەرستنی خواوە، پەکی لەسـەر ئەو چـاکیی‌و پاکـییە کـەوتوە.



# ڕێ خۆشکردن

خوێنەرە سەنگین‌و شیـرینەکان !

ئەم کتێبەی بەردەستتان لەم چاپی پێنجەمەیدا، بـاس‌و بابەتەکـانی بـەم شـێوەیەی خوارەوە ڕیزکراون:

بەشی یەکەم: پێناسەو گرنگیی‌و پلەوپایەی تەزکیەی نەفس، کە سەرەتا تیشـك خراوەتـە سەر هـەر کـام لـەم وشـەو زاراوانـە: (التزكيـة)، (الإحسـان)، (التصـوف)، (السيـر والسـلوك).

پاشـان گـەورەیی‌و گرنگیـی تەزکیـەی نەفـس‌و، پلەوپـایەی لـە ئـایین‌و بەرنامـەی بێهـەڵەو پەڵـەی خوای کـاربەجێ دا، خراوەتە ڕوو.

بەشی دووەم: قۆناغەکـانی ڕێگـای صـالْح بـوون‌و بـەرەو خواچـوون، کـە ئـەم شـەش قۆناغـەن:

١- تۆبەکـردن‌و پـاك بوونـەوە:

چونکە خوا پاکەو پاکیی خۆشدەوێ‌و، ئینسـان هەتا لـە چـڵك‌و چـەپەری خراپـەو تاوانان خاوێن نەبێتەوە، تەنانەت شـایسـتەی بەرەو خواچوونیشـی نیـە، چ جـای لـێ نزیککەوتنەوەو بە دیدار شـادبوونی !

٢- زانـایی‌و چـاوڕوون بـوونەوە:

چونکە بێگومان خوای بێوێنەو تاكو تەنیا، لەبەر تیشکی زانیـاریی‌و زانسـتدا دەناسرێ‌و دەپەرسترێ، دیارە بابای ڕێبواریش پـاش خۆشـۆردن‌و ئامـادەبوون بـۆ سەفەرێ، دەبێ هەتا تەواو لەو ڕێیە، کـە پێیـدا دەڕوات، شـارەزاو بەرچـاوڕوون نەبێ، بەڕێ نەکەوێ.

٣- ئیخـلاص‌و یەکـلابوونەوە:

لە سـۆنگەی ئەوەوە، کـە نیازپـاکیی‌و تـەنیا خـوا پێ‌مەبەسـت بـوون، بـۆ هـەر کاروبارێك بناغەیە، کاکڵـە، هەوێنە، هەناوە، کەواتە بابای ڕێبوار (سالك)ی ڕێـی بەرەو خوا چوون، نابێ یەك هەنگاو هەڵـێنێ، هەتا تەواو دڵنیـاو مسـۆگەر نەبێ، کە ڕووی دڵی بەس لە خوایـەو، جگـە لـە ڕەزامەنـدیی وی، هـیچ نیـەت‌و مەبەسـتێکی دیکـەی مەعنـەویی‌و مـاددیی لـە دڵ نـەگرتوەو، ڕووی لـە هـیچ قیبلـەیەکی دیکە نەکردوە.

٤- پارێزکـاریی‌و وردبوونەوە:

کە بەڕاسـتیی جەرگ‌و هەناوو کاکڵ‌و جەوهەری ڕێگای ناوبراوە، وەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

٥- ئیحسـان‌و بەرزبوونەوە:

چـونکە پـاش هاتنـەدی خەسـڵەتی بـەرزو کۆکـەرەوەی پارێزکـاریی، ئینسـانی مسـوڵمان دەتوانێ بەردەوام سەرگەرمی پێهـەڵچوون‌و بەرزبوونەوەو نزیکـبوونەوە بێـت.

٦- دەوام‌و سـاردنەبوونەوە (الإستقامة):

کە قۆناغی کۆتایی ئەو سەفەرە موبارەك‌و پڕ خێرو بەرەکەتەیە، چونکە بێگومـان دەوام‌و پشـوودرێژیی‌و کۆڵـنەدان، مەرجی پێویسـت‌و حەتمیی بەئاکـام گەیشـتنی هەر کارێکـە.

بەشی سێیەم: توێشووی ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون.

کە لە (٨) خاڵدا (٥٢) ئامراز و هۆکاری گەورەو گرنگی صالح بوونو لەخوا نزیککەوتنەوەمان باسکردوونو، کەمو زۆر کورتە توێژینەوەیەکمان لەسەر کردوون.

بەشی چوارەم: پەرچو کۆسپەکانی سەر ڕێگای بەرەو خوا چوون.

لەم بەشەشدا لە هەشت (٨) خاڵاندا، سەرجەم ئەو کۆسپو تەگەرەو لەمپەرە سەرەکییانەی، کە دەبنە مایەی لەخوا دوورخستنەوەی ئینسانو لەڕێ لادانی، بەخێرایی تیشکیان خراوەتە سەر.

بەشی پێنجەم: ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەكو، ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەك لە بواری تەزکیەو تەصەووفدا.

لەم بەشەشدا لە دە (١٠) خاڵاندا چەند ڕاستییەکی گرنگ خراونە ڕووو، چەند هەڵەیەکی بێڕەزاو کوشندەش، کە بە ناحەق خزێندراونە نێو بازاڕی تەزکیەی نەفسو (تصوف)ی ڕەسەنەوە، ڕاستکراونەوەو بە تەرازووی شەرعو عەقڵ کێشراونو، لە مەحەك دراون.

بەشی شەشەم: دوایین سەرنجو بۆچوونەکانم لەمەڕ تەزکیەی نەفسەوە:

کە لە چەند خاڵێکی گوشراودا تێبینیو سەرنجەکانم لەوبارەوە خستۆتەڕوو.

بەشی حەوتەم: ئەزموونی تایبەتییو کردەیی خۆم سەبارەت بە تەزکیەی نەفس، کە لەم بەشەشدا لە چەند خاڵێکی چڕوپڕدا، ئەزموونی خۆم لەوبارەوە نووسیوە، بەڵکو ببنە مایەی زیاتر بەرچاوڕوونیی خوشكو برایانی دیندارو ئیسلامییم بەگشتیی، لەڕووی موسڵمانەتییو دینداریی‌یەوەو، بە تایبەتیش لەبواری تەزکیەی نەفسەوە.

بەشی هەشتەم: دوا سەرنجم لەبارەی تەزکیەی نەفسەوە پاش یازدە (١١) ساڵی ڕابردوو .

لەم بەشەشدا بە کورتییو گوشراویی، دوا تێبینییو سەرنجەکانم لەبارەی نەفسەوە دەخەمە ڕوو، ئاماژەیەکیش بە ماوەی زیندانیی کرانم لەلایەن ئەمریکاوەو، کاریگەریی ئەوە لە بواری بەرەو خوا چوون دا، دەکەم.

لە کۆتایی ئەم ڕێخۆشکردنەشدا، ڕوو لە خوێنەر دەکەمو دەڵێم:

عەزیزم !

ئومێدەوارمو لە خوای بەخشەر داواکارم، کە تۆش وەك خواناسانو ڕێبوارانی ڕێی خواپەرستیی، بە گوڕو تینو عەزمی پۆڵاییینو دڵی پڕ لە ئەوینەوە، بەرەو خوا بکەویتە ڕێو، سەفەری خێرت بێو، سەرجەم قۆناغەکان ببڕیو هەڵبوێریو، لە ئاکامدا ببیە مسوڵمانێکی کامڵی بەمراد گەیشتووی بەدیداری خوا شاد بوو !

ئنجا سوور سووریش بزانە، کە پێگەیشتنی تۆو هاووێنانت، خوا یاربێ سەرچاوەی لاچوونی گیروگرفتمانە، چونکە خوا گفتو بەڵێنی داوەو فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: بێگومان پاش تەوڕات لە زەبووردا نووسیومانە، کە: بەندە چاکەکانم زەوی بە میرات دەگرن.

بەڵێ بە ئەندازەی صالح بوونمان، خوا (إصلاح)ی حاڵی خەڵکیمان پێدەکات، بە تەعبیرێکی دیکە: بە بارتەقای خۆگۆڕینمان، واقیعو خەڵکیشمان پێ دەگۆڕێ، وەك خوای زاناو دادگەر فەرموویەتی: ﴿ ...إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ... ﴿١١﴾ ﴾ الرعد.

دەجا هاودینی شیرینم !

ئەگەر بەتەماین خوا لێمان ڕازی بێت، بەهۆی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانمانەوە، با هەتا زووە لە چاککردنی خۆمان وەخۆ بکەوینو دەستبەکار بین، بەڵکو بەر مژدەی خوا بکەوینو، هەم سەرزەمینی ئەم دنیاو، هەم هی بەهەشتیش بەمیرات بگرین.

### ١- پێناسـە:

لە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە هەرکـــام لـە وشـەو زاراوەکـانی: (التزکیـة)، (الإحســـان)، (التصـوف)، (السـیـر والسـلوك) بۆ پێناسەو ناونیشـانی لایەنی ڕووحیی و مەعنـەویی بەکـارهێنراون، بەپێویستی دەزانم چەمكو واتای هەر کامێکـیان بەکورتیی بخـەمە ڕوو:

أ- (التزکـیة): کە وشەیەکی قورئانییەو بە چەندان صیغە لە قورئانێـدا هـاتوە، کورتـەی واتایەکەی بریتیە لە (گەشەکردنو پێز تێزان)و (پاكو پوختە بوون)، بـە تەعبیـــرێکی سـادە: تەزکـیە بریتیە لە (پاکـییو چاکـیی).

(راغب الأصـفهاني) لەوبـارەوە گوتوویەتی[١]:

{زکا: أصل الزکاة النمو الحاصل عن برکة الله تعالی ویُعتبر ذلك بالأمور الدنیویـة والأخرویة، یقال: زکا الزرع یزکو، إذا حصل منه نمو وبرکة... وبزکاة الـنفس وطهارتهـا یصـیر الإنسـان بحیـث یسـتحق فــي الـدنیا الأوصـاف الــمحمودة وفــي الآخـرة الأجـر والــمثوبة، وهو أن یتحرّی الإنسان ما فیه تطهیره، وذلك یُنسب تارة إلـی العبد لکونـه مُکتسِباً لذلك فـي الحقیقة، نحـو ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ ﴾ الشـمس، وتـارة یُنسـبُ إلی الله تعالی، لکونه فاعلاً لذلك فـي الحقیقـة، نحـو ﴿ ...بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ... ٤٩ ﴾ النساء، وتارة إلـی النبّـي، لکونه واسطة فـي وصول ذلـك إلـیهم، نحـو ﴿ ... تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ... ١٠٣ ﴾ التوبـة }.

واتە: (زکی) ڕیشەی (زکاة) گەشەکردنە بەهۆی پێزی خوای بـەرزەوەو، ئـەویش بـە سەرنجدانی کاروبـارە دنیـایی و دواڕۆژییـەکان، دەگـوترێ: (زکـا الـزرع یزکـو) ئەگـەر گەشەکردن و پیێزی تێدابوو.. بەهۆی تەزکیەبوونی نەفس و پاکبوونەوەشیەوە، مرۆڤ لـە دنیادا شایستەی سیفەتە پەسندەکان و، لە دواڕۆژدا شایستەی کرێ و پاداشـت دەبـێ، ئەویش بەوە دەبێ کە مرۆڤ لەوە بخەفتێ کە پاکی بکاتەوە، ئنجا ئـەوەش جـاری وایـە

---

(١) (مفردات ألفاظ القرآن)، ص: (٢١٨).

پاڵدەدرێتە لای بەندە، چونکە خۆی وەدەستهێنەریەتی، وەك فەرموویەتی: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ ﴾ الشمس، جاری واشە پاڵدەدرێتە لای خوای بەرز، چونکە خوا بکەری ڕاستەقینەیەتی، وەك فەرموویەتی: ﴿ ...بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ... ۝٤٩ ﴾ النساء، جاری واشە پاڵدەدرێتە لای پێغەمبەر، چونکە هۆکاری گەیاندنی ئەوەیە پێیان: ﴿ ... تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ... ۝١٠٣ ﴾ التوبة.

کەواتە:

تەزکیەبوونی نەفس، بریتیە لە بژارکرانو پاککرانەوەی لە خووو خدەو خەسڵەتە پیسو بەدەکانو، چاك بوونو ڕازێنرانەوەو گەشەپێدانو پێگەیەنرانی، بەهۆی تێداخەملێنرانو چەسپێنرانی خەسڵەتو ئاکارە بەرزو پەسەندەکان، بە تەعبیری ئەهلی عیرفان (التخلية من الرذائل والتحلية بالفضائل).

ب- (الإحسان): کە ئەمیش بە چەندان ڕێژگە(صیغة) لە قورئانیدا هاتوە، لە ئەسڵی زماندا بەمانای چاککردن دێو، لە زاراوەی شەرعیشدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوا پێناسەی (إحسان)ی کردوە: {الإِحْسَانُ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ}(١).

واتە: ئیحسان ئەوەیە، کە بە جۆرێك خوا بپەرستی، وەك ببیینی، بێگومان ئەگەر تۆش نەیبینی ئەو دەتبینێ.

ئاشکراشە، کە ئەم جۆرە دینداریی و خواپەرستییکردنە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (الإحسان) ناوی دەبات، کە ئەهلی عیرفانو تەصەووف پێی دەڵێن: ئیمانی دیتەنیی (الإيمان الشهودي)، گەورەترین بەرهەمو زادەی تەزکیەی نەفسەو، لووتکەی هەرەبەرزی مسوڵمانەتیی شەخصییە.

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٤) وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٢٢٤٤)، وَغَيْرهُم عَنْ عُمَر بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

ج- (التصوّف) : ئەم وشەیە، کە لە سەرجەم وشەو زاراوەکانی دیکە باوترە، لە هیچ کام لە دەقەکانی قورئانو سوننەتدا نەهاتوەو، زیاتر ئەهلی ڕێبازەکانی تەصەووف بۆ خۆیانیان بەکارهێناوە.

ئنجا لەوبارەیەوە، کە ئایا وشەی (تصوف) لە چییەوە هاتوەو، چۆن چۆنی پەیدا بووە؟! زاناو توێژەرەوان بیرورای جیاجیایان هەن، بۆ وێنە (إبن تیمیة) لەوبارەوە گوتوویەتی: {وشەی (صوفي) لە سێ وەچەکان (القرون الثلاثة)دا باو نەبووەو، لەبارەی چۆنیەتی پەیدابوونیەوە ڕاجیایی هەیە: گوتراوە پاڵدراوەتە لای (أهل الصُّفة)، بەلاّم ئەوە هەڵەیە، ئەگەرنا دەبوو گوترابایە: (صُفّيّ)، هەروەها گوتراوەتە: پاڵدراوە لای ڕیزی پێشەوەی نوێژ، بەلاّم ئەمیش هەڵەیە، چونکە ئەگەر وابووایە، دەبوو گوترابایە (صَفِّي)، گوتراویشە پاڵدراوەتە لای خەڵکی هەڵبژاردەی خوا (الصفوة من خلق الله)، بەلاّم ئەمیش هەڵەیە، چونکە ئەگەر وابوایە، دەبوو بگوترێ: (صَفَويّ)..

هەروەها گوتراوە:- کە ئەمەش باوترە - پاڵدراوەتە لای پۆشینی بەرگی خوریی (الصّوف)، چونکە سەرەتا (تصوف) لە (بەصرا) سەریهەڵداو یەکەمین کەسیش، کە خانوولکەیەکی بۆ صۆفیان دروست کرد، هەندێ لە هاوەڵانی (عبدالواحد بن زید) بوون، کە ئەمیش لە هاوەڵانی حەسەنی بەصرایی بوو.

خەڵکی بەصرا لەنێوان هەموو شارەکانی دیکەدا بەوە باوبوون، کە زیادەڕۆییان لە زوهدو خواپەرستییو لەخواترسانو ئەو شتانەدا دەکرد، بۆیە دەگوترا (فقە کوفي وعبادة بصرية).

(ابو الشيخ الأصفهاني) لە (محمد بن سيرين)ی گێڕاوەتەوە، کاتێك پێی گەیشتوە، کە کۆمەڵێك دەبەرکردنی پۆشاکی خوریی (صّوف) بەچاکتر دادەنێن، گوتوویەتی: (کۆمەڵێك هەن بەرگی خوریی دەپۆشنو دەڵێن وەك مەسیحی کوڕی مەریەم دەکەن! بەلاّم ڕێو شوێنی پێغەمبەری خۆمان بەلاوە چاکترە، دیارە پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەرگی لۆکەو غەیری ئەویشی دەبەر دەکرد)}[1].

---

(١) بڕوانە: مجموع الفتاوى، ج: (١١)، ص: (٦، ٧).

بەڵام خاوەنی (الفتوحات الإلهية شرح المباحث الأصلية)[١] دەربارەی چۆنیەتی پەیدابوونی وشەی (صوفی) ڕایەکی دیکەی هەیە، کە لە دوو توێی ئەم شیعرەی (أبو الفتح البَسْتي)دا خستوویەتە ڕوو:

تخالف الناس في الصوفي واختلفوا
جهلاً وظنوا أنه اشتقَّ من الصوّف
ولست أمنحُ هذا الإسم غير فتى
صافى فصوفي حتى سُمّي صوفي

کەواتە: بەپێی ئەم قسەیە (صۆفیی) یانی: بابای صافبووەوەو بێ خەوش.

ئەوە لەبارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانو داتاشران (إشتقاق)ی وشەو زاراوەی صۆفیو تەصەووفەوە، بەڵام لەبارەی کاکڵو نێوەڕۆكو ماهیەتی تەصەووفەوە: ئەهلی عیرفانو تەصەووف، دەیان جۆرە پێناسەیان ڕیز کردوون، کە لەیەکەوە نزیکنو لەڕووو لایەنی جۆراوجۆرەوە، سەرنجی بابەتەکەیان داوە، بۆ وێنە:

١- (ابن قَيم الجوزية) لە (أبوبكر الكتاني)یەوە هێناویەتی، کە گوتوویەتی: {التصوف خُلُق، فمن زاد عليك في الخُلق زاد عليك في التصوف}[٢].

واتە: تەصەووف ڕەوشتە، هەرکەس لە ڕەوشت دا، لەتۆ زیاتر بوو، لە تەصەووف لە تۆ پتر بەشی هەیە.

٢- هەروەها لەبارەی تەصەووفەوە گوتراوە: (هو تجريد القلب عما سوى الله تعالى)، واتە: بریتییە لە دارِنینی جگە لەخوای بەرز لە دڵ و دەروون.

٣- بەڵام بەڕای من تێرو تەواوترین پێناسە بۆ وشەو زاراوەی ناوبراو، ئەوەیە کە خاوەنی (الفتوحات الإلهية..) نووسیویەتی[٣]: {وهذه الطريقة هي طريقة الصوفية وهي مَوْضوعة لكيفية تهذيب القلوب وتصفيتها من الرذائل، وتحليتها بالفضائل، لتتهيأ

---

(١) بڕوانە: پەراوێزی (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)، ص: (٣٦).
٢) بڕوانە: (مدارج السالكين)، ج: (١)، ص: (٤٦٥).
(٣) بڕوانە: ص: (٣٦).

بذلك لِمعرِفة الحق تعالى المعرفة الحقيقية التي هي معرفة العيان بطريق الذو والوجدان}.

واتە: ئەم ڕێبازە بریتیە لە ڕێبازی صۆفییەکان، کە بە مەبەستی ڕێك و پێککردن و بژارکردنی دڵ و دەروونەکان لە خەسڵەتە پەستەکان و، ڕازاندنەوەی بە خەسڵەتە بەرزەکان، دانراوە، بۆئەوەی لە سۆنگەی ئەوەوە دڵەکان ئامادەو شایستەی ناسینی خوابن، ناسینێکی ڕاستەقینە، کە بریتیە لە ناسینی شهوودیی و ئاشکرا، لەڕێی چێژتن و هەستپێکردنی مەعنەوییەوە.

٤- هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا هەر لەوبارەوە نووسیویەتی[1]: {مقصود التصوف تصفية البواطن، حتى يكون العبد على حالةٍ يرضاها الله ورسوله ظاهراً وباطناً، وأيضاً مقام التصوف، هو مقام الإحسان الّذي فسّره الرسول صلى الله عليه وسلم، بقوله: ((أن تعبد اللّٰه كأنك تراه...)) وذلك لا يصحُّ بدون ما تقع به العبودية والتعبد من عقائد الإيمان وأعمال الإسلام، فهما ظاهره وهو باطنهما، فلا قيام لهما إلاّ به، ولا صحّة له بدونها، فهو كالروح وهما كالجسد، فالروح لا تقوم بغير الجسد، والجسد لا يقوم بغير روح، ولذلك قال الإمام مالك: من تفقّه ولم يتصوف فقد تفسّق، ومن تصوف ولم يتفقه فقد تزندق، ومن تفقه وتصوف فقد تحقق..}.

واتە: ئامانجی تەصەووف پاککردنەوەی دەروونە، بەجۆرێك بەندە بچێتە حاڵێکەوە، کە خواو پێغەمبەرەکەی لێی ڕازیی بن لە ڕواڵەت و پەنهانی، هەروەها پایەی تەصەووف پایەی ئیحسانە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ((أن تعبد اللّٰه كأنك تراه..)) تەفسیری کردوە، ئنجا بێگومان ئەوەش نایەتە دی، مەگەر بەوەی، کە بەندایەتیی و خواپەرستیی پێ وەبەر دەکەوێ و دروست دەبێ، لە پایەو بەشەکانی ئیمان و کردەوەکانی ئیسلام، کەواتە: ئیمان و ئیسلام ڕواڵەتی ئەمن و ئەمیش نێوەڕۆکیانە، ئەوان بەبێ ئەم نایەنە دی و، ئەمیش بەبێ ئەوان دروست نیەو دانامەزرێ، ئەم وەك ڕووح و ئەوانیش وەك جەستەن، دیارە هیچ کام لە ڕووح و

(١) بڕوانە: ص: (٩٠، ٩١).

جەستەش، بەبێ یەکدی نابن، هەربۆیەش ئیمام مالیك گوتوویەتی: هەرکەسێك شارەزایی هەبێو تەزکیەی نەبێ، بەرەو لاڕێبوون دەچێ و، هەرکەسێك تەزکیەی بێ شارەزایی هەبێ، سەری لە زەندەقەوە دەردەچێ، بەڵام ئەو کەسەی هەرکام لە شارەزایی ئایینو تەزکیەی دەروون کۆبکاتەوە، ئەوە بێگومان گەیشتۆتە حەقیقەت.

د- (السَّير والسَّلوك): ئەم دوو وشەیەش، کە لە ئەسڵدا لەیەك جیانو یەکەمیان بەمانای (بەڕێگادا ڕۆیشتن)و، دووەمیان بە مانای (هەڵسوکەوتو ڕەفتار) دێت، لە عورفی بەکارهێنانی ئەهلی عیرفانو تەصەووفدا، مەگەر چۆن، دەنا هەر پێکەوە بەکاردێنو، وەك یەك زاراوەیان لێهاتوە، کە مەبەست پێیان جۆرو چۆنیەتی ڕەفتارو هەڵسوکەوتو، بەڕێی دیندا ڕۆیشتنو، بەرەو خوا چوونی ڕێبوارانی ڕێی دینداریی‌و خواناسینە.

یەکێك لە نووسەرە هاوچەرخەکان لەبارەی وشەی (السير إلى الله)وە نووسیویەتی[1]: {السير إلى الله يعني: انتقال من نفسٍ غير مزكاة إلى نفس مزكاة، ومن عقل غير شرعي إلى عقل شرعي، ومن قلب كافرٍ أو منافق أو فاسق أو مريض أو قاس، إلى قلب مطمئن سليم، ومن روحٍ شاردة عن باب الله غير متذكرة لعبوديتها، وغير متحققة بهذه العبودية، إلى روح عارفةٍ بالله قائمة بحقوق العبودية له، ومن جَسَدٍ غَيْر منضبط بضوابط الشرع، إلى جسم منضبط انضباطاً كاملاً بشريعة الله، وبالجملة من ذات أقل كمالاً إلى ذاتٍ أكثر كمالاً، في صلاحها وفي اقتدائها برسول الله صلى الله عليه وسلم قولاً وفعلاً وحالاً}.

واتە: مەبەست لە (بەرەو خوا چوون) گواستنەوەیە لە نەفسێکی تەزکیە نەبووەوە، بۆ نەفسێکی تەزکیەکراوو، لە عەقڵێکی پابەند نەبوو بە شەرعەوە، بۆ عەقڵێکی پابەند بە شەرعەوەو، لە دڵێکی کافر، یان مونافیق، یان لاڕێ، یان نەخۆش، یان ڕەقەوە، بۆ دڵێکی ئارامگرتووی ساغو تەواوو، لە ڕووحێکی لەقاپی خوا یاخیی، بەندایەتیی خوا فەرامۆشکەری، گوێ بەخواپەرستیی نەدەرەوە، بۆ ڕووحێکی

(١) بڕوانە: (تربيتنا الروحية) سعيد حوى، ص: (٧٥)، ط: (١)، ١٩٧٩.

خواناسی مافی بەندایەتیی بۆ خوا جێبەجێکەرو، لە جەستەیەکی بەرهەڵداوە، بۆ جەستەیەکی پەیوەست بە سنوورەکانی شەریعەتی خواوە، بەشێوەیەکی گشتیی: لە کامڵ نەبوونییەوە بۆ کامڵ بوونی تەواوو، لە چاکبوونیو لە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، لە هەرسێك بواری قسەو کردەوەو حاڵو سیفەتدا.

ئێستاش، کە هەتا ڕاددەیەك چەمكو واتای هەرکام لە (تەزکیەو ئیحسانو تەصەووفو سەیرو سولووك)مان بۆ ڕوونبۆوە، با بچینە سەر خاڵی دووەمی ئەم بەشە.

## ٢- گرنگیی و پلەوپایەی تەزکیەی نەفس:

وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، هەرکام لە وشەکانی (التزكية)و (الإحسان)، لە دەقەکانی قورئانو سوننەتدا بە سیغەی جۆراوجۆر بەکارهێنراون، بۆیە بە سەرنجدانی چەند دەقێکی قورئانو سوننەت، کە دوو وشەی ناوبراویان تێدا هاتوون، لە گرنگییو پلەوپایەو تەزکیەی نەفس، شارەزا دەبین:

### أ/ تەزکیە:

یەك: تەزکیەی نەفس، یەکێکە لە چوار ئەرکە هەرە گەورەو گرنگەکانی پێغەمبەری کۆتایی محمد (صلى الله عليه وسلم)، خوای کاربەجێ لە چوار شوێنی قورئانیدا، ئەركو کاری پێغەمبەری خۆی (صلى الله عليه وسلم) لەنێو ئۆممەتەکەیدا، لە چوار شتاندا کورت هەڵهێناوە، بەمجۆرە:

١. ﴿ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾ البقرة.

٢. ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾ البقرة.

٣. ﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ١٦٤﴾ آل عمران.

٤. ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢﴾ الجمعة.

بەڵێ هەرکام لە:

- خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا..
- تەزکیەکردن (واتە: پاککردنەوەی نەفس‌و چاککردنی‌و گەشەپێدان‌و بەرەو پێش بردنی).
- فێرکردنی بەرنامەی خوا (کە مەبەست بنچینەو دەستوورەکانی شەریعەتە).
- فێرکردنی لێزانیی‌و کارامەیی بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی خوا، یان فێرکردنی خەسڵەت و ئاکارە بەرزو پەسندەکان.

ئەرکە گەورەو بنەڕەتییەکانی پێغەمبەری کۆتایین لەنێو ئۆممەتدا.

دوو: بەهۆی تەزکیەوە ئینسان سەرفرازیی‌و بەختەوەریی ڕاستەقینەی دنیاو قیامەتی چنگ دەکەوێ، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠﴾ الشمس.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤﴾ الأعلى.

سێ: ئینسانی خاوەن تەزکیە، لە شوێن کەوتنی شەیتان‌و خراپەو تاوان دوورو پارێزراو دەبێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا

فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾ النور.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەسێك شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ، ئەوە بێگومان (شەیتان) فەرمان بە شتی ناقۆڵاو خراپە دەکات و، ئەگەر چاکەو بەزەیی خواش بەسەرتانەوە نەبووایە، هەرگیز هیچ کامێکتان تەزکیە نەدەبوون، بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێ تەزکیەی دەکات.

چوار: هەموو ئینسانێك پێویستی بە تەزکیە هەیەو پەکی لەسەری کەوتوە:

أ- ئنجا ئەگەر مسوڵمان بێت، بۆ زیادکردنی تاعەتو لە خوا نزیکبوونەوەو بەرزبوونەوە: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ ﴾ عبس.

واتە: ڕوی گرژکردو وەرچەرخا، لەبەرئەوەی کوێرەکە هاتە لای، ئنجا تۆ چوزانی ! دەبینی خۆی تەزکیە دەکرد !

دیارە مەبەست لە تەزکیە لێرەدا بۆ (ابن أم مکتوم) (خوا لێی ڕازی بێت)، گەشەکردنی ئیمانو زیادکردنی تەقواو تاعەتە.

ب- ئەگەر کافرو بێدین بێت، بۆ فڕێدانی کوفرو شیرکو نیفاقو، خۆڕازاندنەوە بە ئیمانو تەوحید، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ ﴾ عبس.

واتە: بەڵام بابایەك، کە خۆی پێ بێنیازە، تۆ پێیەوە سەرگەرم دەبی ! دەجا ئەگەر خۆشی تەزکیە نەکات، تۆ چ زیانێك دەکەی !! کە ئەوە بێگومان مەبەست پێی سەرانی کوفرو شیرکی خەڵکی مەککەیەو، تەزکیەی

ئەوانیش و هەر کەسێکی دیکەی وەك وانیش، قوتاربوونیانە لە کوفرو شیرکو، ئیمان هێنانو خوا بەیەکگرتنیانە.

**ب/ ئیحسان:**

یەك: ئیحسان لووتکەی هەرە بەرزی دینداریی‌و خواپەرستییە: {الإِحْسَان أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ..}[(١)]، ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ... ﴿١٢٥﴾ ﴾ النساء.

دوو: ئیحسان لەلایەن بەندەوە، کە لەقەدەر خۆیەتی، بە ئیحسان لەلایەن خواوە، کە شایستەی ویەیە، پاداشت دەدرێتەوە: ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الرحمن. ئایا پاداشتی چاکەکاریی هەر چارەکاریی نیە!

سێ: خوای دادگەرو بەخشەر، ئەو کەسانەی خۆشدەوێن، کە خاوەنی ئیحسانن‌و، بە لەگەڵ بوونی تایبەتییش لەگەڵیانە ﴿ ... وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت. بە دڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە.

چوار: ئیحسان خەسڵەتێکی کۆکەرەوە (جامع)ەو، پایەیەکی هێندە بەرزو مەزنە، کە لەسەر شتێك‌و دوو شت، یان لایەنێك‌و دوان کورت هەڵنەهاتووەو، سەرجەم شتە چاك‌و پەسەندەکان‌و تێکڕای لایەن‌و بوارەکانی دینداریی‌و مسوڵمانەتیی کۆدەکاتەوە، ئەوەتا خوای پەروەردگار لە وەصفی ئەو بەندە هەڵبژاردانەدا، کە بە (محسنین) ناوی بردوون، چەندان خەصڵەتی گەورەو پەسندی ریزکردوون: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾ الذاريات.

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٤) وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٢٢٤٤)، وَغَيْرهُم عَنْ عُمَر بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

واتە: بێگومان پارێزکاران لەنێو باغانو سەرچاوان دان، ئەو نیعمەتانەی، کە پەروەردگاریان پێی داون وەریان دەگرن، بێگومان ئەوانە لەوەپێش چاکەکار بوو، عادەتیان وابوو کەمێك نەبێ لە شەوگار نەدەخەوتن، دەمەو بەیانیانیش داوای لێبوردنیان – لە خوا – دەکردو، لە ماڵو سامانیاندا مافی سواڵکەرو بێبەش دابین کرابوو.

پێغەمبەری کۆتاش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {إِنَّ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ}(١).

واتە: بێگومان خوا پێویستی کردوە، هەموو شتێك بەچاکیی ئەنجام بدرێ، ئنجا ئەگەر یەکێکتان نێچیرێکی کوشت، با بە ڕێکیی بیکوژێت و، ئەگەر شتێکتان سەربڕی، بە جوانیی سەریببڕن، با یەکێکتان - کە شتێك سەردەبڕێ – تیغەکەی تیژ بکات و، با زوو سەربڕاوەکەی ئاسوودە بکات.

ئنجا لەمەوە دەگەینە ئەنجامێکی زۆر گرنگ، سەبارەت بە تەزکیەی نەفسو ئیحسان، ئەویش ئەوەیە، کە تەزکیەو ئیحسان، دوو ناون بۆ یەك حەقیقەتو، شتێکی زیادەش نین لە ئیمانو ئیسلام.

چونکە وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا، کە (مسلم) لە (عمر بن الخطاب)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هێناویەتی، دەردەکەوێ، کە بە (حديث جبريل) ناسراوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کۆتاییەکەیدا فەرموویەتی: {هَذَا جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ}، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامی هەر کام لە پرسیارەکانی (أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلَامِ) و(أَخْبِرْنِي عَنِ الإِيْمَانِ)دا پێنج پایەکانی ئیسلام: (شایەتمان، نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەج)و شەش پایەکانی ئیمان: (بڕوا بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٧١٥٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥١٦٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨١٤)، وَالتِّرمذِيُّ برقم: (١٤٠٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٤٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣١٧٠)، وَالبَزَّار برقم: (٣٤٦٨) عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر)ی خستوونە ڕوو، بەڵام لە وەڵامی پرسیاری (فَأَخْبِرنِي عَنِ الإِحْسَان)دا، هیچ شتێکی زیادەی لە پایەو بەشەکانی ئیسلام‌و ئیمانی باس نەکردوە !

کەواتە:

تەزکیەی نەفس، ئیحسان، تەصەووف، عیرفان، سەیرو سولووك، کە سەرجەمیان پێناسەو ناوونیشانی یەك حەقیقەتن، کە بریتیە لە (لایەنی مەعنەویی‌و پەنهانی مسوڵمانەتیی‌و خواپەرستیی)، لەڕووی ژمارەو قەبارەو چەندێتیی (العدد والحجم والكمية)یەوە، هیچ شتێکی زیادە ناخاتە پاڵ ئایین‌و بەرنامەی خوا، بەڵام لە ڕووی نێوەڕۆك‌و چۆنیەتیی‌و دەروونیی (الماهية والكيفية والباطنية)ەوە، ڕووحێك بەبەر تێکڕای ئایین‌و سەرجەم پایەو بەشەکانی ئیسلام‌و ئیماندا دەکات، کە پێی دەبن بە شتێکی دیکەو، دەچنە ئاستێکی دیکەی یەکجار بەرزو باڵاوە، کە:

١/ ئیمان لە قۆناغی زانیاریی‌و بەڵگەوە، دەگەیەنێتە دوندی بەرزی چێژتن‌و دیتن (الذوق والمشاهدة)! دیارە مەبەست سەرجەم پایەکانی ئیمانە، نەك تەنیا ئیمان بەخوای بێوێنەو هاوتا.

٢/ ئیسلام‌و تاعەت، لە حاڵەتی هەست بە قورسیی کردن‌و زۆرلەخۆکردن (تكلّف)ەوە، دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی چێژ لێوەرگرتن‌و پێوە سەربەرزبوون(تشرّف)![1].

٣/ عەقڵ‌و دڵ لە حاڵەتی پرژو بڵاویی‌و سەرقاڵییەوە، دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی کۆبوونەوەو خۆشحاڵیی !!

٤/ سەرباری ئەوەی، کە هەرچی ڕەگ‌و ڕیشەو خشپ‌و خاڵی خەسڵەتە پیس‌و نزمەکان (رذائل)ە، زەوی دڵ‌و مێشکیان لێ گەسك دەدات‌و لایان دەبات، بەپێچەوانەشەوە، خونچەی گوڵی سەرجەم ڕەوشتە بەرزو پەسەندەکان (فضائل) دەپشکوێنێ‌و دەخەملێنێ‌و...هتد.

(١) واتە: شانازیی پێوە کردن‌و هەستکردن بە زیادبوونی ڕێزو حورمەت.

بەکـورتیی:

لە ئەنجامی تەزکـیەبوونی نەفـس‌و گەیشـتن بە پایەی بەرزی ئیحسـانەوە، هەرکام لــە ئیمــان‌و ئیســـلام، بــە هــەموو پایــەو بــەش‌و کــارو چالاکییەکــانیانەوە، حەقیقــەت‌و جەوهەرەکەیان لە ئینسـاندا دێتەدی، هەروەها حەقیقەت‌و جەوهەری هــەر کــام لــە خــوا بەیەکـگرتن (توحید)و پارێزکـاریی (تقـوى)و بەندایەتییکــردن (عبودیـة)و ئیــخلاص‌و پشـت بەخوابەستن (توکل)و خۆڕاگرتن (صبر)و سوپاسـگوزاریی (شـکر) و...هتـدیش بـە هەمان شێوە، کە ئەمانەو گەلـێ شـتی دیکەش، هەر لە جوغـزو بازنەی فراوانی ئیمان‌و ئیسـلام‌و ئایینی خـوای پەروەردگـاردان.

کــەواتە:

هــەم با ئەو کەسانەی، کە بە خەیاڵی خۆیان لایەنگریی تەزکیەو تەصــەووف دەکــەن، بەڵام وادەزانن کە تەصەووف‌و ڕێبــازەکانی، لــە شــەریعەت جیــان‌و، وێــڕای شــەریعەت، تەریقــەتیش پێویسـتە بۆ چاك دینـداریی کـردن‌و چـاك خواپەرسـتن، بـزانن‌و، هــەم ئــەو کەسانەش، کە بە بیانووی دژایەتییکردنی شتی پڕوپووچ‌و ئەفسـاناویی‌و، داهێنراوەکـانی زۆر لە شوێنکەوتووانی سادەو نەزانی ڕێبازەکانی تەصــەووف، هەسـتیاریی (حساسیة)یان نەك تەنیا بە وشەی صۆفی‌و تەریقەت، بگرە بە وشەی تەزکیــەو زیکـرو فیکـریش پەیـدا کردوەو، بەهۆی ئەو هەڵوێسـتە عاتیفیی‌و سەرکـێڵانەیانەوە، خۆیان لە گەلـێك گەوهەرو مرواریی دەریای دەوڵەمەندی عیـرفان‌و تەصـەووف بێبــەش کــردوەو، بــەهۆی ئــەو خــۆ دوورگــرتن‌و هەســتیــارییە ناماقووڵانــەوەو، لــە کاردانــەوەی ئەهلـــی تەریقەتــدا، تــا ڕاددەیەکی زۆر ئەو لایەنە گرنگ‌و گەورەیەی ڕووحیی‌و مەعنەوییەیان فەرامۆش کـردوە، با بزانن، کە یەکەمیان گیـرۆدەی دەردی تێپەڕانــدن (إفـراط)و، دووەمیشـــیان دووچـاری نەخۆشی بەزایەدان (تفریط) بووە، هەڵوێسـتی ڕاسـت‌و شـەرعـییش هەر ئەوەیە، کە بـە عەقڵ‌و ویژدانێکی سـاغ‌و سـەلـیمەوە، تــەرازووی قورئــان‌و ســوننەت، بــۆ کێشــان‌و هەڵسـەنگاندنی هەر مەسەلەیەك بەدەستەوە بگرین‌و، زۆر وریابین بەهۆی خۆشـویسـتن‌و بوغزاندنی خەڵکەوە، تووشی نادادگـەریی‌و بێـویژدانیی‌و بەهەڵـەداچوون‌و لادان نەبین.

## قۆناغی یەکەم: تۆبەکردن و پاکبوونەوە

مسـولمانی بەڕێز !

قۆناغی یەکەمین‌و یەکەم هەنگاوی بەرەو خوا چوونت، ئەوەیە، کە تۆبەیـەکی ڕاسـت‌و ساغ لەگەڵ خوادا بکەی‌و، پەیمانی بەندایەتیی لەگەڵ نوێ بکەیەوەو، بەڵـێنێکی ڕاستی پێبدەی، بەڵکو لە هەموو هەڵەو پەڵەکانی ڕابردووت پاکت بکاتەوەو بتشـوات‌و، بتباتە ڕیزی ئەو کەسانەی، کە خوا لە وەسفیاندا فەرموویەتی: ﴿...إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقـرة.

واتە: بێگومان خوا تۆبەکارانی خۆشدەوێن و خۆ پاککەرەوانیشی خۆشدەوێن.

ئـنجـا کە ئەمەت کـرد، مانـای وایـە یەکـەمین خەسـڵەتی ئـەو کۆمەڵـە بـڕواداره هەڵبژاردەیەت لەخۆتدا هێناوەتە دی، کە خوا هەڵیاندەبژێرێ بۆ نوێکردنەوەو هێنانـەوەی ئایین‌و بەرنامەی خۆی: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴿٥٤﴾﴾، کە خـوا خۆشـی دەوێن‌و، سەرەنجام خوا خۆشـی دەوێی.

ئنجا ئێسـتا بەرلـەوەی بچینـە سەر ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی‌و ماهیەتی ئەو گەڕانەوە (توبة)یە، وای بەچاك دەزانم، نەختێك گرنگیی‌و بایەخیی بخەینە ڕوو:

مسـولمانی خۆشـەویسـت !

هەروەك چۆن هەتا دەستنوێژت نەبێ‌و، جەستەو جل‌و بەرگـت‌و ئـەو شـوێنەی، کـە لەسەری ڕادەوەسـتی پـاك نەبـێ، بـۆت نیـە نوێـژ بکـەی و، هـەروەك چـۆن هـەتا لـە لەشـپیسـیی خۆت پاك نەکەیەوە، ڕێی چوونە نێو مزگەوت‌و دەست لە قورئان دانت نیەو، هەروەك چۆن هەتا جووتیار زەوییەکەی نەکێڵـێ‌و هەڵینەوێژێرێ، هیـچـی تێـدا ناچـێنێ، بەهەمان شێوەش، هەتا لە بێدەستنوێژیی سەرگەرم بوون بە دنیاوەو، لـە لـەش پیسـیی خراپـەو تاوانەکـانو، لـە گـژو گیـاو چـرپ‌و چـاڵی سـیفەتە بـەدەکان‌و خووخـدە

پیسـەکـان، پاك نەبیەوە، مەودای بەرەو خوا چوونو لەخوا نزیکـبوونەوەت نیـە، چـونکە بە دیداری خوا شـادبوون، ئامانجو مەبەستێکی یەکجار بـەرزو پیـرۆزەو ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الواقعة.

واتە: پاکـبووەوان نەبێ دەستیان نایگـاتێ[1].

هەر بۆیەش خوای زاناو میهرەبان، تۆبەکردنی بە یەکەمین خەسڵەتی سـەرەکیی ئەو بڕوادارانانە دانـاوە، کە سەرو ماڵی خۆیـان بەخوا فرۆشتوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقًّا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾ التوبة.

دیسـان هەر بۆیەش پێغەمبەری دانامان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: {الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ}[1].

---

(١) یەکێك لە خواناسانی دڵ بێدار لەوبارەوە فەرموویەتی: ((کیـف یُشـرِقُ قلـبٌ صُور الأكـوان منطبعـة فـي مرآته؟ أم كيف يَرْحَل القلب إلـى الله وهو مُكَبَّل بشهواته؟ أم كيف يدخل الحضرة ولـم يتطهـر مـن جنـابة غفـلاته؟ أم كيف يفهم دقائق الأسرار وهو لـم يتُب من هفواتـه؟!!)، واتە: چۆن دڵێك ڕووناك دەبێتـەوە، کـە وێنەی دروستکراوەکان لە ئاوێنەکەیدا تۆمارکراوە (لەبەر خورما نایەڕژێتە سەر خوا)، یـان چۆن دڵێك کـە بە کۆتو زنجیـری ئارەزووەکانی داپێچراوە، دەتوانێ بەرەو خوا بچێ، یان چۆن دڵێـك ڕێـی دەکـەوێ بچـێتە خزمەت دیداری خوا، کە جارێ خۆی لە لەشـپیسیی‌و کەمتەرخەمییەکانی پاك نەکردۆتـەوە؟ یـان چـۆن بـە تەمایە لە نهێنییە وردەکان حـاڵیی بێ، کە جارێ لە وردە هەڵەکانی نەگەڕاوەتەوە؟!

بڕوانە: (إيقاظ الهمم فـي شرح الحكم )، ب: (٢)، ل: (٤٦٢).

واتە: پاكیی نیوەی بڕوایە، هەڵبەتە لێرەدا وشەی (طهور) ئەگەر پاكیی ڕواڵەتیش بگرێتەوە، زیاتر پاكیی مەعنەویی مەبەستە، چونكە دەگونجێ مرۆڤ ڕواڵەتی لە هەموو كەس پاكوخاوێنتر بێو، هێندەی دەنكە خەرتەلەیەكیش بڕوای لەدڵدا نەبێ، چ جای نیوە[٢] !

ئێستاش لە چەند خاڵێكدا نێوەڕۆكو چۆنیەتی تۆبە دەخەینە ڕوو:

**١/ تۆبە یانی چی ؟!**

(توبة) گەڕانەوە: بە پێچەوانەی لێحاڵیبوونی زۆربەی خەڵكییەوە، بریتی نیە لە وشەیەك، كە بە زار دەگوترێ، چونكە وشەی (التوبة) لە ئەسڵی زماندا یانی: گەڕانەوە، شەرعیش هەر لەسەر ئەسڵی واتا زمانییەكەی بەكاریهێناوە، بەڵام تایبەتی كردوە بە گەڕانەوە بۆ لای خوا جل جلاله.

بەڵێ.. تۆبە یانی وازهێنان لە گوناحو تاوانو خووو خدەو ڕەفتاری خراپو، بە دڵ پەشێمانبوونەوەو، بە زمان دان بە تاوانباریی خۆدا هێنانو، پاڕانەوەو داوای لێبوردن كردنو، بڕیاردان لەسەر نەگەڕانەوە سەر تاوانو خراپەو، بەردەوامبوون لەسەر

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد، برقم: (٢٢٩٥٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٥٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥١٧) وَقَالَ: صَحِيح، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٦٥٣) برقم: (٢١١)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) برقم: (٢٧٠٩) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ.

(٢) زۆر وێدەچێ كە مەبەست لەم فەرموودەیە {الطَّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ} ئەوەبێ، كە لە زاراوەی تەصەووفو تەزكیەدا پێی دەگوترێ (التخلية)، واتە: خۆ خاڵیكردن لە سیفەتو خووە بەدەكان (الرذائل)، چونكە هەروەك زانایانی دڵ بێدارو هوشیار فەرموویانە: كاكڵی مسوڵمانەتییو خواناسیی دوو شتە:
١/ خۆ پاككردنەوەو لەخۆ دارنینی سیفەتو خووە ئاژەڵییو دڕندەییو شەیتانییەكان، كە پێی دەگوترێ (التخلية) و ئیمام غەززالیی بەو خەسڵەتانە دەڵێ: (المهلكات)، واتە: فەوتێنەرەكان.
٢/ خۆڕازاندنەوە بەو خەسڵەتو خووە پەسندە پاكو چاكانەی، كە لە فریشتەكاندا هەنو، ئیمام غەززالیی بە (المنجيات) ڕزگاركەرەكان، ناویان دەبات، ئەمەیش لە زاراوەی (تزكية و تصوف)دا پێی دەگوترێ (التحلية)، بە هەر كام لە (تخلية وتحلية) (تزكية) پێكدێنن، (تزكية)ش وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ۝٩﴾ الشمس. كەواتە (تزكية) لە یەك كاتدا، مانای (تخلية وتحلية) هەردووكیان دەگەیەنێ. بڕوانە (مفردات القرآن)ی راغب الأصفهاني، ل: (٢١٣).

خواپەرستییو کردەوەی چاك، بە ئەندامەکانیش جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەو، سەلماندنی ڕاستیی ئەو پەشیمانبوونەوەیە.

بۆیە ئەوانەی بە زمان دەڵێن: (أستغفر الله وأتوب اليه)، بەڵام بە کردەوەو حاڵ، هەر بەردەوامن لەسەر حاڵو وەزعی پێشوویانو، بەس زمانیان گۆڕانی بەسەردا هاتوە، دەنا ئەندامەکانیان هەر لەسەر بەزمو ڕەزمی پێشوویانو، لەسەر تاوانو گوناحکردن بەردەوامن ! ئەوانە لەڕاستییدا نەك هەر بە تۆبەکردوو لەقەڵەم نادرێن، بەڵکو بە گاڵتەکردوو بە تۆبە، لەقەڵەم دەدرێن !

چونکە تۆ یەکێك بانگت بکات بۆ لای خۆیو بڵێ: بگەڕێوە لام، تۆش بەزار بڵێی: ئەوە گەڕامەوە. یان ئەوە دەگەڕێمەوە !! بەڵام بە کردار هەر بەردەوام بی، دیارە ئەو جۆرە ڕەفتارەت، جگە لە گاڵتەپێکردن، هیچ تەفسیرێکی دیکەی نیە، ئنجا ئێستا کە مەعناو نێوەڕۆکی تۆبەمان بۆ دەرکەوت، با بزانین تۆبە چۆن دەکرێت ؟!

### ٢/ چۆنیەتی تۆبەکردن:

پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: {مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذنْبَاً، ثُمَّ يَقُوم فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللّهَ إِلاّ غَفَرَ لَهُ}(١).

واتە: هەرکەسێك تاوانێك بکات، پاشان هەستێ خۆی پاك بکاتەوە، (خۆی بشوات، یان دەستنوێژی بگرێ)، ئنجا دوو ڕکات نوێژ بکات، دوایی داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، بێگومان خوا دەیبەخشێ.

---

(١) رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٤٠٦)، وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيح، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٣)، وَحسَّنَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (١٣٢٤)، عَن أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ، وفي رِوَايَة أَبِي دَاوُد: {فَيتطهَّرُ فَيُحسِنُ الطُّهورَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكعَتَين فيَستَغفِرُ الله ... الحديث}.

کــەواتە:

خوێنەری شیــرین، مســوڵمانی بەڕێــز !

ئەگەر دەتەوێ ڕێگای صالح بــوونو بــەرەو خــوا چــوون بگــری ! هــەنگاوی یەکــەمت ئەوەیە، کە بەنیازی تۆبەکردنو گەڕانەوە لای خوا، خۆت بشــۆی، یــان ئەگــەر بــۆت ڕێ نەکەوت خۆت بشــۆی، دەســتنوێژێکی پوخت بگری، ئنجا دوو ڕکات نوێژی تۆبە بکــە.

دوایی هەتا دەتوانی سوپاسو ستایشــی خوا بکــەو، صــەڵاتو ســەلام بــۆ پێغەمبــەر (صلى الله عليه وسلم) بنێرە، ئنجــا چاو بە ڕابردووی خۆتــدا بگــێڕەو، هەموو ئەو تــاوانو خراپانەی، کە بە دڵو زمانو چاوو گــوێو دەســتو لاقو زارو گەدەو...هتــد کــردووتن، وەبیــــر خۆتیــان بێنــــەوەو، بــە گــەردنی کــەچو، ڕووی زەردو چــاوی فرمێســـکاوییو دەنگــێکی کزو بەلالانەوەو کڕووزانەوەو، فرمێســـك باراندنــەوە، دەســت بــەرز بکــــەوەو بڵـــێ:

خوایە! من لە هەموو ئەو تــاوانو خراپانەو زۆری دیکەش، کــە مــن، یــان لــە یـــادم نەمــاون، یان هەر نەمزانیون، کــردوومنو لــێیان پەشــێمانمو دان بــە هەڵــەو ناتــەواویی خۆمدا دێنم، بەڵام لێم ڕوونە، کە تاوانو خراپــەکانم هەرچــەندە زۆربــن، لــێــبوردنی تــۆ زۆرترەو، هەرچەندە گــەورە بن، بەزەیی تــۆ مەزنتـــرە، ئنجــا خوایــە! داوای لــێبوردنو چاوپۆشــییت لــێ دەکەم، تۆش نائومێدم مەکەو بە لوتفو بەزەیی خۆت بمبــوورە، چونکە ئەگەر منیش شــیاوی بەخشران نەبم، تۆ شــایســتەی لــێبوردنو بەخشــینی !!

ئنجا پاش ئەوە جارێکی دیکە چاوێکی ورد بــە لیســـتی گوناحەکانتـــدا بگێــڕەوەو، بزانــە چــەندیان پەیوەندییـــان بــەس بــە خواوەیــە، ئــەوە ئومێــد وایــە ئەگــەر تۆبــەو گەڕانەوەکــەت بەڕاستیی بووبــێ، خـــوا لــە هــەقی خــۆی ببـــوورێ، بــەڵام ئــەو تــاوانو خراپانەی، کە پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیەو، مافی خەڵکیان خســـتوویە ســەر، ئــەوە ئەو جۆرە گوناحــانە وێڕای ئەوەی گوتمان، چەند شتێکی دیکەش هــەن، دەبــێ ڕەچــاویان بکــەی، ئەگەر بتەوێ ئەوانیشــت لێ بسڕێنەوەو، بەیەکجــاریی ڕزگارت بێ.

٣/ چۆنیەتی تۆبەکردن لەو گوناحانەی، کە پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە:

أ) چاو بە ڕابردووی خۆتدا بگێڕەوەو، زۆر بە وردیی سەرنج بدەو بزانە، داخۆ هەر لەکاتی باڵغ بوونتەوە هەتا ئەو سەعاتەی ئێستات، کە تۆبەی تێدا دەکەی، چ کەسێك مافێکی بەسەرتەوە هەیەو زیانێکت پێگەیاندوە، جا چ غەیبەتت کردبێ، یان بوختانت پێوە کردبێ، یان حەسوودییت پێ بردبێ، یان ماڵت خواردبێ، یان گومانی بەدت پێ بردبێ...هتد.

ئنجا کە هەموو ئەو کەسانەت وەبیر خۆت هێنانەوە، کە مافێك یان چەند مافێکیان لەو جۆرە مافانە لەسەرتە، بە دڵێکی غەمگینو چاوێکی بەگریانو ڕەنگی زەردو هەڵبزرکاوەوە، دەست بەرزبکەوەو بۆیان دەست بکە بە پاڕانەوەی گەرمو بە کوڵو، هەوڵ بدە چاکترین دوعای دونیاو دوارۆژیان بۆ بکەی، بە تایبەتی لەوبارەوە، کە خۆت بە قەرزداریان دەزانی.

واتە: ئەگەر بۆیە غەیبەتت کردبوو، کە لە ئابڕوو (سمعة)ی کەمبکەیەوەو، لە پلەو پایەی نێو جەماوەری داشکێنی، داوا لە خوای بەرزو مەزن بکە، کە ناوو پلەو پایەی بەرز بکاتەوەو، حورمەتو ڕێزی زیاد بکات، ئەگەر بۆیە حەسوودییت پێ بردوە، چونکە زانیاریی و تێگەیشتنی لەتۆ زیاترەو، ڕەوشتو خووی لەهی تۆ بەرزترەو جوانترە، لەخوا بپاڕێوە، کە زانیاریی و تێگەیشتنی پتر بکاتو، ڕەوشتو ئاکاری پەسندتر بکات، ئەگەر لەبەر دەوڵەمەندیی و دارایی ڕقت لێی هەستاوەو، هەوڵی زیان لێدانیت داوە، داوای بۆ لە خوا بکە، کە ڕزقو ماڵی حەلاڵی بۆ زیاد بکات و... هەروەها.

بەڵام گرنگ ئەوەیە بە دڵێکی ساغ بۆ ئەو خاوەن مافانە بپاڕێیتەوەو، لە قووڵایی دڵتەوە حەز بکەی، خوا چی خێرو چاکەیە بۆیان بکات، نەك لە دەمی پاڕانەوەشدا شەیتانی بەدو پیس، فێڵت لێ بکاتو، هەروا هاکەزایی و زۆر بە سادەیی دووعایان بۆ بکەی !!

ئنجا دوای ئەوە بیر بکەوەو بزانە کێی وا هەیە، کە بتبوغزێنێ، یان گومانی بەدت پێ بەرێ، یان غەیبەتت بکات، یان ئازارت بدات، یان حەسوودییت

پێ بەرێ.. یان.. هتد، دوای ئەوەی یەك یەكی ئەوانەت لە ئاوێنەی خەیاڵتدا ئامادەکردن، بە دڵو بە کوڵ بۆیان لە خوای میهرەبانو بەخشندە بپاڕێوەو بڵێ:

خوای پەروەردگار! تۆ لێبوردەیو لێبوردنت خۆشدەوێ، لەبەر ئەوە وا من لە هەموو ئەو کەسانە بوردم، کە بەهەر جۆرێكو شێوەیەك ئازارو زیانێکیان تووش کردووم، ئنجا داوات لێ دەکەم تۆش بە لوتفو بەزەیی خۆت بیانبەخشیو چاوپۆشییان لێ بکەی[(١)]، دەجا خوایە ! هەروەك چۆن من لە مافەکانی خۆم بوردمو گەردنی ئەوانەم ئازاد کرد، کە ئازارو زیانیان تووش کردووم، تۆش بە میهرەبانییو بەخشندەیی خۆت من ببەخشەو، مافی خەڵکیم لەسەر لابەرەو، لە چڵكو چەپەری ئەو جۆرە خراپەو گوناحانە قوتارم بکە.

**ب)** دوایی هەوڵ بدە هەرکەسێك[(٢)] کە بەهەر شێوەیەك زیانت لێداوەو دڵت ئازارداوە، داوای لێبوردنو گەردن ئازایی لێبکەیو، ئەگەر بگونجێو بزانی پتر ناڕەحەت نابێ، دەقی ئەو ئازارو زیانەشی بۆ بگێڕەوە، ئەگەر نا پێویست ناکات.

**ج)** هەوڵ بدە مالّی هەر خاوەن مافێکی زیندووت لەلایە بیدەوە، ئەگەر مردبیش، بیدەیەوە میراتگرەکانی، ئەگەر نەشگونجاو مسوڵمانانیش (بیت المال)ێکی ڕاستەقینەیان هەبوو، بۆی بخە (بیت المال)ەوە، ئەگەر نەشبوو، بۆی بکە بە خێرو چاکەو بۆی ببەخشە.

---

١) هەڵبەتە ئەمە بەس بۆ ئەو کەسانەیە کە مسوڵمانن، چونکە بۆ نامسوڵمان دروست نیە، مەگەر دووعای هیدایەت.

(٢) ئەگەر دەتەوێ بە تێرو تەسەلیی لەم مەسەلەی (حق الناس) ڕەتکردنەوەو چۆنیەتی خۆ رزگارکردن لەو مافانە حالیبی، بە وردیی سەرنجی کتێبی: (الزواجر في اقتراف الكبائر)ی (ابن حجر الهيتمي) بدە، باسی (الكبيرة)، ل: (٤٦٣)، (ترك التوبة من الكبيرة ) ب: (٢)، ل: (١٨١).

ئنجا مسـولّمانی بەڕێـز !

ئەگەر ئەو شـتانەی گوتران، هەموویان یەك بە یەك‌و موو بە موو جێبەجـێی بكـەی، ئەوە مسـۆگەرو دڵـنیابە، ئەگـەر بێـت‌و بـە دڵـێكی ڕاسـت‌و سـاغ، تـەو تۆبـەیەت كـردبێ‌و، بێجگە لە ڕازییكردنی خواو لـە خـوا نزیكـبوونەوە، هیچـی دیكـەت لـەدڵ نەگرتبێ، ئومێد وایە، كە تاوان‌و خراپەكانت هەر چۆنێكی‌و هـەر چـەندێكی بـن، خـوای میهرەبـان بە ئاوو تەرزەو بەفری لوتف‌و بەخششـی خۆی لێت بشوات‌و، وەك قوماشێكی سپیی چاك شۆراو پاك ببیتەوە.

پێغەمبەری پێشـەوامان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {التّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَ ْ لاَذَنْبَ لَهُ}[1].

واتە: تۆبەكـەر لە تـاوان، وەك ئەو كەسە وایە، كە تـاوانی نیـن.

٤/ نیشـانەی گەڕانەوەی سـاغ (التوبة النصـوح) چییـە ؟

مسـولّمـانی بەڕێـز!

دوای ئەوەی بەو شـێوەیەی بە كورتیی خرایـەڕوو، تۆبەت كرد، ڕەنگە بتـەوێ بزانـی داخـۆ تۆبەو گـەڕانەوەكەت لـێ وەرگیـراوە، یـان نـا !

دیارە هەقیشـتەو زۆر جێی خۆیەتی، كـە هـەوڵی زانینـی وەرگیـران‌و وەرنەگیـرانی تۆبەكەت بدەی، بۆئەوەی ئەگەر بزانی تۆبەكەت وەرنەگیـراوە، لێی ڕانەوەستی‌و جـارێكی دیكە سەرلەنوێ تۆبەكـەت دووبـارەو سێبـارەو چـەند جـارە بكەیـەوە، هـەتا دەگەیـە دڵنیایی تەواو، كە تۆبەكـەت وەرگیـراوە، چـونكە هـەروەك چـۆن ئـەو كەسـەی شـتێك دەشوات، ئەگەر بزانێ بە جارێك شـۆردن پاكـنەبۆتەوە، دەیكاتە دووجارو هەروەها، هەتا خاوێنی دەكاتەوە، ئێمەش پێویسـتە، هەتا مسـۆگەر نەبین وازنەیەنین‌و كـۆڵ نەدەین.

---

(١) أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقـم: (٤٢٥٠)، وَالبَـيْهَـقِي فـي (شعـب الإيمان) برقـم: (٧١٧٨) وَ رجَـالُهُ ثِـقَات عَـنْ عُـبيدة بن عبدالله عَن أبيـهِ، وَحَسَّـنَهُ الألبـاني فـي (سُنَن ابْنُ مَاجَهْ)، برقم: (٣٤٢٧).

ئێستاش با بێینە سەر نیشانەی وەرگیرانی تۆبە:

پێشەکی دەڵێم: خوای تاك و پاك فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ... ﴿٨﴾ ﴾ التحريم.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆلای خوا بە گەڕانەوەیەکی ساغ(بێ خەڵەتە)و دڵنیابن[1] کە پەروەردگارتان (بەهۆی تۆبەی ساغەوە) خراپەکانتان لێ بسرێتەوەو، بتانخاتە چەند باغێکەوە، کە ڕووبارییان بەژێردا دەڕۆن...

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێ، کە تۆبەی ساغو ڕاست، حەتمەن خوای بەبەزەیی بە لوتفو کەرەمی خۆی وەریدەگرێو، دەشیکاتە مایەی شۆرانو پاکبوونەوەی ئینسان، لە خراپەو تاوانەکانیو شادبوونی بە بەهەشتی بەرین.

مادام وابێ هەر کاتێك تۆبە، بە شێوەیەکی ڕاستو ساغو بێخەڵەتە کرا، ئەوە مسۆگەر وەردەگیرێ، دەشتوانین لە چەند خاڵێکدا نیشانەکانی تۆبەی ڕاستو ساغو وەرگیراو، بخەینە ڕوو:

**یەك)** مرۆڤ لە قووڵایی دڵیەوە بڕیارێکی قووڵو پتەوو یەکجاری بدات:

یەکەم: لە بارەی ڕابردووەوە، هەر گوناحو تاوانو خراپەیەکی کردوویەتی، زۆری لەسەر پەشێمان بێو، نەگەڕێتەوە سەریو، مافی هەموو خاوەن مافێك بداتەوە، یان گەردنی خۆییان پێ ئازاد بکات.

هەر چاکەو پێویستییو ئەرکێك، کە چوواندوویەتی، زۆری پێ ناخۆش بێو، بڕوای وابێ، کە گەورەترین زیانی لێ کەوتوە.

---

(١) چونکە زانایان فەرموویانە: (عَسَى مِنَ اللهِ وَاجِبَة)، واتە: هەرچەندە (عسى) لە زمانی عەرەبییدا بەمانای ڕەنگەو لەوانەیە، دێ، بەڵام کە خوا بەکاری هێنا، مەعناکەی دەبێتە حەتمییو مسۆگەر، چونکە بەخشندە، ئەگەر یەکێکی بەتەما کرد، پێی دەبەخشێ (الكريم إذا أطمع أعطى).

دووەم: لەبارەی ئێستاوە، دەست لە هەموو تاوانێکی وردو درشت هەڵبگرێو، قۆڵ لە جێبەجێ کردنی هەموو ئەرکو پێویستییەکانی سەرشانی هەڵبکات، هەرچیش لە ڕابردوودا چواندوویەتی، بیگێڕێتەوە.

سێیەم: لە بارەی داهاتوویەوە، دڵی قایم بێ لەسەر نەگەڕانەوە سەر خراپەو تاوانەکانو، بەردەوام بوون لەسەر چاکەو جێبەجێ کردنی پێویستییەکان (الفرائض).

**دوو)** هەوڵ بدات هەروەك چۆن كاتی خۆی بەهۆی شتی حەرامەوە، یان بەهۆی گوناحو تاوانانەوە، یانی لانیکەم بەهۆی تەنبەڵییەوە، گۆشتو بەزی وەسەریەك ناوەو خۆی قەڵەو کردوە، لەمەولا بەهۆی خواپەرستییو خۆماندووکردنو، گریانو خەفەت خواردنو ئازاردانی نەفسەوە، ئەو گۆشتو بەزە بتوێنێتەوەو، بە مەعنای وشە خۆی قاڵ بکاتەوە.

**سێ)** دەبێ پاش تۆبەکردن، هەست بکات، کە گوناحو تاوانەکان وەك ژەقنەمووت تاڵو ناخۆشنو، ئەوپەڕی تامو چێژیش لە خواپەرستییو کردەوە چاکەکان وەربگرێ.

**چوار)** دەبێ لە خواردنو خواردنەوەو نووستنو قسەکردنو تێکەڵ بوونی خەڵکی، بگرێتەوە، (پاشان پتر ئەم باسە دەتوێژینەوە).

ئەمانە هەندێك بوون لە دروشمو نیشانە سەرەکییەکانی تۆبەو گەڕانەوەی ڕاستو ساغ.

ئنجا با کۆتایی باسی تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خوای بەخشندە، بەم فەرمایشتە موبارەکەی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) بێنین، کە هەندێك لە بەرهەمو بەرەکەتەکانی گەڕانەوە بۆ لای خوای تێدا خستوونە ڕوو:

{مَنْ لَزِمَ الإسْتِغْفَارَ جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجًا، وَمِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ}[1].

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٣٤) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ ضَعِيف، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٥١٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨١٩)، دیارە ئەم فەرموودەیە ئەگەر ئەگەر لەڕووی سەنەدیشەوە بێهێز بێ لەڕووی ماناو نێوەڕۆکەوە بەهێزەو، ژمارەیەك ئایەت هەمان مەبەستیان تێدایە .

واتە: هەرکەسێك لەسەر داوای لـێبوردن لە خوا کردن بەردەوام بێ، خوا لە هەموو دڵـتەنگـییـەك قوتاری دەکـاتو، لە هەموو سـەغڵـەتییەك دەرووی لـێ دەکـاتەوەو، بێ ئەوەی پێ بزانێ، بژیوی بۆ دەڕەخسـێنێ.

بەڵـێ خوێنـەری بەڕێـز !

زۆربەی هەرە زۆری گیـرو گرفتو کێشـە ماددیی‌و مەعنەوییەکانمـان، لـە سـۆنگەی گوناح‌و هەڵەو لادانەکانی خۆمانەوە، سەر هەڵدەدەن، وەك خـوای دادگـەر فەرموویـەتی: ﴿ وَمَآ أَصَـٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ ...﴿٣٠﴾ ﴾ الشورى.

واتە: هەر بەڵایەکـتان بەسەر دێ، ئەوە بەرهەمی کـردەوەی دەستی خۆتـانە.

دەجا وەك چۆن لاڕێ بوون‌و لە خوا یاخیی بوون، ماك‌و کـانگای بـەڵاو گرفتەکـانن، چاکەکـاریی‌و بۆ لای خوا گەڕانەوەش، مەڵحەمی سارێژکەری زۆربـەی هـەرە زۆری برین‌و زامە مـاددیی‌و مەعـنەوییەکـانن.

هەر بۆیەشە، کە دەبینین پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (علـيهم أفضـل الصـلوات وأتم التسليمات) فەرمانیان بە گەلەکانیان کردوە، کە داوای لێبوردن بکەن‌و بگەڕێنەوە لای و، لە بەرانبەر ئەوەشدا وێڕای لـێبوردن‌و بەهەشـت، موژدەی خێرو خۆشی دنیاشـیان پێـیـان داوە، بۆ وێنـە:

١- نووح (سەلامی خوای لـێـبێ) فەرموویـەتی: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ ﴾ نوح.

واتـە: ئنجـا گـوتم: داوای لــێبوردن لـە پـەروەردگارتان بکـەن، بێگومـان ئـەو زۆر لـێبوردەیە، لە ئاسـمانەوە بارانێکـی بـەخورزەمتان بـۆ دەنێـرێ‌و، مـاڵ‌و سـامان‌و کـوڕانتان پێ دەبەخشـێ‌و، باخـان‌و ڕووبـارگەلـتان بۆ دەڕەخسـێنێ.

٢- هەروەها هود (علیه السلام) بە گەلی خۆی کە (عاد)ە، فەرموویەتی: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ هود.

واتە: ئەی گەلەکەم ! داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، ئنجا بگەڕێنەوە لای، لە ئاسمانێوە ئاوی بەخوڕتان دەڕژێنێتە سەرو، وێڕای هێزو تواناتان، هێزو پێزتان بۆ زێدە دەکات .

٣- یونوسیش (سەلامی خوای لێبێ) دوای ئەوەی نەهەنگ قووتی دا، بێجگە لە دان بە هەڵەی خۆ داهێنانو، خۆ بە ستەمکار لەقەڵەمدانو، داوای لێبوردن لە خوای میهرەبان کردن، هیچی دیکەی بەدەستەوە نەمابوو و، هیچ شتێکی دیکەشی لەفریا نەهات، وەك خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرمووییەتی: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: خاوەنی ماسیی - یونس- کاتێك، کە بە تووڕەبوونەوە لە لای خەڵکی نەینەوا ڕۆیشتو پێیوابوو (مانەوە لەنێو خەڵکی نەینەوا دای) لێ وەتەنگ ناهێنین (و بۆی هەیە بچێتە شوێنێکی دیکە)، (ئنجا) دوای ئەوە نەهەنگ هەڵیلووشی، لەنێو تاریکییەکاندا بانگی خوای بە بەزەیی کرد کە ئەی خوایە ! بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراو نین، تۆ پاکی، بەڵام من لە ستەمکاران بووم، ئنجا بەدەنگیەوە هاتینو، لە خەفەتو تەنگانە قوتارمان کرد و، هەر ئاواش بڕواداران ڕزگار دەکەین .

مسـوڵمـانی خۆشـەویسـت !

دوای ئەوەی بەم شـێوەیەی گوتم تۆبەت[1] کردو، ئەو نیشـانانەی خرانـە ڕووش، لـە تۆبەکـەتدا دیتـران، ئەوە دڵنیـابە، ئەگەر خوا حەز بکـات، تۆبەکەت گیـرا بووەو، چـاك چـاك پـاك بوویەوە.

مانای وایە ئێسـتا وەك بابایەکی بەدەستنوێژ، بۆت هەیە نوێژی لە خوا نزیکـبوونەوە دابەستیو، وەك بابایەکی لەش پاك، بۆت هەیە بچیتە خزمەت ماڵی خـواو، دەسـت بـۆ کتێبی خوا بەری و، وەك جووتیـارێك، کـە زەوییـەکـەی دەکـێڵـێ‌و بـژاری دەکـاتو هەڵـیدەوێژێرێ، تۆش بە گاسنی تۆبەیەکی ڕاست، زەویی دڵو دەروونی خۆت کـێـڵاوەو، لە گژو گیاو پچـكو پاڵـی گوناحو تاوانەکان، هەڵتـوێـژارتوەو، ئامـادەی شـت تێـدا چـاندنت کردوە.

مادام واش بێ، ئەوجار بچۆ سەر قۆناغی دووەمو، هەنگاوی دووەم هەڵـێـنەوە.




(١) باسی (توبة) بەم چەند لاپەڕەیە تەواو نابێ، خوا پشـتیوان بێ بەتـەمام لـە نامیلـکـەیەکـی تایبـەتو تەرخاندا بە تیـرو تەسـەلیی بیتوێژمـەوەو، (إن شـاء الله) هـەوڵ دەدەم دوا بـەدوای ئـەم کتێبـە چـاپو بڵاوبکرێتەوە، بۆیە هەندێك بابەتو مەسەلە، کە بەتەمابووم لەم چـاپی سێیەمدا بیاننووسـم، هەڵمگـرتن بۆ ئەوێ.

ئێسـتاش (٢٢/ ١/ ٢٠١٢) دەڵێم: سـتایش‌و شـوکرانە بۆ خوای بەخشـەر کـتێبـی (گـەڕانەوە بـۆ لای خـوا) هەتـا ئێسـتا پێنـج جاران چـاپ کراوەتەوە.

ئێستاش: ٢٠٢٠/٩/٢٩ز- ١٤٤٢/٢/١٢ك. بەتەماین چاپی شەشەمی بکەینەوەو ئێستا لەژێر چاپە.

## قۆناغی دووەم: زانیاریی و چاو ڕوون بوونەوە

مسولّمانی بەڕێزو خۆشەویست !

دوای ئەوەی قۆناغی یەکەمی بەرەو خوا چوونت بڕی و، تۆبەت کردو پاك بوویەوە، مانای وایە ئێستا وەك ڕێبوارێك وای، کە کەلوپەلو توێشووی ڕێیەی ئامادە کردوە، ئەوجار دەیەوێ بکەوێتە ڕێ، بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نیە، کە هیچ ڕێبوارێکی ژیرو فامیدە، ناکەوێتە ڕێ و، ملی ڕێیە ناگرێ، هەتا تەواو لە پێچو پەناو کونو قوژبنی ئەو ڕێیە شارەزا نەبێ، کە دەیەوێ پێیدا بڕوات.

کەواتە: پێویستە تۆش، ئێستا - پاش گەڕانەوەو پاك بوونەوەت - سەرگەرمی ئەوە بی، کە بزانی: داخۆ سروشتی ڕێی لە خوا نزیك بوونەوەو بەرەو خوا چوون، چۆنەو، پێویستە چی بکەی و چی نەکەی؟ دەنا ئەگەر خوا نەخواستە بەبێ زانیاریی و شارەزایی و، پێش بەرچاو ڕوونبوونەوە، بکەویە ڕێ، زۆر نزیکە ڕێگات لێ ونبێ و، شەیتانەکان گیرۆدەی کەندەڵانو هەڵدێرو شوێنی عاسێت بکەنو بەمراد نەگەی.

زۆر چاك بزانە! زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی بە نەزانیی و بێ ئاگایی، بەڕێی بەرەو خواچووندا کەوتوونە ڕێ، نەك هەر نەگەیونە جێ، بگرە زۆربەیان سەریان لە زەندەقەو لاڕێ بوونو گومڕاییەوە، دەرچووە !

خوای زانا لەوبارەوە بەئاشکرا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌۚ ...(٣٦)﴾ الإسراء.

واتە: بەدوای شتێك مەکەوە، کە زانیارییت دەربارەی نیە.

ئیمام مالیکیش گوتوویەتی: ((من تفقه وَلَمْ يتصوّف فَقَدْ تفسق، ومن تَصَوَّف وَلَمْ يتفقَّه فَقَد تزندق، ومن تفقه وتصوَّف فقد تحقق)) کە پێشتر مانامان لێکدایەوە.

ئنجا ئێستا ڕەنگە بڵێی: باشە ئەوە قەناعەتم هێنا، کە بەبێ زانیاریی و تێگەیشتنو بەرچاوی خۆ دیتن، ناگونجێ مرۆڤ بەرەو خوا بچێ، بەڵام ئاخر ئەو زانیاریی و

شارەزاییە، چۆنـەو چەندەو لەکـوێ دەسـتـگیـر دەبێ؟!

لە وەڵامدا دەڵـێین:

لە ڕاستییدا مەبەسـتمان لەو زانیـاریی‌و شـارەزاییە، تێگەیشـتن‌و حاڵـیی بوونـە لـە ئیسـلام، کە بـەهۆی لێکۆڵـینەوە لـە قورئـان‌و سـوننەت‌و، ئـەو کـتێبـانەی شـەرح‌و لـێکـدانەوەی وانـن، دەسـتـگیـر دەبـێ، ئنجـا بێگومـان ئەمـەش بـۆ کـەم کـەس هەڵـدەسووڕێ، کەواتە: دەبێ لای کـەم (حـد أقـل)ی ئەو زانیـاریی‌و شـارەزاییە دیاریی بکەین، کە دەتوانین بڵـێین بریتـیە لـە:

١/ شـارەزایی دەربـارەی بنچـینەکانی تێـڕوانین (تصـور)ی ئیسـلامیی، سـەبارەت بـە بوونـەوەرو ژیـان‌و ئینسـان، کە زاراوەی بوونناسیی(معرفة الوجـود- Ontology) بۆ بەکاردێ.

٢/ شارەزایی دەربـارەی پایە بنەڕەتییەکانی بیـروبڕوا (عقیدة)ی ئیسـلامیی.

٣/ شارەزایی دەربارەی کاکـڵ‌و نێوەڕۆکی خواپەرستیی (عبادة) بەگشـتیی‌و، دەربـارەی پێنج دروشـمەکانیش (نوێژ، ڕۆژو، زەکات، حەج، زیکر) بەتایبـەتیی.

٤/ شـارەزایی دەربـارەی خوو ڕەوشـتی بەرزو جـوان‌و ئـەدەبە شـەرعییەکـان.

٥/ شـارەزایی دەربـارەی هەر مەسەلەو بابەتێکی دیکە، لە هەموو بوارەکانی خێزانیـی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سـیاسـیی‌و ئابووریی‌و...هتددا. کـە ئینسـانی مسـوڵمان سـەری تێـی دەوەستێ‌و پەکی لەسەری دەکـەوێ، بۆ وێنـە: کەسـێك بیـەوێ ژن بهـێنێ‌و ماڵ پێکـەوە بنێ، پێویسـتیی بـە زانیـاریی شـەرعیی هـەیە، لـە بـواری خێـزان دروسـت کردنـدا، هەروەها کەسێك بیەوێ جیهـاد بکـات، دەبێ لەوبـارەوە بەرچاوی ڕوون بێت، هەروەها مامەڵەو بازرگـانیی‌و...هتـدیش بەهەمـان شـێوە.

ئنجا مسـوڵمانی بەڕێز !

دوای ئەوەی ئەم قۆنـاغی دووەمی (زانیـاریی‌و چاو ڕوونـبوونەوە) شت بڕی، ئەوجـار خـۆت گـورج‌و گـۆڵ بکەو، بەرەو قۆنـاغی سـێیەم هەنگـاو بنـێ، کـە: ئیخـلاص‌و یەکـلابوونەوەیـە.

## قۆناغی سێیەم: ئیخلاص و یەکلابوونەوە

مسـولمانی عەزیزو شـیـرین !

دوای ئەوەی قۆناغی دووەمت بڕیو، لە ئـاییـنی خـواو ڕێـی بـەرەو خواچـووندا زانـا بوویو، بەرچاوت ڕوون بۆوەو، زانیت ئەو ڕێیەی بەتەمای بیبـڕیو، بگـەیە مەنزڵو، ببیە مسولمانێکی تەواوو کامڵ، چییەو چۆنە؟! ئێسـتا بەس یەکـت لەسەر ئەوە کەوتوە، کـە ناوی خوای لـێ بێنیو، یەکەمین شـەقـاو هەڵـێنیو بکەویـە ڕێ، مـادام وابـێ سـەبرێ بگرەو یەك شەقـاویش هەڵـمەیەنە، هـەتا ئەم قۆناغەی سـێیەمەش دەبڕی، کـە بریتـیـە لە (ئیخلاصو یەکـلابوونەوە)، چونکـە بەدەردی شاعیـرێکی فـارس گووتویەتی:

عبـادت بـە إخـلاص نیـت نیکـوسـت
و گـرنە چ آیـد زبـی مغـز پوسـت
أگـر جزبـە حـق میـرود جـادەات
در آتـش فشـانـنـد سـجـادەات

واتە: خواپەرسـتیی بە نیـازو مەبەستێکی بێ خڵـتەوە چاکـە، دەنـا توێکڵـی بـێ کاکـڵ چی لـێ پەیدا دەبێ؟ ئەگەر ڕێگەت بەلای جگە لە خوادا بـڕوات، بەرماڵـەکـەت لـێ دەئاگـری دۆزەخ داوێـن.

بەڵـێ چاوەکـەم !

ئەگەر کردەوەکان تۆو بنو، تەمەن زەوی بێ، ئیخـلاصو خـوا پـێ مەبەسـت بـوون (ئـاو)ەو، بێگـومان هیچ ڕووەکـێکـیش بەبێ ئاو نـاڕوێو گەشـە ناکـات، کەواتە هـیچ کردەوەیەکی چـاکـیش بەبێ خوا پێ مەبەسـت بوون، نایـەتە دیو وەرناگـیـرێ.

بەڵـێ هـەروەك چۆن شیـر هەتا (هەوێن)ی تێنەکرێ، نامەیێو نابێتـە ماسـت، هـیچ جمـوجـۆڵو چالاکـییەکـیش، بەبێ هەوێنی ئیخـلاص نامەیێو بەکەڵـك نـایەت، هـەر

بۆیەش پێغەمبەری ڕابەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {كُلُّ أمْرٍ ذِي بَالٍ لَم يُبْدأُ فِيهِ بِبِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَن الرَّحِيم، فَهُوَ أقْطَعُ}(١).

واتە: هەر ئیشێکی گرنگ، کە بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ نەکرابێ، ئەوە دوابڕاوو بێ خێرە !

چونکە لە دەمی (بسم الله) کردندا، پێویستە مرۆڤ، چوار شتی بە دڵدا بێن:

یەکەم: ئەم کارە بەس بۆ ئەوە دەکەم، کە خوا لێم ڕازی بێ.

دووەم: ئەم کارە بەناوی خواوە دەکەم.

سێیەم: ئەم کارە بەهێزو دەسەڵاتو شانو شەوکەتی خۆم نایکەمو، بە یارمەتیو توانای خوا ئەنجامی دەدەم.

چوارەم: ئەم کارە بەپێی ئەو شەرعو بەرنامەیە ئەنجام دەدەم، کە خوا ناردوویەتی.

ئنجا گومانیشی تێدا نیە، کە هەر کارێکی خێر یەکێك لەم مەرجانەی تێدا نەبن، خاوەنەکەی سەپانی پووشێیەو ماندووی بێ بەرهەمە.

دیسان هەر بۆیەش لە سەرەتای نوێژەوەو پێش خوێندنی فاتیحە، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فێری کردووین کە بڵێین: {وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ...}(٢).

واتە: ڕووی - دڵی - خۆمم لەو زاتە کرد کە ئاسمانەکانو زەوی بنیادناون.

بێگومان لێرەدا مەبەست لەڕووی خۆم (وجهي)، نابێ ڕووی ماددیی و ڕواڵەتیی بێ، چونکە مرۆڤ لەکاتی نوێژدا، ڕووی ڕواڵەتیی بەرەو قیبلەیەو، دیارە خواش (جلّ

---

(١) ) ذكره العظيم آبادي (ج١٣، ص١٢٧) وقال: وهو حديث حسن. وانظر: الجامع الصغير، للسيوطي: ٦٢٨٤، وحسّنه النووي في الأذكار.

(٢) ) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٢٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٤٨)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٤٦٢)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان) برقم: (٣١٣٣)، عَنْ عَلَي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

جلاّلـه) نه لـەلای کـەعبـەو، نە لە هیچ شوێنێکی دیکەش[١] نیە، کەواتە مەبەست لـە (ڕوو) لێرەدا، ڕووی دڵو دەروونو نیازو مەبەستە.

ئنجـا مسـوڵمانی خۆشـەویسـت !

تۆش ئێسـتا بەرلەوەی بجـوولـێی، ڕووی دڵو نیـازو مەبەسـتت بکـە قیبلـەی هـەرە بەرزت، کە خوای بەرزو مەزنو بەخشـەرو داهێنەرو خـاوەن لـوتفو بەزەییـەو، تـەواو تەواو دڵـت ساغو یەکلا بکەوەو، بێجگە لە: (لە خـوا نزیـك بوونـەوەو، بـەرەو بـەرزایی بەرزبوونەوەو، بە ڕەزامەندیی خوا شادبوونو، کـامڵ بـوونو، تێگەیشـتنو پێگەیشـتن) هیچ نیازو مەبەستو ئاواتو ئامانجو خولـیایەکی دیکە لە دڵتـدا مەهێڵەو، پـاك پـاك نیازەکانی دڵو دەروونت بە بێژنگی قورئانو سوننەت دابێژەو، بێجگە لـە دەغلـی کـاکڵ دارو ساغی خوا پێ مەبەسـت بوونو، بەرەو خوا چـوون، ئـەوی دیکـە هـەمووی فـڕێ بـدە.

بەلاّم چاوەکـەم ! زۆر زۆر وریـای خـۆت بـە، بـا زیـوانو بنـژیلو گەنمـی کوێـرو لـێدراویی، نیازو مەبەستەکانی دیکـە، هەرچییەك بن، فێڵـت لـێ نەکـەنو، خۆت لـێ بە گەنم نیشـان نەدەن، چونکە نەفـسو شـەیتـان فێڵو فەرەجیـان گەلـێـك زۆرە !!

ئنجـا با لە کۆتـایی ئەم باسەدا، سێ قوڵـە ئامۆژگارییانیشت بکـەم:

یەکـەم: ئەگـەر هەموو کەس فـێڵی لـێبکـرێ، فێـڵ لـە خـوا ناکرێ، چـونکە خـوا وەك پێغەمبـەری پێشـەوامان (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویـەتی: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلى أَجْسَامِكُمْ، وَلاَ إِلى صُوَرِكُمْ، وَلَكِن يَنظُرُ إِلى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُم}[٢]

واتە: بێگومـان خوا نە تەماشای لەشو لارتان دەکـات، نە تەمـاشـای دیمەنتـان، بەڵـکو تەماشـای دڵەکـانتـان و کردەوەکانتان دەکـات.

---

(١) ) مەبەست (لـێبوون)ی ماددییو بەرهەستە، چونکـە خـوا نـە لـە زاتـیو نـە لـە سـیفەتەکانیدا لـە دروسـتکراوەکانی ناچێـت (لیس کمثلـه شـيء)، کە دەشـڵـێین خوا لە سەرووی ئاسمانەکانەوەیەو لەسـەر عەرشە، دیارە بە شێوەیەك، کە بۆ خوا شـایسـتەیەو لایقـەو ئێمە چۆنیەتییەکـەی نازانیـن.

(٢) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٧٠٨) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

کـەواتە عـەزیـزم ! پەلـەپەلو تـالووکە مەکـەو، هەتا تەواو دڵـنیاو مسـۆگـەر نـەبی، کـە ڕووی دڵـت جگـە لە خوا، لە هیچ شتێکی دیکە نیە، ئەم قۆناغە بەجێ مەهێڵـەو مەکـەو، ڕێ، چونکە (شـیـر) هەرچەندە زۆر چـاك بێـت، بەبێ هـەوێن نـامەییو دەترشـێ، ئەگـەر دنیـایەش بەتـۆوی دابچـێـنی، بـەبێ (ئـاو) سـەوز نـابێ، کەواتە: هەتـا ڕووی دڵـت لەگـەڵ خـوادا ڕاسـت ڕاست نەکەیو، تەواو تەواو خـۆت بۆ خـوا خاوێنو یەکلا نەکەیەوە، هیچ مەکە، چونکە دیوارێـك لەسـەر زبـڵ دابنرێ، سەرەنجامی هەر ڕووخانو هـەرەس هێنـانە!

دووەم: هەموو جـموجـۆڵو چـالاکییو ڕەنجـدانێکی بابـای مسـولمان، بـە مەبەسـتی ئەوەیە، کە خـوا لـێی وەربگـرێو پاداشـتی بداتـەوەو بـە بەهەشـتی بـەرینیو ڕەزامەندیی خۆی شـادی بکـات، دەجـا خوا بە ڕاشکـاویی ڕایـگـەیاندوە، کە کارو کردەوەی هیچ کەسێك ئیعـتیبـاری پێ ناکرێو وەرناگیـرێ، جگـە لـە خواناسـانی ڕاستەقینەو پـارێزکـار، وەك دەفەرمـوێ: ﴿...إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾﴾ الـمائدة.

واتە: بێگـومـان خـوا بـەس لە پاریزکـاران وەردەگـرێ.

کەواتە بـا بەر لـەوەی هەنگـاو بنێیـن، تەواو لە خۆمـان ورد بینـەوەو بزانیـن داخـۆ وایـن، کە خوا لـێمـان وەربگـرێ، یـان نـا ؟.

سێیەم: خـوای میهرەبان لە فەرموودەیەکی قودسـییدا فەرموویەتی: {أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي...}[1].

واتە: من بەگـوێرەی گـومانو بیـرکردنەوەی بەندەکـەمم سـەبارەت بە من.

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْـهِ: البُخَـارِيُّ برقـم: (٦٩٧٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٨١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٠٣)، وَقَـالَ: حَسَـنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَـهْ برقم: (٣٨٢٢)، وَابْنُ حِبَّـانَ برقـم: (٨١١) عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

کـەواتە مسـولْمانی بەڕێـز !

زۆر چـاك بزانە! بەبێ بۆ خوا ساغ بوونـەوە، هـیچ شـتێکــت لــێ هەڵـنـــاوەرێ و، چەندە مەبەستت خوا بێ‌و، چەندە ڕەزامەندیی خوات لە دڵ دابـێ، خـواش هێنـدە تـــۆی مەبەسـتـەو هێنـدە تـۆی دەوێ !

بەکـورتیی: (خوا لـەلای تۆ چـۆن بـێ، تـۆش لـەلای وی ئـاوای !).

ئێسـتاش دوای ئەوەی تەواو تەواو دڵـت بۆ خوا سـاغ‌و یەکـلا بـۆوەو، بێجگـە لـە وەدەسـتهـێنانی ڕەزامەنـدیی وی‌و لــێ نزیکــبوونەوەی، هـیچ ئـاوات‌و مەبەستێکــی دیکەی ماددیی‌و مەعنەوییت لە دڵدا نەماوەو، جگە لە خوا هـیچ شـتێکی دیکـە لـە ئاوێنـەی دڵـتدا بەدی ناکــەی، نـاوی خـوا بێنـەو خـۆت گـورج‌و گـۆڵ بکـەو، بـەرەو گرنگـتـرین‌و کـاریگـەرترین قۆناغی ئەم سەفەری بەرەو خوا چوونە بڕۆ، کە بریتـیـە لـە قۆناغی چوارەم: (پارێزکاریی‌و وردبوونـەوە).

## قۆناغی چوارەم: پارێزکاریی و وردبوونەوە

مسـولـّمانی بەڕێزو خۆشـەویسـت !

ئێستا، کە قۆناغی سێیەمت هەڵبواردوەو، بەتەواویی ڕووت لە خوا کردوەو، جگە لە ئامانجی بە دیداری خوا شادبوونو کامڵ بوون، هیچ نیازو مەبەستێکی دیکەی مەعنەویی، وەك مەدحو پێهەڵاگوترانو پلەو پایە وەدەستهێنانو، ڕووی خەڵکی بەلای خۆدا هێنان، یان ماددیی وەك دەسەڵاتو پارەو سامانو ئافرەتی جوان، لە ئاوێنەی دڵتدا نابینی، ئەمجار خۆت گشتو وشت بکەو، بچۆ قۆناغی: (پارێزکاریی ووردبوونەوە)وە.

ئنجا با بەرلەوەی بچینە سەر ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی: پارێزکاریی‌و وردبوونەوە، پێناسەیەکی پوختی پارێزکاریی (تقوی) بکەینو، بڕێك دەربارەی بەرهەمەکانی بدوێین:-

سەرجەم قسەو توێژینەوەی زانایان سەبارەت بە چەمكو واتای وشەی (تقوی) دەچێتە سەر ئەوە، کە (تقوی) یانی (وریایی‌و ئاگا لەخۆبوونو خۆ پاراستن)، بۆ وێنە (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (وصار التقوى في اصطلاح الشرع، حفظ النفس عما يُؤْثِمُ) [1]، واتە: تەقوا لە زاراوەی شەرعدا یانی (خۆپاراستن لە هەر شتێك، کە تاوانباریی تێدایە).

بەڵێ... (تەقوا) لە کوردییدا (پارێزکاریی) بۆ داندراوە، یانی: چاودێریی خۆکردنو وریایی‌و بێداریی‌و هۆشیاریی‌و خۆپاراستن، لە هەر نیازو مەبەستو قسەو وتارو کردەوەو ڕەفتارێك، کە نارەزایی‌و گلەیی خوای تێدایە، ئەو نیازو وتەو کردەوانەش، کە دەبنە هۆی گلەیی‌و نارەزایی خوا، سێ جۆرن :

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٢٣٠-٢٣١، المكتبة العصرية/ ٢٠١٢م.

یەکـەم: نەکردنی شـتێکی پێویسـت، یان پەسـەندو چـاك.

دووەم: کـردنی شـتێکی حـەڕام، یـان ناپەسـندو خـراپ.

سـێیەم: زیـادەڕۆیـی کـردن لە شـتی حـەڵاڵو موبـاح دا.

هـەربۆیـەش یەکـێـك لە هـاوەڵە بەڕێزەکـانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خــوا لـێیـان ڕازی بـێ، لـە وەڵامی یەکـێکـدا، کە لـێی پرسی تەقـوا چـییـە؟ گوتی: {(هل سَلكتَ طَرِيقاً ذا شَوك)، ئایـا هیچ جاران بـە ڕێیـەکـی دڕکـاوییـدا نـەڕۆیـوی؟

گـوتی: بـا.

گوتی: (فمـاذا فعـلـتَ؟) لـەو کـاتەیـدا چیـت کردوە؟

گـوتی: (شَمَّرت واجتَهدتُ) خـۆم گـورجو گـۆڵ کـردوەو ئاگـاداری خـۆم بووم.

گوتی: (فَذلكَ التقـوى) دەئـا ئـەوە تەقوایـە}!

ئنجا پاش ئەوەی، تا ڕاددەیەك زانیمان تەقوا چییــە؟ بـا نەختێکـیــش دەربــارەی گرنگـیی‌و بەرهـەمو دەسـتکـەوتەکـانی بدوێیـن:

١) تەقـوا دەبێتە هۆی زانـایی‌و چاو ڕوونـبوونەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال.

٢) تەقـوا وا لـە مرۆڤ دەکـات کـە خـوای لەگـەڵ بێـت: ﴿ ... وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ التـوبة.

٣) تـەقوا دەبێتـە هۆی لە قورئان حـاڵیی بـوون: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة.

٤) تەقـوا وا لــە ئینسـان دەکـات، کـە خـوا خۆشـی بوێـت: ﴿ ... فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾ آل عمران.

٥) تەقـوا هـۆی چونە بەهەشـتە: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ ﴾ القمـر.

٦) تەقوا مایەی لـێکرانەوەی دەرووی خێرە: ﴿... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾﴾ الطـلاق.

٧) تەقوا مایەی کاروبار بۆ ئاسان بوونە: ﴿... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾﴾ الطـلاق.

٨) تەقـوا دەبێتـە هـۆی پاداشـتی مەزنو سڕانەوەی خراپەکـان: ﴿... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾﴾ الطلاق.

٩) تەقـوا قەڵـغـانە لە بەرامبەر پیلانی دوژمنانـــدا: ﴿... وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾﴾ آل عمـران.

١٠) هـەر ئیـشو کـارێك لەسەر بنچینـــەی تەقـــوا دابمـەزرێ، هـــەرەس نایـەنێ: ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ... ﴿١٠٩﴾﴾ التوبة.

١١) سـەرەنجـامی خێر لـە گـرەوی تـەقواداران دایـە: ﴿... إِنَّ ٱلْعَـٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾﴾ هـود.

ئنجا با بزانین پارێزکارییو وردبوونەوە، چییـەو چۆنەو، چۆن دەستـگـیـر دەبـێ؟!

باشتـرین ڕێگای وەدەستـهـێنـانی پارێزکارییو وردبوونـەوە، ئەوەیـە، کـە ئینسـان هەموو ڕۆژێك بەبێ بواردن بەگوێرەی ئەو پەیمانـە پێـنج بەندییـە لەگـەڵ نەفسـی خۆیـدا ڕەفتار بکـات، کە زانایـانی دڵ بێـدارو هۆشیارو پارێزکار، بۆ بەرەو خوا چـوونو کـامڵ بوون، دایـانـناوەو لەسەری ڕێك کـەوتوون.

ئەو پەیمانــە پێنج بەندییەش بەکــورتیی ئەمەیە:

١- مــەرج لەگــەڵ دا گرتن (الــمشــارطة).

٢- چــاودێریی کردن (الـمراقبــة).

٣- ســەرکۆنە کردن (الــمعاتبــة).

٤- لــێپرســینەوە (الــمحاسبة).

٥- ســزادان (الــمعاقبــة).

چۆنیەتی ڕەفتــارکردنیش بە پەیمــانی نــاوبراو، بەم شــێوەیە:

**هەنگاوی یەکەم: مەرج لەگەڵ دا گرتن:**

هەموو ڕۆژێ بەیــانی، کە لە خەوێ هەڵــســــای، بــە عــەزمێکی پتــەوو پۆڵاییـنــەوە، خۆت بدوێنەو مەرج لەگەڵ نەفسی خۆتــدا بگرە، کە ئاگاداری خــۆی بێو وریــاو بێــدارو ورد بــێو، نەهێڵــێ گــیــرۆدەی هیچ خراپەو بێشــەرعیــیەك، یــان ڕەفتــارێکــی پــووچ (لغــو)و ناپەسند (مکــروە) بێ.

ئەو ئاگــا لەخـــۆبوونو هۆشـــیاریی‌و وردبوونــەوەش، بــە پاراســتنی حــەوت شـــتان دێتــەدی.[1]

أ/ وشــەکان (الکلمــات): هــیچ وشــەیەك نەڵــێو نەبیســـتێ، کــە تــاوان بــێ، یــان لانیــکــەم پــووچو بــێ ســوود بــێو، لــە گوتـــنی هــیچ وشــەو قســـەیەکی فــەڕزو ســوننەتیش خۆی نەبوێــرێ.

---

(١) ئاشکراو بەڵگە نەویستە، کە خەسڵەتی پارێزکاریی (تقوی) بەس بەوەندە نایەتەدی، کە ئینســان ئاگاداری خۆی بێ دووچاری هەڵەو تاوان نەبێ، چونکــە (بەرد)یش بە بەردایەتیی خــۆی، گوناحــان ناکــات، بــەڵام هەر بەردەو بەس بەمە نابێ بە هیچ ! کەواتە تەقوای ڕاســتەقینە ئەوەیە، کە وێــڕای خۆ لە خراپە پاراستن، خۆشت لە چاکەدا سەرگەرم بکــەیو، هــەوڵ بدەی دەقیقەیەکــیشت بــێهــوودە لەدەســت نەچــێ.

**ب/** سەرنجەکان (النظرات): سەرنج نەداتە هیچ شتێك، کە حەرام بێ، یان لانی کەم پووچو بێ سوود، یان ناپەسند (مکروە) بێو، چاوی تەنیا بەو سەرنجو ڕوانینانەوە خەریك بکات، کە پێویست، یان پەسندو باشن.

**ج/** نیازەکان (الخطرات): هیچ بیرو نیازێك بە دڵی خۆیدا نەهێنێ، کە خراپ، یان لایەنیکەم ناپەسند بێ، لە نیازو مەبەستی پێویستو سوننەتو پەسەندیشدا دریغیی نەکات.

**د/** تاوەکان (اللحظات): هیچ دەقیقەیەکی تەمەنی لە بێشەرعیی، یان پووچیی (لغو)دا بەڕێ نەکاتو، هەمیشە سەرگەرمی ئەنجامدانی ئەرکە شەرعییە فەرزو سوننەتەکان بێ.

**ھ/** هەنگاوەکان (الخطوات): بەرەو هیچ کارێکی خراپ، یان نا پەسند لاق هەڵنەهێنێو، بەرەو خێریش دریغیی نەکات.

**و/** پاروەکان (اللقمات): هیچ پاروویێك، یان لوقمێکی وا لە گەرووی ئاوا نەکات، کە نەك هەر حەرام، بەڵکو جێی شوبهەش بێو، لە موباحیشدا زیادەڕۆیی نەکات.

**ز/** جموجۆڵەکان (الحرکات): هیچ جموجۆڵێك بە هیچ کام لە ئەندامەکانی نەکات، کە حەرام، یان ناپەسند (مکروە) بێ، لە هیچ جموجۆڵێکی پێویستو پەسەندو چاکیشدا، تەنبەڵیی و سستیی نەنوێنێ.

**هەنگاوی دووەم: چاودێریی کردن:**

دوای ئەوەی بەو شێوەیەی، کە لە هەنگاوی یەکەمدا باسمان کرد، مەرجت لەگەڵ خۆتدا گرتو بەڵێنێکی پتەوت لەگەڵدا مۆر کرد، ئنجا دەستبەجێ دوا بە دوای ئەوە، چاودێریی و پشکنینێکی وردو بەردەوام بخە سەر خۆتو، زۆر چاك ئاگاداری وشەو ڕستەکانی زمانتو، ڕوانینی سەرنجەکانی چاوتو، نیازو مەبەستو خولیاو خەیاڵەکانی دڵو مێشکتو، چرکەو دەقەکانی تەمەنتو، پێ هەڵهێنانو شەقاوەکانی لاقانتو، قمە خواردنەوەو پاروە خواردنەکانی زارتو، جموجۆڵی

ئەندامەکانت بەو، نەهێڵی ئەگەر لانیکەم خواشیان پێ لە خۆت ڕازی نەکەی، ببنە مایەی شەرمەزاریی‌و ڕەنج بەخەساریی‌و قەرزدار بوونەوەت !! هەڵبەتە ئەم چاودێریی‌و ئاگا لەخۆ بوون‌و خۆپشکنینەش، تایبەت نیە بە کات‌و شوێنێکی تایبەتیی‌و دیاریکراوەوە، پێویستە هەر لە دەمی بێداربوونەوەوە، هەتا کاتی پێش نووستن، بەردەوام بێت‌و یەك تاو لەخۆی بێئاگا نەبێ، چونکە شەیتان‌و نەفس هەمیشە بۆ مرۆڤ لە بۆسەدان‌و، هەر چاوەڕێی هەل‌و دەرفەتێکن ! کە یان ئینسان دووچاری هەڵەو خراپەیەك، یان لەدەستدانی خێرو چاکەیەك بکەن.

**هەنگاوی سێیەم: سەرکۆنە کردن:**

ئنجا دوای ئەوەی هەر لە دەمی بێداربوونتەوە، هەتا کاتی هاتنە سەر جێگای خەوتن، بە وردیی‌و بێ پسانەوە چاودێریی خۆتت کردو، چاوو گوێ‌و زمان‌و زارو دڵ‌و مێشك‌و گەدەو دەست‌و لاق‌و باقی ئەندامەکانت، کردنە جێی سەرنج‌و تێوەڕامان‌و وردبوونەوەی خۆت، شەوێ، کە چوویە سەر جێگای نوستنێ، مەنوو، هەتا چاوێکی وردو قووڵ بە هەڵسوکەوتەکانی ئەو ڕۆژەتدا نەگێڕیەوە، ئنجا ئەگەر خێرو چاکەیەکت دی، سوپاسی خوای لەسەر بکەو سوور بزانە، کە بە یاریدەو پشتگیریی خوا کردووتەو، ئەگەر خوا نەکردە خراپەیەکیشت بەرچاو کەوت، ئەوە دەستبەجێ لێی ژیوان بەوەو بگەڕێوە بۆ لای خواو، داوای لێبووردنی لێ بکەو، سوور سوور بزانە، کە نەفست بە فەرمانی شەیتانی بەد، تووشی ئەو چۆرتمەی کردووی‌و بەو دەردەی بردووی، مادام وابێ، زۆر جێی خۆیەتی، کە دەست بکەی بە تانە لێدان‌و لۆمەو سەرکۆنەی نەفست.

**هەنگاوی چوارەم: لێپرسینەوە:**

پاش ئەوەی هەموو پێش خەوتنێك، لۆمەو سەرکۆنەی نەفسی خۆتت کرد، لەسەر هەڵەو تاوانەکانی، ئەگەر زانیت نەفست بەو سەرشکاندنەوەو خۆ لێ تووڕەکردن‌و سەرکۆنەکردنە، چاك بووەو ئەدەب‌و شەرمی پەیدا کردوە، ئەوە چاکە، ئەگەرنا لەگەڵی بگوازەوە بۆ هەنگاوی چوارەم‌و، بەین بەین هەر حەوتووی جارێك، دەست بکە بە

لـێپرسینەوەیەکی زۆر توندو وردی نەفستو، سـەرە دەرزییـانیشـی لەسـەر حیسـاب بکەو، یەك تۆز بەزەییت پێیـدا نەیەتەوە، چونکە ئـەو بەزەیـی بـەتۆدا نەهـاتۆتەوەو، ویسـتوویەتی لـە ڕێـی ئـەو تـاوانو خراپانـەوە، دووچـاری تـووڕەیی خـواو ئـازارو ئەشـکەنجـەی دنیـاو دوارۆژت بکـات !!

ئنجا ئەگەر لە ئەنجامی ئەو لـێپرسینەوەیەدا، هەستت کرد، کە نەفسـی خراپـەکارت شـایسـتەی سـزاو جـەزرەبەیە، ئەوە یەکسـەر لەگـەڵی بگوازەوە بۆ هەنگـاوی پێنجـەم.

**هەنگـاوی پێنجـەم: سـزادان :**

وەك گوتمان دوای لـێپرسـینەوەیەکی وردو قووڵ، ئەگـەر بـۆت دەرکـەوت نەفسـت شـایسـتەی سـزاو جەزرەبەیـەو حەوجێـی تەمبـێ کـردنێیـە، بـە بـێ سـڵەمینەوەو دوودڵـیی، بەرۆکی نەفست بگرەو زەبرێکی پڕ بە پێستی تێ بسـرەوێنەو، لـە خـەوی سـستیی‌و تەوەزەلـیی‌و قالب گرانیی وەخەبەری بێنـەو، ئـەو کـۆتو زنجیـرەی، کـە شەیتانی بەد خسـتوویەتە دەسـتو پێ‌و گەردنـییەوە، بـە شـمشـێری شـەرع، هـەلا هـەلای بکـەو بیپسـێنە.

هەڵبەتـە جـۆرو چـۆنیەتی‌و ئەنـدازەی ئـەو سـزادانەش، توێژینـەوەی دوورو درێـژ هـەڵدەگرێ، کە لـێرەدا مەودامان نیـە، بەڵام میانەڕەویی (وسـطية) ڕەچـاو کـردن لـە هـەموو شـتێکـدا، نیشـانە بە ئینسـان دەپێکـێ.

کـەواتە: هەر کـاتێك لەسـەر تـاوانو خراپـەو کـارێکی ناپەسـەند، ویسـتت سـزای نەفسـت بدەی، لە لایەکەوە زەبرێکی وای تێ بسـرەوێنە، کە ئێشـی پێ بگەیەنی‌و پێـی بگوترێ سزا، لە لایەکی دیکەوە، با ئازاردانو سزادانەکە بەجۆرێکـی هێنـدە سـەختو بێ ڕەزا نەبێ، کە بنەتۆوی خۆی نەکاتەوەو، زیـانی لـە قـازانجی پتـر بـێ[1].

---

(١) ) شایانی باسـە: مەرج نیە سـزادان هەر لێـدانو پێدادان بێت، بەڵکو هـەر شـتێك، کـە ببێتـە مایـەی تەمبێ کردنو سـەر شـکاندنەوەی نـەفس، سـزایە، وەك برسـیی‌و تینـووکردنو حەپسـکردن بـە هـۆی ئیعتیکـافەوە و...هتـد، دیارە خۆ بەستنەوەی (أبو لبـابة)ش بە کۆڵەکـەی مزگەوتـەوە، هـەتا پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـێی کردەوە، هەر لـەو بابەتـە بـووە، وەك لـە (السـيـرة النبويـة لابـن هشـام)دا هـاتوە، ج٣، ص١١٨،١١٧، ط٢٠٠٦/ دار ابن الهيثم.

ئەگەر بێتو ئەوەی لەو پەیمانە پێنج بەندییەدا خراپە ڕوو، لە گویّو دڵ بگریو ڕەفتاری پێ بکەی، ئەوە مسۆگەر بە پشتیوانیی خوا، خەسڵەتی بەرزو پەسەندو مەزنی (پارێزکاریی)ت تێدا پەیدا دەبێو، قۆناغی چوارەمیش هەڵدەبوێری، ئنجا پتر خۆت گشتو وشت بکەو، سەرت هەڵبڕەو بەرەو لووتکەی هەرە بەرزو پیرۆزی خواپەرستیی و مسوڵمانەتیی، کە پلەی ئیحسانە، بڕوانەو بیکە بە جێی خولیاو ئاواتی بەرزت.

ئێستاش با کۆتایی توێژینەوەی ئەم قۆناغی چوارەمە بەم کورتە باسە بهێنین :

**پەرێزی چاکەو خراپە لە ژیانی ئینسان دا:**

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، لەبارەی پەرێزی چاکەو خراپەوە، لە ژیانی ئینساندا گوتوویەتی: ((إِنَّ لِلْحَسَنَةِ ضِيَاءً فِي الْوَجْهِ، وَنُوراً فِي الْقَلْبِ، وَسَعَةً فِي الرِّزْقِ، وَقُوَّةً فِي الْبَدَنِ، وَمَحَبَّةً فِي قُلُوبِ الْخَلْقِ، وَإِنَّ لِلسَّيِّئَةِ سَوَادًا فِي الْوَجْهِ، وَظُلْمَةً فِي الْقَلْبِ، وَوَهَناً فِي الْبَدَنِ، وَنَقْصاً فِي الرِّزْقِ، وَبِغْضَةً فِي قُلُوبِ الْخَلْقِ))[(١)].

ئەم قسە بەپێزەی (ابن عباس)، کە بە ئاشکرا ڕووناکیی بنەماڵەی پێغەمبەرایەتیی پێوە دیارە، دە (١٠) یاسای گرنگی، دەربارەی تەئسیرو شوێنەواری چاکەکردنو خراپەکردنی لە ژیانی ئینساندا تێدان، پێنجیان پەیوەندییان بە بەرهەمی چاکی چاکەکردنەوە هەیە، کە ئەمانەن:

١- گەشییو درەوشانەوەی ڕوو، خواش فەرموویەتی: ﴿... سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ...﴾ (٢٩) الفتح.

---

(١) ئەم قسەیە (ابن قيم الجوزية) لە (الوابل الصيب ورافع الكلم الطيب)دا گێڕاویەتەوەو، لە گەلێك شوێنی دیکەشدا باسکراوە.
بڕوانە: الوابل الصَّيِّب، ص٦٧، ط١٤٢٥هـ، دار عالم الفوائد.
هەروەها (المُصَنَّف) لابن أبي شيبة (١٣/ ٥٠٠) و(الحلية) لأبي نعيم (٣/ ٣٠).

٢- ڕووناكیی دڵ، خواش فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ ... ﴿٢٢﴾﴾ الزمر.

٣- بەهێزیی جەستە، خواش لەسەر زمانی (هود) علیه السلام فەرموویەتی: ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾﴾ هود

٤- فراوانیی بژیوو ڕۆزیی، خواش فەرموویەتی: ﴿... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ ... ﴿٣﴾﴾ الطلاق.

٥- خۆشەویستیی لە دڵی خەڵكی مسوڵماندا، خواش فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾﴾ مريم.

پێنجیشیان باسی پەرێزی شوومی خراپەكردن دەكەن، كە ئەمانەن:

١- ڕەشیی و تەڵخیی دەموچاو، خواش فەرموویەتی: ﴿... فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ ... ﴿١٠٦﴾﴾ آل عمران.

٢- تاریكیی دڵ و دەروون، خواش فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾ البقرة.

٣- بێهێزیی لەش، خواش فەرموویەتی: ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ ... ﴿٤١﴾﴾ الروم.

٤- کەموکورتیی بژیو، خوای فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ... ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه.

٥- بوغزێنراویی لە دڵی خەڵکی - مسوڵمان - دا، خوای فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ البقرة.

## قۆناغی پێنجەم : ئیحسان و بەرز بوونەوە:

مسولْمانی سەنگین !

هەرکاتێك قۆناغی ڕابردووت بەتەواویی بڕیو، خەسڵەتی پارێزکاریی‌و وردبوونەوەت تێدا بوو بە بەشێکی دامەزراوو بنەڕەتیی، مانای وایە کەوتوویە سەر خەتی ڕاست‌و بەرەو ئامانج بەڕێ کەوتوویو، نزیکیش کەوتووی، بەڵام بەس بەوەندە قەناعەت مەکەو، خوا لوتفو بەزەیی‌و بەخششی زۆرو زەوەندەیەو بە کەمی واز مەهێنە: {دیارە ئاواتی گەورەشە، کە پیاوی گەورە دروست دەکات}، بەڵام ئاوات‌و مەبەستی بەرزیش، ڕەنج‌و خەباتێکی لەقەدەر خۆی دەوێ، چونکە: (إذا كانت الآمال كِباراً، تَعِبتْ في مُرادِها الأجسامُ) !!

ئنجا دوای ئەوەی لە ئەنجامی هەڵبواردنی چوار قۆناغی پێشوودا، گەیشتیە پلەو پایەی پارێزکاران (المتقين)، ئەگەر لەخۆت ڕادەبینی بەوەندە مەوەستە، بەردەوام بە لەسەر ڕێ بڕین، بەڵکو ئەوە خوایە، بە لوتفی خوا بتوانی خۆت بگەیەنیە پایەی ئیحسان‌و، بچیتە ریزی چاکەکاران (محسنين)ەوە!

ئنجا هەر هەمان ڕێگاو چۆنیەتی، کە (پارێزکاریی)ت پێ وەدەست هێنا، پلەو پایەی ئیحسانیشی پێ دەستگیر دەکرێ، ئەگەر خوا مەیلی لێبێ، بۆیە بەپێویستی نازانم چۆنیەتی گەیشتن بە پایەی ئیحسان (مقام الإحسان) بتوێژمەوە.

بەڵام وای بەچاك دەزانم، بڕێك چەمك‌و واتای (إحسان) ڕوون بکەمەوە:

(ئیحسان): لە ئەسڵی زماندا یانی: چاکەکاریی، بەڵام لە زاراوی شەرعدا، بە بڵندترین پایەی خواناسیی‌و، بەرزترین لووتکەی ڕێی بەرەو خوا چوون دەگوترێ.

بەڵێ ئیحسان ئەو حاڵەتە بەرزو پیرۆزەیە، کە هەر کاتێك مرۆڤ پێی گەیشت، هەموو ئەرکێکی ئیسلام بە چاکترین‌و ڕاستترین شێوە، ئەنجام دەدات، نوێژەکەی لەوپەڕی چاکیی‌و تەواوییدا دەبێ‌و، هەم لەلایەنی ڕواڵەتییەوە، وەك

قورئان خوێنـدنو ڕكـووعو كڕنووش بردنو تەحـيياتەكـەی، هـەم لە لایەنی دەروونييەوە، وەك گەردنـكـەچيیو خۆ بەكەم زانينو، خوا بە گـەورەو پـاك گـرتنو، بـە دڵ لـە خـواوە ڕامانو دڵ پڕبوون لـە شـەرمو ڕێـزی ..

جيهـادكردنەكـەشی بە تەواوترين شـێوە دەبێو، سەرو مـاڵی لەسـەر لـەپی دەسـتی دادەنێ، لەپێناوی بەرزكردنـەوەی نـاوی خـواو بووژاندنـەوەی بەرنامەكـەيدا، بێئـەوەی چـاوەڕێـی سـوپاسـكردنو چاكەدانەوەی هيچ كەسـێك بێـت، بێجگـە لـە خـوا..

هەروەها خووو ڕەوشـتو ڕۆژو زەكـاتو حـەجو زيكـرو، هـەموو شـتێكی ديكـەی، بەهەمـان شـێوە.

كـەواتە: ئيحسـانيش وەك تەقوا، هـەموو ئـەركو فەرمانـەكانی ئيسـلامو، گشـت نيازو وتەو كردارەكانی ئينسـانو، سەرلەبەری لايەنـەكانی ژيـانی دەگرێتـەوە، ئەوەنـدە هـەيە چەند جيـاوازيـيەكی ورد لەنێـوان تەقـواو ئيحسـانـدا بەدی دەكرێـن:

١/ تەقـوا خەسـڵەتێكە مرۆڤ لە خراپەو تاوانەكـان دەپارێزێو، بەرەو چاكەكـاريی هانی دەدات، بەڵام ئيحسـان خەسڵەتێكـە مرۆڤ لەو شێوە خواپەرسـتييە دەپارێـزێ، كـە شـێوەيەكـی چاكـتـر لـەوی هـەيە.

٢/ تـەقـوا بۆ ئەوەيە مرۆڤ لە دۆزەخـێ قوتـار بكاو بەرەو بەهەشـتێی تەيـار بكـات، بەڵام ئيحسـان دەبێتە هۆی ئەوەی لە زياتر پێهـەڵاچوونی پلە بەرزەكانی بەهەشـتێ دا، سـەرگەرمی پێشـبـڕكە (مسابقة) بێ !

٣/ بەكـورتيـی: تەقـوا پەرستنی خوايـە، بەڵام ئيحسـان چاك پەرستنی خوايـە، بـابـای پارێزكـار (مُتَّقي) هـەوڵ دەدات هـەموو دەمـێ لـەنێوان چاكەو خراپـەدا، چـاكە هەڵبـژێرێ، بـەڵام بابـای چاكەكـار (مُحْسِن) هـەوڵ دەدات لەنيـێوان چـاكـەو چـاكـتـردا، چاكـتـر هەڵـبژێـرێ.

بەڵـــێ خوێنــەری بەڕێــزم !

وەك گوتمان: ئیحســان لە هەموو شتێكدا هەیەو، وردو درشت دەگرێتەوە، بەڵام ئێمـە لێرەدا بە هێنانەوەی دوو دەقی قورئانو سوننەت، كە یەكێكـیـان پەیوەندیی بە نێــوان خـواو بەندەوەو، ئەوی دیكەشـیـان پەیـوەندیــی بــە هەڵســوكەوتی مرۆڤــەوە لەگـەڵ خەڵكـیدا هەیە، واز لە توێژینەوەی ئەم قۆنـاغە دێنیــن:

**یەكـەم**: پێغەمبەری سەروەرمان (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە چـۆنیەتی ئیحســـان - ئەوپەڕی چاكـیی - لە بڕوا بەخوا بوونو خواناسیی دا فەرموویــەتی: {الإِحْسَانُ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ}(١).

واتە: ئیحســان ئەوەیــە، بە شـێوەیەك خوا بپەرستی، كـە دەیبیــینی، ئەگـــەر تۆش ئەو نەبیــنی، ئەو دەتبــینێ !

بێگـومان ئەو حـاڵـەتەش هـەروا بە ئاسـانیی، بـۆ ئینســـان نایەتـەدیو زۆری پـێ دەوێ، تاكـو دەیگـــاتێ، بـەڵام مەحـاڵــیش نیـــەو، هەركەسێك بەڕاسـتیی هــەوڵی بۆ بـدات، بە لوتفـی خـوا پـێـی دەبەخشـرێ.

**دووەم**: خـــوای بەخشـــــەرمان فەرموویـــــەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ آل عمران.

واتە: ئەوانەی لە فەرحــانییو تەنگانــەدا — ماڵــیان — دەبەخشـــن و، ڕقـی خـۆ قــوتـدەرەوانو، لە خەڵـكی بوردووان و، خواش چـاكـەكـارانی خۆشـدەوێن.

بەڵـێ، ماڵ بەخشـین لـەكـاتی دەوڵەمەندییو خۆشییو هەرزانییو فەرحانییـــدا، زۆر كەس لەدەستیـان دێ، بەڵام هەموو كەس ناتوانێ لەكـاتی تەنگـەدەسـتییو نـەبوونییو شپرزەییـدا، پاروو لە زاری خۆیو خێزانی بگرێتـەوەو، لەڕێـی خـوادا بیبـەخشـێ !

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٠٢)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٦٤)، وَابْـنُ خُزَيْمَة برقم: (٢٢٤٤)، وَغَيْرُهُم عَن عُمَر بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

کەسانێکیش هەن، کە بتوانن لە دەمی تووڕەییی و ڕق هەستاندا بەسەر خۆیاندا زاڵ بن و، ئاگری تووڕەیی خۆیان کپ بکەن، بەڵام بەدەگمەن هەڵدەکەوێ و زۆر کەمن ئەوانەی، کە سەرەڕای ڕقی خۆ قووتدانەوەو، خۆ مەرزەم کردن و تۆڵە نەستاندنەوە، هەستن دەست لە ملی بابای تاوانباریش بکەن و لێشی ببوورن و، داوای لێبوردنیشی بۆ لە خوا بکەن[1]!!

ئنجا لە کۆتاییدا تێبینییەکی گرنگ ماوە دەبێ بگوترێ:

کەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان پارووێك لە زاری خۆی و خێزانی بگرێتەوەو ببیبەخشێ، یان جارێك لە جاران بەخۆی بوێرێ و تاقەتی بە نەفسی بشکێ و، ڕق و قینی خۆی قووت بداتەوەو لە بابای خراپەکاریش ببوورێ، ناگونجێ، کە گومانی ئەوەی پێ ببرێ، کە گەیوەتە پایەی ئیحسان، چونکە گەیشتنە پایەی ناوبراو، بەوە دەبێ، کە ئەو جۆرە خەسڵەت و هەڵوێستانەی تێدا دابمەزرێن و، بۆی ببنە ئاکار(مَلَكَة)و عادەت.

ئنجا هاوبڕوای خۆشەویستم !

وەك پێشتر گوتمان پلەو پایەی ئیحسان، چڵە پۆپەو لووتکەی هەرە بڵندی مسوڵمانەتییەو، لەدوای وی پلەیەکی دیکە نیە، کە خۆتی بۆ بکوتی، ئەوەندە هەیە هەرکام لە پارێزکاریی (تقوی)و چاکەکاریی (ئیحسان) لە زاتی خۆیاندا، لە چەندان پلە پێکدێن و، ئینسان هەتا لە پایەی ئیحساندا پتر ڕۆبچێ، زیاتر بەرەو پلە بڵندەکان بەرز دەبێتەوە.

---

(١) دەگێڕنەوە جارێکی کابرایەك جنێوو قسەی ناشیرین بە یەکێك لە خواناسانی پایە بڵند دەدات، ئەویش ڕادەوەستێ هەتا جنێوەکانی تەواو دەکات، پاشان پێی دەڵێ: کاکە گیان! ئەگەر ڕاست بکەی، خوا لەمن ببوورێ، ئەگەر درۆش بکەی خوا لەتۆ ببوورێ!

هەروەها جارێکی دیکە کابرایەك قسەی خراپی بە خواناسێك گوتن، ئەویش پێی گوت: برای خۆم! ئەگەر من دۆزەخیی بم، شیاوی لەوەش خراپترم، کە تۆ گوتت، بەڵام ئەگەر بەهەشتیی بم، قسەکانی تۆ زیانێکم لێ نادەن، بڕۆ خوات لەگەڵ!

تێبینیی: هەڵبەتە ئەم ڕەوشتە بەرزە لەگەڵ مسوڵمانانداا ڕەفتاری پێ دەکرێ، بەڵام لەگەڵ دوژمن و ناحەزاندا، بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا، ئەوە یاسای: ﴿... فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ... ﴿١٩٤﴾﴾ البقرة، و ﴿... وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ... ﴿١٢٣﴾﴾ التوبة، دێنە پێش، گوتراویشە: (لكل مقام مقال)، هەروەها گوتراوە: (هەر کام لە: کەنگر و ماست بە وەختی خۆی).

## قۆناغی شەشەم: دەوام و ساردنەبوونەوە (الإستقامة)

مسولْمانی سەنگین و شیرین !

لە قۆناغی پێنجەمدا گوتمان، پایەی ئیحسان مەنزڵگای کۆتایی سەفەری بەرەو خوا چوونەو، لەدوای وی قۆناغێکی دیکە نیە، کە خواناسان لە دنیادا هەوڵی بۆ بدەن، بەلاّم ئێمە بۆیە (دەوامو ساردنەبوونەوە)مان کردە قۆناغی کۆتایی و شەشەمی سەفەری بەرەو خوا چوون (السير إلى الله)، چونکە هیچ شتێك بەبێ پشوو درێژیی‌و بەردەوامیی‌و، ساردنەبوونەوە، نایەتە دی.

بەڵێ ئینسان بە کۆڵنەدانو پاشەکشە نەکردنو ساردنەبوونەوەو، پشوو درێژیی‌و خۆ ڕاگریی‌و بەردەوامیی، لە هەر شتێکدا، کە هەوڵی بۆ دەدات بەمراد دەگاتو، بێ ئەوە هیچی بۆ ناکرێ‌و، درەختی هەوڵی بەرناگرێ !

هەربۆیەش خوای زانا، لە زۆر جێی قورئانێدا مەدحی ئەوانەی کردوە، کە خۆڕاگر (صابر)و خاوەنی بەردەوامیی (إستقامة)ن، بۆ وێنە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ...﴿٣١﴾﴾ فصلت.

واتە: بێگومان ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان خوایە، خۆڕاگرو بەردەوامیش دەبن، فریشتەکان دێنە سەریان - پێیان دەڵێن: - کە مەترسنو دڵتەنگ مەبن و، مژدەتان لێبێ بەو بەهەشتەی، کە بەڵێنتان پێدرابوو، ئێمە لە ژیانی دنیاو لە دوارۆژدا دۆستتانین.

خوا لە چەند شوێنێکدا فەرمانی بە پێغەمبەرمان کردوە، کە پایەدارو بەردەوام بێ، بۆ وێنە: ﴿فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ...﴿١١٢﴾﴾ هود.

واتە: ئنجا وەك فەرمانت پێکراوە بەردەوام بە.

پێغەمبەری زانای خۆ ڕاگریشمان (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {أَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلَى اللّٰهِ تَعَالَى أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ}[1].

واتە: خۆشەویستترین کردەوە لەلای خوای بەرز، بەردەوام ترینیەتی، هەرچەندە کەمیش بێ.

ئنجا مسوڵمانی شیرین و سەنگین!

هەتا دەتوانی خۆڕاگرو پشوو درێژو بەردەوام بەو، پەند وەربگرە لە:

١/ ئەو دڵۆپە ئاوە نەسرەوتووەی، کە شەوو ڕۆژ چکە چکێیەتیو، لە ئەنجامدا بەردی ڕەق قووڵ دەکات!

٢/ ئەو دەنکە بارانە وردیلانەی، کە سەدان ڕووبارو دەریای زل زل پێکدێنن و لافاوی وا هەڵدەستێنن، شارو دێهات وەبەر خۆ دەدات!

٣/ ئەو مێروولانەی، کە بە هۆی ئیشو چالاکیی بەردەوامو نەپساوەوە، عەمباری گەورە گەورەی دانەوێڵە دروست دەکەنو، وەسەرێك دەنێنو، بۆ کاتی پێویست پەزمەندەی دەکەن!

٤/ ئەو مێشەنگوینە چالاكو گورجو گۆڵانەی، کە بەو زارو چەنگۆڵە گچکانەی خۆیان، چەندان شانە هەنگوین لە شیلەی سەدان گوڵو گیای جۆراو جۆر دروست دەکەن!!

عەرەبیش گوتوویانە: (مَنْ صَبَرَ ظَفَر)، و (مَنْ جدَّ وَجَدَ)، و (مَنْ لَجَّ وَلِجَ).

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٨٦٦)، عَنْ عَائِشَةَ رَضيَ الله عَنْهَا.

## سێ ڕوونکردنەوەی پێویست
## دەربارەی
## قۆناغەکانی ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون

**یەکەم**: قۆناغەکانی ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، هەر ئەم شەشە نین، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە، کە زاناو شارەزایانی پەروەردەو عیرفانو تەصەووف، لەنێو خۆیاندا دەربارەی پلەو قۆناغەکانی ڕێگای ناوبراو لەسەر ژمارەیەکی دیارییکراو ڕێك نەکەوتوونو[1]، لە چۆنیەتی ڕیزکردنو ژمارەی قۆناغو مەنزڵەکانی چاك بوونو بەرەو خوا چووندا، بیروڕای جیاجیایان هەن، کە لە نێوەڕۆکدا یەك دەگرنەوە، منیش پاش وردبوونەوەو تێوە ڕامانی زۆرو، بە تەجرەبەی کردەیی خۆشم، بۆم دەرکەوت، کە هەموو پلەو قۆناغەکانی ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، لەم شەش قۆناغەدا کورت دەبنەوە، ئنجا بۆ ئاسانکردنی لێ حاڵیبوونی مەبەستو زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە، ڕێگای ناوبراوم دابەش کرد بۆ شەش قۆناغی گۆرین، واتە (تۆبەکردنو پاکبوونەوە، زانیارییو چاو ڕوونبوونەوە، ئیخلاصو یەکلابوونەوە، پارێزکارییو وردبوونەوە، ئیحسانو بەرزبوونەوە، دەوامو ساردنەبوونەوە) کە لەڕاستییدا هەموو پلەو قۆناغەکانی دیکەی ئەو ڕێگا بەرزو پیرۆزە، لەنێو خۆیان دەگرن.

---

(١) (ابن قيم الجوزية) ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە چاکترینو وەفادارترین قوتابی مامۆستای زاناو خواناسو شۆڕشگێڕ (إبن تيمية)یە، لە کتێبی (مدارج السالكين شرح منازل السائرين)دا، کە بە بڕوای من پوختترین کتێبی (تصوف)ی ڕاستەقینەی پابەند بە قورئانو سوننەتە، لەوبارەوە گوتوویەتی: (( وقد تحدث أكثر الناس في صفة المنازل وعددها، فمنهم من جعلها ألفا، ومنهم من جعلها مائةً، ومنهم مَنْ زاد ونقص، فكل وصفها بحسب سيره وسلوكه...))، بڕوانە: (مدارج السالكين، ب: (١)، ل: (١٢٢))، واتە: خەڵکی دەربارەی چۆنیەتیو ژمارەی قۆناغەکانی ئەو سەفەرە زۆر دواون، هەیانە کردوونی بە هەزارو، هەشیانە کردوونی بە سەدو، هەشیانە زیاترو کەمتری کردوونو، هەرکەسە بەگوێرەی ئەزموونی سەیرو سولووکی خۆی سەرژمێریی کردوون.

**دووەم:** حیكمەتو هۆی ڕیزكرانی ئەو شەش قۆناغە، كە شەش قۆناغی سەرەكییو بنەڕەتیی ڕێگای چاكبوونو بەرەو خوا چوونن، بەم شێوەیەی، كە لەم كتێبەدا دەبینرێ، ئەوەیە، كە ئینسانی مسولمانو ڕێبواری ڕێی بەخۆداهاتنەوەو بەرەو خوا گەڕانەوە، دوای ئەوەی بە لوتفو بەزەیی خوا، لە خەوی شوومی لاڕێبوونو، لەخوا دووربوون، بێدار دەبێتەوە، دەروونو ویژدانی پالّی پێوە دەنێو هانی دەدات، كە بەرەو خوا بگەڕێتەوەو بەخۆیدا بێتەوە، بەلاّم، كە تەماشا دەكات بە پێلاّوی پیسی تاوانو خراپەو بێ ئاگاییەوە، ڕێگای نادرێ بچێتە نێو میحرابی خواپەرستییو بەرەو خوا چوونەوە، بڕیار دەدات، كە بە ئاوی پەشێمانییو گەڕانەوەیەكی ڕاستو ساغ، پاك پاك خۆی بشوات، بەم شێوەیە، یەكەمین پلەو قۆناغی ڕێگای خۆ چاككردنو بەرەو خوا سەفەركردن، هەلّدەبوێرێ، كە (تـوبـة)یە.

ئنجا دوایی، كە خۆی پاك دەكاتەوەو، بۆ وەڕێ كەوتن خۆی ساز دەكات، تەماشا دەكات ڕێگای ناوبراو ڕێیەكی سەختو دوژوارو پڕ كەندو لەندو هەورازو نشێوەو، دەیان جۆرە جەردەو ڕێگری لەسەر دانیشتوونو، خۆیان تێدا لە بۆسە ناوە، بۆیە سەرەنجام دەگاتە ئەو قەناعەتەی، كە پێویستە بەرلەوەی وەڕێ بكەوێ، قۆناغی (زانیارییو چاو ڕوونبوونەوە)ش ببڕێ، نەك كوێرانە ملی ڕێیە بگرێو بە پێخواسیی وەنێو بكەوێو، بەسەر بۆسان دابكەوێ، یان لە زەندۆلاّن* بكەوێ !

ئنجا دوای ئەوەی تاڕادەیەك دەربارەی ڕێگای گۆڕین شارەزا دەبێ، جارێكی دیكە هەلّوەستەیەك دەكاتو، چاوێك بە دەروونی خۆیدا دەگێڕێتەوەو، ڕووی دلّی لەگەلّ قیبلەی (بەس خوا پێ مەبەست بوون)دا ڕاست دەكاتو، بە قۆناغی (ئیخلاصو یەكلابوونەوە)شدا تێدەپەڕێ، ئنجا پاش تەواوكردنی پلەو قۆناغەكانی (پەشێمانبوونەوەو، چاو ڕوونبوونەوەو، یەكلابوونەوە)، كە هەرسێكیان وەك كۆشكی بەرزی بەرەو خوا چوون وان، بێجگە لە دیوار دانان چیدی نامێنێ، ئیدی

---

*) زەندۆلاّن كۆی (زەندۆلّ)ە، كە بە مانای شیوو دۆلّی قوولّی نێوان دوو چیا یان دوو كەندو گرد، دێ.

ئەوجـار بـابای ڕێبـوار لـە گەرمـەی بڕینـی قۆنـاغی درێـژو گرنگـی (پارێزکـاریی‌و وردبوونەوە)دا دەسـتـبەکـار دەبـێ.

ئنجـا پاش پێ ڕۆچوون (رسوخ القدم)یش بە قۆناغی ناوبراودا، ڕێبوار (سـالك)ی ڕێـی صالّح بوون‌و بـەرەو خواچـوون، جگـە لـە بەرزبوونـەوەو پێهـەڵاچـوون، بـە پەیـژەی قۆنـاغی (ئیحسان‌و بەرزبوونەوە)دا، هیچ کـارێکـی دیکـەی نـامێنـێ.

ئنجا دوای ئەوەی ئینسـان کەوتە نێو قۆنـاغی پلـەی (ئیحســان)ەوە، کـە بـەرزترین پلـەی خواناسین‌و دوایین قۆناغ‌و مەنزڵـی صالّح بوون‌و بەرەو خوا چوونە، هەر ئەوەندە دەمێنێ، کە دەست بگەیەنێتە پلەو قۆناغی (دەوام‌و ساردنەبوونەوە)و لەسـەر بـڕین‌و تـەواوکردنی ئـەو ڕێگـا بـەرزو پیـرۆزە، پشـوو درێـژو بـەردەوام بـێ‌و بـەرەو دوا نەگەڕێتەوە، هەتا بە کەرەمی خـوا لـەنێـو ڕەزامەندیی‌و بەهەشتی ڕازاوەو نـەبڕاوەی خوادا خۆی دەبینێـتەوە، وەك خوای بەخشـەر بە پێغەمبـەری خـۆی فەرمـووە: ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر.

**سێیەم**: مەبەست لە بڕین‌و هەڵبواردنی ئەو شەش قۆناغەو، هەموو قۆناغەکـانی دیکەی ڕێگـای بەرەو خوا چوون (طريق السيـر إلـى الله)دا، بەجێـهێشـتنی ئەو قۆنـاغـانە نیە، بۆ وێنە: کە دەڵێین: بابای ڕێبوار قۆناغی تۆبەکردن‌و پاکـبوونەوەی، تەواو کـرد، مەبەست ئەوە نیە، کە قۆنـاغی ناوبراوی بڕیوەو بەجێـی هێشـتوەو لـێی تێپـەڕیوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە لـەو قۆناغەدا، زەقتـرین‌و بەرچاوترین حـاڵەتی بابـای ڕێبـوار، تۆبەکردن‌و داوای لـێبوردن‌و پەشـێمانبوونەوەو خـۆ پاکـکردنەوەیە، دەنـا قۆناغی نـاوبراو وەك حاڵـەتێکی دەروونیـی‌و خەسـڵەتێکی بنچـینەیی، لـە هـەموو قۆناغەکانی دیکەشـدا هەر بەردەوامـە، هـەروەها قۆناغـەکانی دیکـەش بەهـەمان شـێوە، چونکە ئەگەر وانەبێ، دەبێ بڵـێیـن: ئەو ئینسـانەی، کـە دەچـێتە قۆنـاغی (زانیاریی‌و چاو ڕوونـبوونەوە)وە، دەبێ حاڵـەتی گـەڕاوەیی (تائب)ی نەمـابێ‌و، ئـەو

کەسەی لە قۆناغی (ئیخلاص و یەکلابوونەوە) دایە، دەبێ خەسڵەتی زانایی چاو ڕوونیی نەمابێ و، ئەوەی، کە لە قۆناغی (پارێزکاریی) دایە، دەبێ حاڵەتی ئیخلاصی فەوتابێ !!

دیارە ئەمەش شتێکی مەحاڵەو پێچەوانەی واقیعیشە، کەواتە وەك گوتمان مەبەست لە بڕینی ئەو پلەو قۆناغانە، بەجێهێشتن و واز لێهێنانیان نیەو، مەبەست ئەوەیە کە پێشتر ڕوونمان کردەوە[١].




(١) لە کتێبی (یادی خوا)دا، کە ساڵی (١٩٨٧) نووسیومە، ئەو مەسەلەیە بە درێژیی توێژراوەتەوە.

# بەشـی سـێیەم

## توێشـووی ڕێگـا..
## بەچی صـاڵح دەبین‌و
## چۆن بەرەو خوای بەرزو بێ وێنە دەچین؟!

خوێنەرە خۆشەویستەکانم !

دوای ئەوەی لە بەشی یەکەمدا بۆمان ڕوون بۆوە، کە تەزکیەی نەفس چییەو چۆنە؟ لە بەشی دووەمیشدا حاڵی بووین، کە قۆناغو مەنزڵگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، چیو چین ؟

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە، کە لەم بەشی سێیەمەدا، تیشك بخەینە سەر ئەو هۆکارو ئامرازانەی، کە سەرجەم قۆناغو مەنزڵەکانی ئەو سەفەرە موبارەکەیان پێ دەبڕدرێنو، هەردووك مەبەستی بەرزو پیرۆزی: صاڵحو شایستە بوونو، بە ڕەزامەندییو دیداری خوا شادبوونیان، پێ دەستگیر دەکرێن.

ئنجا ئێمە خوای بەخشندەو بەخشەر پشتیوان بێ، لەم بەشی سێیەمەدا لە هەشت تەوەردا تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتەو، سەرجەم ئەو هۆکارە سەرەکییانە، بە کورتیی دەتوێژینەوەو ڕوون دەکەینەوە.

شایانی باسیشە: سەرجەم ئەو هۆکارانە لە دوو توێی پارێزکاریی (تقوی)دا خۆیان دەبیننەوەو، تەقواش خوای زاناو پەنهان بین، هەم بە چاکترین توێشووو، هەم بە باشترین بەرگو پۆشاکی ناوبردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿... وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ... ﴿١٩٧﴾﴾ البَقَرَة.

واتە: پۆشاکی تەقوا بپۆشن، بێگومان ئەوە چاکترە!

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿... وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ... ﴿٢٦﴾﴾ الأَعْرَاف.

واتە: پۆشاکی تەقوا، ئەوە باشترە.

دەجا ئاشکرایە، کە بابای ڕێبوار لە هەموو شتێك زیاتر ئاتاجی ئەم دووانەیە: توێشوو (زاد)، پۆشاك (لباس).

کە بە هۆی یەکەمیانەوە، لە مەترسییە زاتییەکانی وەك برسیەتیی و تینوێتیی و بڕست لێ بڕان، دەپارێزریّ و، بەهۆی دووەمیشیانەوە، لە مەترسییە دەرەکییەکانی وەك سەرماو سۆڵەو گەرماو گەزندەو دڕندەکان، چەپاڵە دەدریّ.

خوای کاربەجیّ، پارێزکاریی (تقوی)ی بەچاکترین توێشووو، باشترین پۆشاکی سەفەری ڕێی بەرەو خوا چوون داناوە !

ئێمەش خوا یاریێ لەم بەشەدا، کە بەشێکی زۆر گرنگی ئەم کتێبەیە، لە هەشت تەوەردا، پەنجاو دوو (٥٢) هۆکاری گرنگو گەورە دەنووسین، کە توێشووی ڕێبوارانی ڕێی بەرەو خوا چوون پێکدێنن و، لە بازنەی فراوانی پارێزکارییدا خۆیان دەبیننەوە، هەرچەندە هەندێك لە هۆکارەکان جۆرێك لە دووبارەبوونەوەو وێکچوونیان لە نێواندا هەیەو، هەر لە بەراییشەوە ڕایدەگەیەنین، کە ئیددیعای ئەوە ناکەین سەرجەم هۆکارو ئامرازەکانی تەزکیەکردنی نەفسمان کۆکردوونەوە، بەڵام پێم وایە ئەمانە سەرەکییەکانیانن.



## تەوەری یەکەم:

### ڕاستکردنەوەو پتەوکردنی ئیمان و عەقیدە، گەورەترین هۆکاری تەزکیەی نەفسە:

بەڵێ خوێنەری خۆشەویستم !

گەورەترین و کاریگەرترین هۆکاری تەزکیەبوونی نەفس، بگرە بناغەو سەرچاوەی تەزکیەی نەفس و صاڵحبوونی ئینسان و لە خوا نزیککەوتنەوەی، بریتیە لە ڕاستکردنەوە (تصحیح)ی ئیمان و عەقیدەو پتەوکردن و بەهێزو پێزکردنی، چونکە بێگومان، وەك چۆن کوفر بە هەموو جۆرو شێوەکانیەوە، کانگای خەسڵەتە پەستەکان (معدن الرذائل)ە، ئیمانیش سەرچاوەو چاوگی خەسڵەتە بەرزو پەسندەکان (مصدر الفضائل)ە.

هەربۆیەش دەبینین خوای کاربەجێ لە قورئانی مەککەیی دا، کە ڕێژەی زیاتر لە دوو لەسەر سێی(٣/٢)ی سەرجەم قورئان پێکدێنێ، بانگی ئینسان دەکات بۆ خواناسین و ئیمان هێنان، چونکە ئیمان بە هەموو پلەو بەشەکانیەوە، گەورەترین و سەرەکییترین چاکەیەو، لەپێش هەموو خەسڵەتێکی بەرزو پەسەندەوەیەو، کەسێك ئیمانی نەهێنابێ، ناگونجێ بۆ هیچ شتێکی دیکە بانگ بکرێ‌و، هیچ خێرێکی لێ چاوەڕوان بکرێ ! ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ٨ ﴾ الإنفطار.

پاشان لە قورئانی مەدینەییدا، کە زیاتر باسی بنیاتنانی کۆمەڵگاو دەوڵەت‌و یاساو دەستوورەکانی ڕێکخستنیان دەکات، هەمیشە بەر لە خستنەڕووی هەر فەرمان‌و قەدەغەکردن (أمر و نهي)یێك، خوای کاربەجێ بە صیغەی ((ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە)) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ... ﴾، مسوڵمان دەدوێنێ‌و، هەستی

ئیمانو عەقیدەیان دەجوولێنێ، ئەوجار حەلاڵو حەرامو چاکەو خراپەکانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ ... ﴿١٨٣﴾ ﴾ البقرة.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ المائدة.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الصف.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ ... ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة.

بۆیە پێویستە هەر کەموکووڕیی‌و ناتەواوییەك لە هەر کەسێکدا بەدی بکەین، بۆ ڕەگو ڕیشەو هۆی پەیدابوونی لە عەقیدەو بیروباوەڕەکەیدا، بۆی بگەڕێینو بەملاولادا نەچین، چونکە مەگەر چۆن، دەنا خوارییو لاریی دیوار، لە سۆنگەی لاریی بناغەوەیەو، لێڵیی جۆگاش، بەرهەمی لێڵیی سەرچاوەیە !!

کەواتە: براو خوشکە مسوڵمانەکانم !

با چاوگێڕانەوەتان بە ئیمانو عەقیدەتانو، پشکنینیو تێوەڕامانی، بۆ دۆزینەوەی هەر ناتەواوییو کەموکووڕییەك تێیدا، لە خەسڵەتو نیشانە وردو درشتەکانی، کوفرو شیركو نیفاق، بناغەو بنەڕەتی تەزکیەتانو یەکەمینو سەرەکییترین هۆکاری سەفەری بەرەو خوا چوونتان بێو، بۆ وەدەستهێنانی سەرجەم خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانو، قوتاربوون لە تێکڕای خووو خدە پەستو خراپەکان، لە سەرچاوەو کانگایانەوە دەست پێبکەینو، بەبێ ڕاستکردنەوەی بناغە، بێهوودە، خۆتان بەڕاستکردنەوەی دەرو دیوارەوە ماندوو مەکەنو، هەتا سەرچاوە ڕوون نەکەنەوە، بە ڕوونکردنەوەی ئاوی جۆگاو، نەهێشتنی لێڵاییەکەیەوە، خۆتان ڕەنج بەخەسار مەکەن.

دیاره چۆنیەتی ئەو ڕاستکردنەوەو پالاوتنو بژارکردنو پتەوو بەهێزکردنی ئیمانو عەقیدەش، هەر ئەوەیە، کە لەبەر تیشکی قورئانو سوننەتداو، بە تێگەیشتنی زاناو پێشەوایانی پێشینمان، سەرنجی سەرجەم پایەو بەشەکانی عەقیدەو بابەتو مەسەلەکانیان بدەینو، هەر هەڵەو کەموکورییەکمان بینی، دەستبەجێ ئیمانو عەقیدەمانی لێ پاك بکەینەوەو بژاری بکەین و، هەر کەلێنو ناتەواوییەکمان بینی، پڕی بکەینەوەو تەواوی بکەین، ئاشکراشە، کە زانین، ئەگەر نەگۆڕێ بۆ توانینو، حاڵیی بوون، ئەگەر نەبێتە حاڵو، لە عەقڵو هۆشەوە نەگوازرێنەوە، بۆ دڵو دەروون، هیچ بە هیچ ناکرێ.

ئێستاش با کۆتایی ئەم باسە، بە سەرنجدانی ئەم هەژدە ئایەتەی سوورەتی (الإسراء) بێنین:

﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ
إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ
أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ
ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن
تَكُونُوا۟ صَـٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ
وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ
ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ
قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ
مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا
بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ

خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُوا۟
ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا
يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ
حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ
وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ
إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ
إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ
مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى
جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی دیکە دامەنێ، ئەگەرنا بە ڕیسوایی‌و بێ پشت‌و پەنایی دادەمێنی و، پەروەردگارت فەرمانی کردوە، کە جگە لەوی نەپەرستن و، لەگەڵ باب‌و دایکاندا چاکە بکەن، ئنجا هەر کاتێك لە لات بوون‌و یەکێکیان، یان هەردووکیان بە ساڵ داچوون، هیچ وشەیەکی ئازاردەریان پێ مەڵێ و، تێیانەوە مەخوڕەو هەمیشە قسەی بەڕێزیان لەگەڵ بکەو، لە ڕووی بەزەییەوە باڵی ملکەچییان بۆ شۆڕ بکەو، بڵێ پەروەردگارم! وەك چۆن بەگچکەیی بەخێویان کردم، بەزەییت پێیان دابێتەوە. بێگومان پەروەردگارتان لەخۆتان زاناترە بەوەی لە دەروونتاندا هەیەو، ئەگەر صالح‌و چاك بن (لەگەڵ باب‌و دایکتان)دا ئەوە - خوا - بۆ تۆبەکاران زۆر لێبوردەیەو، - لە ماڵ‌و سامانت - مافی خۆیان بە خزمان‌و نەداران‌و ڕێبواران ببەخشە، بەڵام دەستبڵاویی مەکە. چونکە دەستبڵاوان برای شەیطانەکانن‌و، شەیطانیش سەبارەت بە پەروەردگاری ناسوپاس‌و سپڵە بوو، ئەگەر -

ئەو کاتەی داوایان لـێکردی بەدەستەوە نەبوو- بە ناچاریی ڕووت لـێ وەرچەرخـاندنو، بە هیـوای بەزەیـیو چاکـەی خوا بووی - کە شتێکـت بێتە دەست - ئـەوە قسـەیەکی ئاسانیان لەگەڵ بکە - و گـفتیان پێ بدە -و - وریـابە لە دەستگرتنـەوەو بەخشـیندا — نە دەست بەتەواویی بقـووچێنەو بە ملـتیەوە بنووسـێنەو، نـە زۆریـش بـڵاوی بکـە، ئەگـەر نا، بە سەرکۆنەکراوییو داماویی سـەردەنێیەوە. بێگـومان پەروەردگـارت بـۆ هەرکەسێك، کە بیەوێ ڕۆزیی زۆرو کـەم دەکـات، چـونکە ئـەو زۆر شـارەزاو بینـەری بەندەکانیەتی، لەترسی هـەژارییش، منداڵەکـانتان مەکـوژن، ئێمە بژیوی ئەوانو ئێوەش دەدەین، بەتەئکیـد کوشـتنیان تـاوانێکی زلـە، تـوخنی زینـاش مەکـەون، چـونکە زۆر ناقۆڵایەو خراپتـرین ڕێیە، بەحەقی خۆیشی نەبێ، ئەو نەفسـە کە خوا قەدەغەی کـردوە، مەیکـوژن. کـەسێکیـش بـە ستەمـلـێکراویی بکـوژرێ، ئـەوە ئێمـە دەسـەڵاتی (تۆڵـە)مان داوە بە کەسـوکـاریو بـا زێـدەڕۆیی لـە کوشـتنەوەدا نـەکات، چـونکە — لەلایـەن شەرعەوە — پشـتگیـریی کراوە. مەگەر بە چاکتـرین شێوەش، ئەگەرنا تـوخنی ماڵی هەتیـو مەکەون، هەتا باڵـغ دەبـێو پێدەگـاتو، بەڵـێنو پـەیمان بـەجێ بێـنن، چونکە پەیمان لێپرسینەوەی لەسەرە، هـەر کـاتێك شـتێکـتان پێواش، بەتـەواوی بیپێـون و، بە تەرازووی ڕاست شت بکـێشـن، ئەوە چاکتـرەو سەرەنجـامی خێرترە. بەدوای شتێك مەکەوە کـە زانیارییت دەربارەی نیە، چونکە بێگومان هـەر کـام لـە بیسـتنو دیتـنو عەقـڵ، لـێیان دەپرسرێتەوە. بە فیزو کەشخەش بە زەوییدا مەڕۆ، چونکە بێگومـان، نـە زەوییت بۆ هەڵدەدڕێو نە هێندەی شاخانیش بەرزی! هەرکـام لـەو شـتانەی باسـکران، خراپەکـانیان لەلای خوا ناپەسەندن. ئەوەش لـەو حیکمەتەیـە، کـە پەروەردگـارت بـۆی نـاردووی و، هـیچ پەرستـراوێك ڕەگـەڵ خـوا مەخـە، دەنـا بـە سەرزەنشـتـکراوییو تێکشـکاویی دەخرێیە نێو دۆزەخەوە. الاسراء: ٢٢- ٣٩.

ئنجا ئێستا با سەرنج بدەین:

خودای كاربەجێ لەو هەژدە(١٨) ئایەتەدا دوازدە(١٢) فەرمان(أمر)و دوازدە(١٢) نەهێشتن (نهي)ی، ئاڕاستەی ئینسان كردوون، واتە: سەرجەم بیست و چوار(٢٤) خەسڵەت و ئاكار، كە زۆربەی هەرەزۆری بوارو لایەنەكانی ژیانو گوزەران، بە تاكییو خێزانییو كۆمەڵایەتییو ماددییو مەعنەوییەوە، دەگرنەوە، بەڵام هەم لەسەرەتای ئەو ئەمرو نەهییانەوە، هەم لە كۆتاییانەوە فەرمانی پێكردوە، بە ئیمانو خوا بەیەكگرتن (توحید)! بەڵێ فەرمانی پێكردوە، بەوە كە تەنیاو تەنیا، خوا بە پەرستراوی خۆی دابنێو، هیچ شتێكی دیكە نەكاتە هاوبەشی لە پەرستراندا: ﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾ الإسراء، و ﴿ ... وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾ الإسراء. ئنجا جێی سەرنجیشە، كە لە ئایەتی یەكەمدا، ئاكامو سەرەنجامی شوومی هاوبەش پەرستیی بە: ﴿ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴾ باسكردوە، بەڵام لە ئایەتی دواییدا بە: ﴿ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴾، سەرەنجامی ڕۆژی دوایی، واش پێدەچێ، نهێنییو حیكمەتەكە ئەوەبێ، كە مەبەست لە ئایەتی یەكەمیان، سزاو سەرەنجامی شیرك بێت لە ژیانی دنیادا، كە خاوەنەكەی دووچاری ڕیسواییو شەرمەزارییو، بێ كەسییو بێ نەوایی دەبێو، بە ئایەتی دوایشیان، ئاكامو ئەنجامی دوارۆژ لەبەرچاو گیرابێ، كە بابای هاوبەش بۆ خوا دانەرو، سەر بۆ بتو صەنەم دانەوێنەر، بە سووكییو بێ قیمەتییەوە، فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوەو، مۆری سەرزەنشتكراویی و تێكشكاویشیی بە نێوچاوانەوە دەنرێ!

کـەواتـە:

بەڵـێ ڕاستە ئیمانو خوا بەیەکگرتنو بەس خوا پەرستیی، بناغەی تەزکیەی نـەفسو چـاوگی هەموو پـاکییو چـاکـییەکە، بە پێچەوانەشەوە کوفـرو هـاوبەش بۆ خوا دانان، بنکی تاوانو خراپەو کـانگای سەرجەم خووو خدەو خەسـڵـەتە پیسو بەدەکـانە[١].

(١) تێبینی: بـە ڕای من زنجیـرە دەرسـەکانی: (ئیمـانو عـەقیدەی ئیسـلامیی)، کـە ژمارەیـان پەنـجا (٥٠) دەرسەو بە بیسـراویی بینراویی تۆمارکراونو، ئێسـتاش کار لەسەر نووسینەوەیان دەکـرێ بـۆ چـاپ کران، چاکتـرینو فراوانتـرین سەرچاوەی ئیمانو عـەقیدەن، بە زمانی کـوردیی، هیوادارم بەرەکـەتو هێزو پێزێکـی زۆریان تێـدابێ، هەم بۆ ڕاسـتـکردنەوەو، هەم بۆ بەهێزو پتەوکردنو چاکتـر دامەزراندنی ئیمانو عەقیدەی خوشـكو برایانی مسـوڵمانی کورد، بە هەموو پایەو بەشـەکانی عـەقیـدەوەو لـە هـەموو بـوارو لایەنەکانیدا، شـایانی باسـیشـە: زنجیـرە دەرسی ناوبراو هەندێك لە سەرچاوەکانی ئەمـانەن:

١- (شرح أصول أعتقادأهل السـنة والجماعة)ی اللالكـائي.

٢- ( الأسـماء والصفات)ی البيهـقي.

٣- (السـنة)ی ابن أبـي عاصـم.

٤- (الشـريعة)ی الآجرِّي.

٥- (شـرح السـنة)ی البغـوي.

٦- (مجموعـة الفتـاوى)ی إبن تيميـة.

٧- تەفسیـرەکانی (طبـري، ابن كـثيـر، شوكاني، فـي ظـلال القرآن).

٨- (صـحيح البخاري و صحيح مسـلم) بە شـەرحی (ابن حجـر) و (النـووي).

ئێسـتاش (٢٠١٢/١/٢٣ز) دەڵـێم:

سـوپاسو ستایش بۆ خـوا ئەو زنـجیـرە دەرسـە لە شـەش بەرگدا چاپ کراون بە ناوونیشـانی: (ئیمانو عـەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سـوننەت دا)و وەك زۆربەی بەرهەمەکانیشم لە نووسـینگەی تەفسیـر چاپ کراوە، لە نێوان ساڵەکانی: (٢٠٠٦- ٢٠٠٨) دا.

تەوەری دووەم:

## ناسین و لێتێگەیشتن و تەفاعول لەگەڵداکردنی ناو و سیفەتە بەرز و بێ وێنەکانی خوای بێ وێنە:

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

باسکردنو تێوەڕامانی ناوو سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا، چ لە کاتی زیکرو پاڕانەوەداو، چ لە حاڵەتی ئاساییدا، گەورەترین دەوری هەیە لە سافبوونەوەی دڵو دەروونی ئینسانداو، جوانبوونی خوو ڕەوشتیداو، لە خوا نزیککەوتنەوەیدا، خوای بەرزو مەزن لەوبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا ...﴿١٨٠﴾﴾ الأعراف.

پێغەمبەریشمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِسْماً مِائَةً إِلاّ وَاحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنَّهُ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ}[1].

واتە: بێگومان خوای بەرز، نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەن، سەد جگە لە یەکێك، هەرکەسێك بیانژمێرێ، دەچێتە بەهەشتێ، بێگومان ئەو تاکەو تاکی خۆشدەوێ.

ئنجا پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکی دیکەدا، کە (التّرمذي وابن حبان وابن خزيمة والحاكم والبيهقي وابن ماجه) گێڕاویانەتەوە، ئەو (٩٩) ناوەی باسکردوە، کە ئێمە لێرەدا دەیاننوسینو بە کوردییش مەعنایان لێك دەدەینەوە:

---

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٩٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٥٨٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٨٦)، وَغَيْرهُم عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

{ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ...

| | |
|---|---|
| ١- الرَّحْمَنُ | بە بەزەیی. |
| ٢- الرَّحِيمُ | بەخشندە. |
| ٣- الْمَلِكُ | حوکمڕان، سەرۆك. |
| ٤- الْقُدُّوسُ | پاك. |
| ٥- السَّلامُ | بێ عەیب، بێ پەڵە. |
| ٦- الْمُؤْمِنُ | دڵنیاکەر، بەڕاستدانەر. |
| ٧- الْمُهَيْمِنُ | بەسەرڕاگەیشتوو. |
| ٨- الْعَزِيزُ | زاڵ، دەستەڵاتدار. |
| ٩- الْجَبَّارُ | باڵادەست، ناچارکەر. |
| ١٠- الْمُتَكَبِّرُ | خۆ بەگەورەزان. |
| ١١- الْخَالِقُ | دروستکەر، بنیادنەر |
| ١٢- الْبَارِيءُ | بەدیهێنەر. |
| ١٣- الْمُصَوِّرُ | وێنەکێش. |
| ١٤- الْغَفَّارُ | لێبووردە. |
| ١٥- الْقَهَّارُ | گەردنکەچکەر. |
| ١٦- الْوَهَّابُ | بەخشەر. |
| ١٧- الرَّزَّاقُ | ڕۆزییدەر. |
| ١٨- الْفَتَّاحُ | دەرووکەرەوە. |
| ١٩- الْعَلِيمُ | زانا. |
| ٢٠- الْقَابِضُ | لێگرەوە، وێکهێنەر. |
| ٢١- الْبَاسِطُ | لەدوودەر، فراوانکەر. |
| ٢٢- الْخَافِضُ | دانەوێن، نەویکەر. |
| ٢٣- الرَّافِعُ | بلندکەر. |
| ٢٤- الْمُعِزُّ | زاڵکەر، عیززەت بەخش |
| ٢٥- الْمُذِلُّ | زەبوونکەر، مل پێ کەچکەر. |

| | |
|---|---|
| ٢٦-السَّمِيعُ | بیسەر. |
| ٢٧-الْبَصِيرُ | بینەر. |
| ٢٨-الْحَكَمُ | دادوەر، حوکمڕان. |
| ٢٩-الْعَدْلُ | دادگەر. |
| ٣٠-اللَّطِيفُ | چاکەکاری پەنهان، وردبین. |
| ٣١-الْخَبِيرُ | شارەزا، هەواڵدەر. |
| ٣٢-الْحَلِيمُ | هێدیی، ئارام. |
| ٣٣-الْعَظِيمُ | مەزن. |
| ٣٤-الْغَفُورُ | لێبوردە، گوناح پۆش. |
| ٣٥-الشَّكُورُ | سوپاسگوزار. |
| ٣٦-الْعَلِيُّ | بەرز. |
| ٣٧-الْكَبِيرُ | گەورە. |
| ٣٨-الْحَفِيظُ | پارێزەر. |
| ٣٩-الْمُقِيتُ | بژیوگەیێن، دەستەلاتدار. |
| ٤٠-الْحَسِيبُ | لێپرسەرەوە. |
| ٤١-الْجَلِيلُ | سیفەت بەرز، پایە بەرز. |
| ٤٢-الْكَرِيمُ | بەرێز، ڕێزگر، بەخشندە. |
| ٤٣-الرَّقِيبُ | چاودێر. |
| ٤٤-الْمُجِيبُ | وەلامگۆ. |
| ٤٥-الْوَاسِعُ | فراوان. |
| ٤٦-الْحَكِيمُ | کاربەجێ، لێزان. |
| ٤٧-الْوَدُودُ | بەندە دۆست، خۆشویستەر. |
| ٤٨-الْمَجِيدُ | پایەبەرز، خاوەن شکۆ |
| ٤٩-الْبَاعِثُ | زیندووکەرەوە، نێرەر. |
| ٥٠-الشَّهِيدُ | ئاگادار، ئامادە. |
| ٥١-الْحَقُّ | پایەدار، ڕاست، حەق. |
| ٥٢-الْوَكِيلُ | کار پێسپێرراو، پشتو پەنا. |

٥٣- الْقَوِيُّ بەتوانا.
٥٤- الْمَتِينُ بەهێز، قایم.
٥٥- الْوَلِيُّ دۆست، یارییدەدەر، سەرپەرشتییکار.
٥٦- الْحَمِيدُ ستایشکراو، شایستەی سوپاس.
٥٧- الْمُحْصِي ژمێرەر.
٥٨- الْمُبْدِئُ پەیداکەر
٥٩- الْمُعِيدُ گێڕەرەوە، زیندووکەرەوە
٦٠- الْمُحْيِي ژیێنەر.
٦١- الْمُمِيتُ مرێنەر.
٦٢- الْحَيُّ زیندوو.
٦٣- الْقَيُّومُ مشورگێڕ، ڕاوەستاو
٦٤- الْوَاجِدُ هەبوو.
٦٥- الْمَاجِدُ خاوەن پایەی بەرز.
٦٦- الْوَاحِدُ یەك.
٦٧- الأَحَد تاك، تەنیا.
٦٨- الصَّمَدُ بێ نیازو جێی نیاز.
٦٩- القَادِر توانادار.
٧٠- الْمُقْتَدِر خاوەن سەرچاوەی توانا.
٧١- الْمُقَدِّم پێشخەر.
٧٢- الْمُؤَخِّرُ دواخەر.
٧٣- الأَوَّلُ یەکەمین.
٧٤- الآخِرُ دوامین.
٧٥- الظَّاهِرُ دیار، ئاشکرا.
٧٦- الْبَاطِنُ ون، پەنهان.
٧٧- الْوَالِي سەرپەرشتییکار.
٧٨- الْمُتَعَالِي زۆربەرز، خۆبەرزگر.
٧٩- الْبَرُّ چاکەکار.

٨٠- التَّـــوَّابُ تۆبــه وەرگــر.
٨١- الْمُنْتَقِمُ تۆڵـه ســتێن.
٨٢- الْعَفُــــوُّ چـاوپۆشـییـکـار.
٨٣- الـــرَّءُوفُ میهــرەبـان.
٨٤- مَالِكُ الْمُلْكِ خـــاوەن ملـك.
٨٥- ذُو الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ خـاوەن پـایەی بـەرزو ڕێـز.
٨٦- الْمُقْسِطُ دادپــەروەر.
٨٧- الْجَامِـعُ کـۆکـەرەوە.
٨٨- الْغَنِـــيُّ دەوڵـەمـەند.
٨٩- الْمُغْـنِي دەوڵـەمەندکـەر، بـێ نیـازکـار.
٩٠- الْمَانِــعُ بەرگـر، پێشـگـیـرییـکـار.
٩١- الضَّــارُّ زیـانـگـەیێن بە دوژمن‌و ناحـەزانی[1].
٩٢- النَّـافِــعُ سـوودگـەیێـن بە دۆسـت‌و خۆشـەویسـتەکانی.
٩٣- النَّــــورُ ڕوونـاکـیـی.
٩٤- الْهَـــادِي ڕێ پیـشـــاندەر.
٩٥- الْبَــدِيعُ داهێـنـەر، بــێ وێنـه.
٩٦- الباقِـــيّ هــەرمـاو.
٩٧- الـــوَارِثُ میـراتگــر.
٩٨- الرَّشِـيدُ کـــارزان، شـارەزاکـەر.
٩٩- الصَّــبور ئـــارامگـر. }

---

(١) لە کتێبی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی، بەرگی (٣)، ل (٣٨٧)، دەربـارەی (الضَّــارُّ)، ئـەم پـەڕاوێزەمان نووسیوە:
پێشـتـر باسـمان کرد، کە زانایـانی فـەرمووەدەناس لـەبارەی سـەنەدی ئـەم فەرموودەیـەوە بـە گشـتیی مشتومڕیان هەیە، بەتایبەت لەبارەی وشەی (الضَّـارُّ)ەوە، ئیشکالیان هەیەو، مەگەر (قیـد)ێکی بخرێتـە سەر وەك (الضَّـارُّ بالكافرين) ، ئەگەر نا، شایستەی خوا (سبحانه وتعالــى) نیەو، بە یەکێ لـە ناوەکـانی دانانرێ.

## چەند ئاگادارییەك دەربارەی
## ناو و صیفەتەكانی خوا (تبارك وتعالى)

١/ وەك لەو فەرموودانەی، كە ڕابردن دەدردەكەوێ، وشەی بەرزو پیرۆزی (ألله) لە ڕیزی نەوەدو نۆ (٩٩)[1] ناوەكان، نەژمێرراوە، دەنا دەبوونە سەد (١٠٠)، ئنجا بێگومان هەرواشە، چونكە فەرموودەكە ئاوایە: (إنَّ لله..) كەواتە ئەو نەوەدو نۆیە، هەموویان ناوو سیفەتی خوا (الله)ن و، ئەویان پێ ناوبراوەو وەسف كراوە.

٢/ مەبەست لە ڕستەی: {فمَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ}، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، لەبەركردن و تێگەیشتن و بیرلێكردنەوەی هەموو ئەو ناوو صیفەتە چاك و پەسندانەو، كار پێكردن و لەخۆدا هێنانەدی، مەعناو نێوەڕۆكی هەندێكیانە، كە بۆ ئینسان دەشێن و دەگونجێن.

٣/ كاریگەریی ئەو ناوو سیفەتە بەرزو چاكانە، لە چاككردنی ئینسان و لە خوا نزیك خستنەوەیدا، لەو ڕووەوەیە، كە خوای بێ وێنە پێی خۆشە، بە ناوو سیفەتە هەرە چاكەكانی مەدح و ستایشی بكەین و، هەتا زیاتر ئەو ناوو سیفەتانەی خوای بێ هاوەڵ، لە دڵ و مێشكی مرۆڤدا جێگیرببن و، پتر بیریان لێ بكاتەوە، زیاتر كار دەكەنە سەر دڵ و دەروونی و، خونچەی خەسڵەت و ئاكارە بەرزو جوانەكانی زیاتر تێدا دەپشكوون.

كەواتە: كێ دەیەوێ دەست لە هۆكارێكی هەرە كاریگەر گیر بكات، بۆ صالح بوون و بەرەو خوا چوونی، با ئەم[2] ناوو سیفەتە بەرزو مەزنانەی خوا بە ڕەوانیی و بە

---

(١) لە هەر كام لە (الأذكار)ی (نووي)و (تحفة الذاكرين)ی (شوكاني)دا، ناوە بەرزەكانی خوای پەروەردگار نەقڵ كراون، بڕوانە: (الأذكار)، ص: (٩٤) و، (تحفة الذاكرين)، ص: (٥٣)، ئەوەندە هەیە لە (الأذكار)دا، ناوی (الأحد) پەڕێنراوەو، جگە لە (ألله) ژمارەی ناوەكان (٩٨)ە، بەڵام (تحفة الذاكرين) بەو شێوەیەی هێناون، كە من نووسیومە.

(٢) زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە ناو و سیفەتە بەرزو بێ وێنەكانی خوا، جگە لەمانە، زۆری دیكەشن، بەڵام لەسەر ژمارەیەكی تایبەت ڕێك نەكەوتوون .

مەعنای ڕوونەوە لەبەربکاتو، سەرنجی وردو قووڵیان لێ بدات و، لەکاتی پاڕانەوەو ڕازو نیازدا، پێیان لە خوا وەپاڕێ، بەڵام گرنگ بیر لێکردنەوەو بەدڵ داهێنانی مەعناو مەبەستیانو، خۆ پێ ڕازاندنەوەو لەخۆدا هێنانەدی نێوەڕۆکی ئەوانەیانە، کە بۆ ئینسان دەگونجێن، وەك: (العَلِيمُ، الْحَكِيمُ، الرؤوف، الرَّحِيم، العَزِيز، الْحَلِيم، العفو، الغَفُور، الصَّبُور، الشكُور..).

چونکە مرۆڤ دەگونجێ: زاناو کاربەجێو دڵ نەرمو بە بەزەییو زاڵو هێدییو لێبوردەو...هتد بێت.

تەوەری سێیەم:

## چاکبوونی: دین و، دنیاو، دواڕۆژو، ژیان و، مەرگ ، پێنج مەرج و هۆکاری گرنگی صاڵح بوون و بەرەو خوا چوونی مرۆڤن:

پێغەمبەری پێشەوامان (صلى الله عليه وسلم) لە پاڕانەوەیەکیدا فەرموویەتی: {أَللّٰهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي اَلَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ اَلَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي اَلَّتِي إِلَيْهَا مَعَادِي، وَاجْعَلْ اَلْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلْ اَلْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ}(١).

واتە: ئەی خوایە! ئەو دینداریيەم(٢) کە مایەی ڕاوەستانی کاروبارمە، بۆم چاك بکەو، ئەو دنیایەی، کە گوزەرانمی تێدایە، بۆم باش بکەو، ئەو دواڕۆژەم، کە بۆی دەگەڕێمەوە، بۆم ڕێکبخەو، تەمەنو ژیانم بگێڕە بە مایەی بەرەو پێشچوون لە هەر خێرو چاکەیەکداو، مەرگیشم بۆ بگێڕە بە مایەی ئاسوودەییو قوتاربوون لە هەر خراپەو زیانێك.

بەڵێ مسوڵمانی سەنگینو شیرین !

پاڕانەوەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و داواکارییەکانی لە خوای بەخشەر، ئاوا بوون بۆ چاکبوونی:

١) دینداریی.. ٢) دنیاداریی.. ٣) دواڕۆژ.. ٤) ژیان.. ٥) مەرگ..

دیارە مەبەستیش لە چاکبوونی ئایین (دین)، چاکبوونی ئینسانە بە ئایینەوەو، باش دینداریی کردنیەتی و، مەبەست لە چاکبوونی دنیا، ئەوەیە کە ئینسان ژیانێکی ئازادو بە کەرامەتو پڕ هێمنییو بێ نیازییو نا ئاتاجیی هەبێ، دواڕۆژیش

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٠٧٨)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

(٢) بۆیە وشەی (دین)م وا تەفسیر کرد، چونکە دین (ئیسلام) لە زاتی خۆیدا هەر کامڵو چاکەو، پێویستیی بە چاکبوون نیە: ﴿... ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ...﴿٣﴾﴾ المائدة.

بەوە چاك دەبێ، كـە ئینسـان لـەم ژیانە دنیاییەدا، دیندار و چاكەكـار بێت، كاتێكـیش ئینسـان ژیانی دنیای دەبێتە مایەی زیادبوونی خێرو چاكە، كـە هەمیشـە سـەرگەرمی خواپەرستیی‌و بەرەو خوا چوون بێت‌و وەستانی نەبێ، مەرگ‌و مـردنیش كـاتێك دەبێتـە دەروازەی ئاسوودەیی‌و قوتـاربوون لـە گرفتـاریی‌و نـا هـەمواریی‌و زیـان‌و خراپـە، كـە ژیانێكی دیندارانەی بەختیارانەی سـەلامەت‌و بـە كەرامـەتی، لـەپێش دەسـتیدا بـەڕێ كـردبێ.

بەڵـێ بنـاغەی تەزكیـەی نەفس‌و مەرجی هەرە گـەورەی صـاڵح بـوون‌و بـەرەو خـوا چوون، بریتیە لە پابەندیی پاك‌و پوخت بـە ئـاینی خـواوە، دینداریيـەكی بـێ خلّـەتەی ڕاست‌و دروسـت، ئنجا ئەمیش بەبێ ژیانێكی دنیایی سەلامەت‌و پڕ كەرامەت مسـۆگەر ناكرێ‌و، دینداریی كردن پێویسـتیی بە دنیـاداریيـەكی شـەرعیـانە هـەیـە !

كـەواتـە:

ئەوانەی بەناوی تەزكیەو عیـرفانەوە پێیان وایە، كە سـەرگەرم بـوون بـە دنیـاوە، بـە ئەندازەی پێویسـت‌و وەك ئامراز و لە سنووری شەریعەتدا، ڕێ لە تەزكیەی نەفس دەگـرێ !! خراپ حاڵیی بوون‌و بەپێچەوانەوە: دواڕۆژی باش پەیوەستە بە دنیای باشەوەو، كەوتۆتە دوایەوە، هەم لە دنیای واقیعـداو، هەم لە شەرعیشـــدا، خـوای كاربـەجێ فەرموویـەتی:

﴿... رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾ البقـرة.



## تەوەری چوارەم:

### سێ کۆچکەی خۆڕاگریی و سوپاسگوزاریی و پشت بە خوا بەستن (الصبر والشكر والتوكل):

ئەمانەش سێی دیکەن لە هۆکارە بنەڕەتییەکانی خۆ چاککردنی ئینسانو لە خوا نزیکبوونەوەی:

١- خۆڕاگریی (صبر): ﴿... إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾الزمر.

٢- سوپاسگوزاریی (شكر): ﴿... لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ... ﴿٧﴾﴾ إبراهيم

٣- پشت بەخوا بەستن (توكّل): ﴿... وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ... ﴿٣﴾﴾ الطلاق.

ئێستاش با سەرو تیشك بخەینە سەر هەر کامێکیان :

* مەبەست لە خۆڕاگریی (صبر)، خۆڕاگرتنو پێچەسپاندنو دامەزراوییو نەلەخشاوییە، لە بەرامبەر فەرمانبەریی (طاعة)و سەرپێچیی (معصية)و بەلاو (مصيبة)دا، یەکەمیان بۆ بەجێهێنانی بەتەواوییو، دووەمیان بۆ خۆ لێپاراستنو، سێیەمیان بۆ خۆ لە ئاقاردا ڕاگرتنو لەبەردەمیدا بەچۆك دانەهاتنو بێزاریی دەرنەبڕین.
* مەبەست لە سوپاسگوزاریی (شكر) بەکارهێنانی چاکەو نیعمەتو بەهرە خواییەکانە، لە ڕەزامەندیی خوادا، نەك گوتنی (الحمد لله)، کە ستایشو مەدحکردنی خوایە.
* پشت بە خوا بەستنیش ئەوەیە، کە وێڕای ڕەچاوکردنی هۆیەکانی هەر کاروبارێكو هەوڵدان بۆ دابینکردنیان، ئینسان دڵی هەر بە خواوە پەیوەست بێتو، دڵنیابێ، کە بەبێ ویستی خوا، هیچ شتێك نابێ، نە بەلای بوونو، نە بەلای نەبووندا (لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ).

بۆیەش ئەم سێیەم (صەبرو شوکرو تەوەککول) بە سێ کوچکەی صالّح بوونو بەرەو خوا چوون دانان، چونکە:

لە سۆنگەی صەبرەوە، لە مەیدانی دینداریدا، پێ چەقیوو پشوو درێژو نەبەزیو دەبین، لە هەرسێك بواری چاکەکاریی‌و دووریی لە گوناح‌و، خۆڕاگرتن بۆ بەلاّو گرفتارییەکاندا، هەر بۆیەش نەمبینیوە خوای دادگەر لە قورئانیدا، جگە لە خۆڕاگران (صابرون) بە کەسی دیکەی فەرمووبێ، کە بەبێ ژماردن پاداشتیان دەدرێتەوە!: ﴿... إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ الزمر.

بەهۆی شوکرەوەش، شایستەیی ئەوە پەیدا دەکەین، کە بەردەوام خوای بەخشەر لە چاکەو بەخششی خۆی بۆمان زێدە دەکات: ﴿...لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ... ﴿٧﴾﴾ إبراهيم.

لەسایەی تەوەککولەوەش، خوا لە خەمو پەژارەی دنیاو دوارۆژ ڕزگارمان دەکاتو، هەر بۆخۆی مشووری حاڵو باڵو کاروبارمان دەخوات: ﴿...وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ... ﴿٣﴾﴾ الطلاق.

بەڵێ مسوڵمانی شیرین !

بەهۆی خۆڕاگرییەوە دامەزراو دەبینو، لە سایەی سوپاسگوزارییەوە بەرەو زیادی دەچینو، لە بەرەکەتی پشت بە خوا قایم بوونو دڵ بە خوا بەستنیشەوە، ئاسوودە دەبینو، لە خەمی دنیاو قیامەت دەرەخسین !

## تەوەری پێنجـەم:

### دە (١٠) ئامڕاز لە پێداویسـتییەکانی ڕێی بەرەو خـوا چوون:

خوێنـەری خۆشـەویسـت !

شـتێکی ئاشکراو بێ پێچو پەنایە، کە خوای پەروەردگـار، ئەم ژیانەی ئێمەو تێکـڕای بوونەوەریشی، بەپێی یاسای هۆکاری (قانون السببية) دامەزرانـدوەو بـەڕێوەی دەبـات، کەواتە: بۆ هەر کـارێك، سـازکردنو دابینـکردنی ئەو هۆیـانەی پێویسـتە، کـە پـەکی لەسـەریان کـەوتوەو بەبێ وان نایـەتـەدی.

ئنجا مەسەلەی صالح بوونو بەرەو خوا چوونیش، کە گرنگـتـرینو بـەرزترین کـارە، وەك هەموو ئیشو کارێکی دیکە، حەوجێی چەند ئامڕازو هۆیەکی تایبەتیـیە، کە بـەبێ وان ئەنجامدرانو بەڕێوەبرانی مەحاڵە، ئنجا پێغەمبەری پێشـەواو چاوسـاغمان (صلى الله عليه وسلم) لە یەکێك لە فەرموودە بەپێزەکانیدا، دە (١٠) ئامڕازی گرنگو بنچینەیی بـۆ دەست نیشان کردووینو فێری کردووین، کە لەکاتی پاڕانەوەماندا، لە خوای میهرەبانیـان داوا بکەین، فەرموودەکەش ئەمەیە: {أللّهُمَّ إنيِّ أَسْأَلُك الثَّبَاتَ فِي الأَمْرِ، وَالْعَزِيمَةَ عَلَى الرُّشْدِ، وَأَسْأَلُك شُكْرَ نِعْمَتِكَ، حُسْنَ عِبَادَتِكَ، وَأَسْأَلُك قَلْبًا سَلِيمًا، وَلِسَانًا صَادِقًا، وخُلُقاً مستقيماً، وَأَسْأَلُك مِنْ خَيْرِ مَا تَعْلَمُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُك لِمَا تَعْلَمُ}[1].

واتە: ئـەی خوایـە! من داوای چەسـپاویی لە کـارداو، دڵ دامەزراویی لەسەر هەقـت لـێ دەکەم و، داوات لـێ دەکەم سوپاسی چاکەت بکـەمو چاکـت بپەرسـتم و، دڵـێکی ساغو، زمانێکی ڕاستو، ڕەوشـتێکی چاکـت لـێ داوا دەکەم و، داوای هەر چاکەیەکـت

(١) رَوَاهُ النَّسَائِي برقم: (١٣٠٤)، وَأَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (١٨٧٢) (وخُلقاً مستقيماً) من روايته، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، أنظر: (تحفة الذاكرين) للإمام الشوكاني، ص: (٢٨٥)، وَضَعَّفَهُ الألباني في (المشكاة)، برقم: (٩٥٥) وفي (ضعيف سُنن الترمذي)، ولكن صَحَّحَهُ في (السلسلة الصحيحة)، برقم: (٣٢٢٨).

لـێ دەکەم، کە بۆ خۆت دەیزانیو، پەنات دێنمە بەر لە هەر خراپەیەك، کە پێی زانای و، داوای لـێـبوردنت لـێ دەکەم، بۆ هەر هـەڵەیەك، کە پێـی ئاگـاداری.

خوێنەری بەڕێـز !

ئەم فەرموودەیە چوار بڕگە (مقطع)ی سەرەکییە، کـە هـەر کامێکیـان بـە (أسـألك) دەست پێ دەکاتو، لە هەر کامێکـیانـدا، چەند ئامڕازێـك لـە دە (١٠) هـۆو ئـامڕازی گرنگو بنچینەکانی ڕێـی صالح بوونو بەرەو خوا چوون، باسـکـراون:

لە بڕگەی یەکـەمـدا ئامڕازەکانی (١، ٢) کـە بـریتین لـە لاق چـەقاندنو خـۆڕاگریی لەکـاتی بەڕێوەبردنی ئیشـوکارداو، دڵ بەهێزییو دامەزراویی لەسەر گرتنو هەڵـبژاردنی چـاکـەو هـەق، خراونە ڕوو، گومانیشی تێدا نیە، کـە لاقـی چەسپاوو دڵـی دامـەزراو، بناغەو بنچینەی هەر ئیشو کارێکن، بەتایبەتی کـاری (بەخـۆداهـاتنەوەو بـەرەو خـوا گـەڕانەوە).

لە بڕگەی دووەمیشـدا ئامڕازەکانی (٣، ٤) باسکراون، کـە بـریتین لـە سوپاسـکردنی چاکـەو نیعمەتی خواو، چاك پەرستنی، هەڵبەتە ئەمانیش توێشـووو سـەرچاوەی وزەی بابای ڕێبواری ڕێی صالح بوونو بەرەو خوا چوونن.

لە بڕگەی سێیەمیشـدا ئامڕازەکانی (٥، ٦، ٧) خراونە ڕوو، کە دڵی ساغو، زمـانی ڕاستو پاكو، ڕەوشتی بەرزو چاکن، دیارە ئەمانـەش لـە گرنگتـرین هۆیـەکانی بـڕینو تەواوکردنی ڕێگـای ناوبراونو، بۆ بابای ڕێبواری ڕێـی نـاوبراو، وەك وڵاخـی سـوارییو هەڵگـری توێشـوو کەلـوپەلو پێداویسـتییەکانی ئەو ڕێگـایەیەتی.

پێویسـتە ئەوەش بگوترێ، کە هەتا دڵ سـاغو ڕوونـاك نـەبێ، زمـان ڕاسـتو پـاك نابێـتو، بەبێ دڵی سـاغو ڕووناکو زمـانی ڕاسـتو پاکـیش، ڕەوشـتی بـەرزو چـاك دەسـتگیـر نـابێ.

ئنجا لە کۆتاییو لە بڕگەی چوارەمـدا، ئامڕازەکـانی (٨، ٩، ١٠) باسـکراون، کـە بریتین لە سێ مەبەستی گـرنگو، وەك چـەترو قەڵـغانو کەلـوپەلـی خۆپاراسـتن، لـە سـەرماو گـەرماو دڕندەو جەردەو ڕێگری ڕێگـان، کە ئەمانەن:

* داواکردنی هەرچی خێرو چاکەیە، لە خوا.
* پەنابردن لە هەرچی شەڕو خراپەیە، بۆ لای خوا.
* داوای لێبووردن کردن بۆ هەرچی تاوان و هەڵەیە، لە خوا.

ئیدی هیوادارم خوای بەرزو مەزن و بەخشەرو میهرەبان بە لوتفی خۆی، هەرکام لەم دە(١٠) ئامرازو پێداویستییە گرنگ و بنچینەییانەمان پێ ببەخشێ.

## تەوەری شەشەم:

### دە (١٠) پایەو بنچینەی گرنگی ڕێی بەرەو خوا چوون:

لە خاڵی پێشوودا لەبەر تیشکی فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دە (١٠) هۆو ئامرازی گرنگی ڕێی صالح بوونو بەرەو خوا چوون خرانە ڕوو، لێرەشدا لەبەر تیشکی فەرموودەیەکی دیکەی ئەو زاتە بەرزەدا (صلی الله علیه وسلم) دە (١٠) پایەو بنچینەی گرنگی ئەو ڕێیە پڕ پیتو فەڕە، دەخەینە ڕوو:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەکیدا، کە بە گەورەترین شێوەی داوای لێبوردن کردن (سید الإستغفار)ی داناوە، فەرموویەتی {أَللّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لاَ إِلَهَ إِلاّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاّ أَنْتَ}[1].

واتە: ئەی خوایە ! تۆ پەروەردگارمی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراو نین، دروستت کردووم، من بەندەی تۆم، من بەپێی توانام هەر لەسەر پەیمانو بەڵێنی تۆم، پەنات دێنمە بەر لە چەنگ خراپەی ئەوەی کە کردوومە، دانت بۆ پێدا دێنم، کە چاکەت بەسەر منەوە هەیە، پێ لە هەڵەی خۆم دەنێم، جا لێم ببوورە، چونکە جگە لەتۆ کەس لە گوناحان خۆش نابێت.

---

(١) ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩٤٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٠٧٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٧٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٠٣٥)، وَالحَاكِمُ، برقم: (١٨٩٦) عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ باختلاف يسير.

بەرلەوەی دەست بکەم بە نووسینو دەرهێنانی ئەو دە(١٠) بنچینە گرنگەی، کە پێشتر باسمکردن، لە دەریای پڕ گەوهەری ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەپێویستی دەزانم ڕاستییەکی مەزن بخەمە بەرچاوی خوێنەری بەڕێز :

هەروەك چۆن دەریا زلەکان هەمیشە پڕن لە نێچیری بە نرخو، گەوهەرو مرواریی بەقیمەت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆر کەس بەسەریاندا دێو دەچێ، هەر ئەو ڕاوچییانە، کە کارامەو مەلەوانی ئازاو لێزانن، ئەو نێچیرو گەوهەرو مرواریيانە دەستگیر دەکەن، ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەریشمان (صلی الله علیه وسلم)، بەهەمان شێوە پڕپڕن لە حیکمەتو پەندو زانیاریيو نهێنیی قووڵو بەسوود، بەڵام مەرج نیە هەرچی لەبەری کردنو مەعنای دەقی وشەکانی زانین، بتوانێ پەی بە هەموو ئەو حیکمەتو زانیاریيو نهێنییە گرنگو بایەخدارانە بەرێ، چونکە جگە لە شارەزایی لە زمانو ئەدەبی عەرەبییدا، گەورەترین مەرجی بەهرەمەندبوون لە حیکمەتو نهێنییە، پەنهانەکانی قورئانو سوننەت، بریتییە لە پارێزکاریی (التقوى)، هەر بۆیەش خوای زانا فەرموویەتی: ﴿... إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانًا ... ﴿٢٩﴾﴾ الأنفال.

کەواتە: با هەوڵ بدەین، هەرچی زیاتر خەسڵەتی پارێزکاریی (تقوى) لە خۆماندا قووڵو دامەزراو بکەین، بۆ ئەوەی لە ئەنجامی ئەوەدا، دڵ ڕوونيیو بەرچاو ڕوونییمان، زیاترو چاکتر بێت.

ئێستاش با بێینە سەر ئەسڵی مەبەستو، ئەو دە(١٠) یاساو بنچینە گرنگو سەرەکییەی کە گفتمان دابوو، بیانخەینە ڕوو:

(١، ٢) دانهێنان بە پەروەردگارێتیيو، یەکتایی خوا لە پەرستراوێتییدا: (أَللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ). بێگومان خوا بە مشوورخۆرو گەورەو سەروەرو پەروەردگاری خۆ زانینو، خوا بە یەکگرتنیش لە پەرستندا، گەورەترین ڕاستیی (کبرى الحقائق)نو، گرنگترین پایەی ڕێی بەرەو خوا چوونیشن.

(٣،٤) دانـهـێنـان بـه بەدیهێنــەرایەتیی خـــواو، بەندایـەتیی خـــۆدا: (خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ)).

ئەمانیش دیســان دوو ڕاستیی هەرە بنچـینەیی‌و، دوو بنچـــینەو مـەرجی گرنگـی سەرکەوتن‌و بەمراد گەیشـتنن، بۆ ڕێبــواری ڕێــی ناوبراو.

(٥) ڕاگەیاندنی چەسـپاویی لەسـەر بەڵــێنی خـوا، بەپێـــی توانـا: (وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ)، بەڵـێ... نوێکردنەوەی بەڵێن‌و پەیمان لەگەڵ خوادا مەرج‌و بنچـینەیەکی هەرە گرنگ‌و پێویسـتی بابای ڕێبوار (سالك)ە.

(٦) پەنـا بردنە بەرخوا لە چەنگ خراپەو تاوان: (أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ)، ئەمیش وەك چۆن ئامڕازو هۆی بەرەو خوا چوونە، پایەو بنچـینەیەکی گرنگی ئـەو سـەفەرە بە بەرەکەت‌و پڕ مـەترسیی‌و خەتەرەشە.

(٧،٨) دانـهـێنـان بە چاکـەو نیعمـەتەکـانی خواو، خراپەو هەڵـەی خۆدا: (أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي)، بەڵـێ وەك لە شوێنەوار (أثر)ێکـدا هـاتوە، خـوای بەخشـندەو میهرەبان بە ئینسـانی فەرمووە: {يا ابْنَ آدَمَ! مَا أَنْصَفْتَنِي، خَيْرِي إِلَيْكَ نَازِلٌ وَشَرُّكَ إِلَيَّ صَاعِدٌ}، ئەی ئـادەمـزاد ! لەگەڵـم بە ویـژدان نی، هەر چاکـەی منە بەرەو تۆ دێتە خـوارو، هـەر خراپـەی تۆشـە بۆ لای من سـەردەکـەوێ.

(٩،١٠) داوای لـێبوردن لە خوا کردن‌و، تەمما بڕاو بوون‌و دەست شۆردن لە جگە لە وی: (فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ)، بەڵـێ داوای لـێبوردن کردن لە خوای لـێبوردەو بە بەزەیی، شتێکی یەکجـار گەورەو گرنگـە، بەڵام لـەوە گەورەترو گرنگتــر ئەوەیە، کە دڵـنیابی، جگە لە خوا هیچ کـەس ناتـوانێ گـوناح‌و هەڵـەو تاوانەکـانت ببووری‌و لەکـۆڵـت بکـاتەوە، لەڕاسـتییدا، جیـاوازیـیـەکی بنەڕەتیـی نێوان ئەهـلـی تەوحیـدو ئەهلـی شیـرك، لـە ئێـرەدایە، کـە:

خـوا بەیەکـــگران (مُوَحِّدين) دەزانـن‌و دڵـنیـــاو مســـۆگەرن، کـە گونـاح پۆشـین‌و عەفووکردن‌و لێبوردنیش، وەك دروستکردن (الخلق)و بژیودان (الـرزق)، یەکێکە لە سیفەتە تایبەتییەکانی خواو هاوبەشی تێدا نیە، بەڵام ئەهلی شیرك هـەر لـە بـت پەرسـتەکانەوە

بگرە، هەتا نەصڕانییە مەسیح پەرستەکانو، هەندێك لە مسوڵمانە ناحاڵییو سەرلێشێواوەکان بە سوننییو شیعەوە، کە وەك خوا چاوەڕوانیی لە شێخو ئیمامەکانیش دەکەن، بیانبەخشنو لێیان ببوورنو، لە چڵكو چەپەری گوناح پاکیان بکەنەوە، بەڵێ، سەرجەم ئەوانەو هەر کەسە بە ئەندازەو ڕاددەی ڕۆچوونی لەو بۆچوونو ڕەفتارە هەڵەیەیدا، کەمو زۆر، دووچاری هاوبەش دانان (الإشراك) بووەو، هیچ گومانیشی تێدا نیە، کە وەسفکردنی یەکێك لە دروستکراوەکان (مخلوقات) بە یەکێك یان زیاتر لە ناوو سیفەتەکانی خوا، شیرکەو شیرکی گەورەشە، واتە: ئەو جۆرەیە، کە خوا قەڵەمی عەفووی بەسەردا ناهێنێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ... ﴿٤٨﴾ ﴾ النساء. بەڵام دەبێ وریا بینو بزانین، کە بۆ حوکمی شیركو کوفر بەسەر یەکێکدا دان، پێویستە دڵنیابین لە چەسپاندنو هاتنەدی مەرجەکانی کافربوونو، لاچوونی پەرچو ڕێگرەکانی، کە زانایان بە ڕستەی: (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) تەعبیریان لێ داوەتەوە، کەواتە مەرج نیە، هەر کەسێك کوفری تێدا بوو، کافربێو، هەر کەسێکی شیرکی لێ بیسترا، یان لێ بینرا، بە موشریك دابنرێ، هەر بۆیەش زاناو پێشەوایانمان بۆ وێنە (ابن تيمية) - ڕەحمەتی خوایان لێبێ – گوتوویانە: (قد يكون قول الرجل وفِعْلُه كفراً أو شركاً، ولا يكون هو كافراً أو مُشْركاً) واتە: جاری وا دەبێ قسەو ڕەفتاری کابرا کوفرە، یان شیرکە، بەڵام پێی نابێتە کافر، یان هاوبەش بۆ خوا دانەر.

## تەوەری حەوتەم:

### پازدە (١٥) هۆکاری گشتیی و سەرەکیی، پێ صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون:

**١- نــوێــژ:**

نوێژ بەرپـاکردن کە گەورەترین جـۆری خواپەرسـتی تایبەتییـەو، سـنوورو نێـوانی ئیمانو کوفرە، کە خـوای پەروەردگـار لـەبارەوە فەرموویـەتی: ﴿...وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ طـه. واتـە: نوێـژیش بـۆ یـادکردنم بـەرپا بکـە، کاریگـەرترینو سەرەکـییتـرینو گشـتییـترین هۆکـارو ئامرازی صاڵح بـوونو بـەرەو خـوا چـوونە، کەواتە: ئەی مسـوڵمانی هاودینی شیـرینم ! هـەتا پێـت دەکرێـت ئـاگاداری بـەو، مەرجە ڕواڵەتییو پەنهانـەکانی تێـدا ڕەچـاو بکـەو، تـەنیا بـە نوێـژە فـەرزەکان واز مەهێنەو، هەوڵ بدە سـەرجەم نوێـژە سـوننەتەکانیش بکـەی، بەتایبـەت ڕەواتیـبو، وەترو، شەونوێژو، نوێژی چێشـتەنگاو و، بەکـۆمەڵ نەبێ نوێـژە فـەرزەکانت مەکـە، چونکـە زۆربەی زانـایان نوێژکردنی بەکۆمەڵ، ئەگـەر بە فـەرزی عـەین نـەزانن، بـە فـەرزی کـیفـایەی دادەنێن[١]، یان بەلانی کەمەوە بە پەسندێکی جـەخت لەسـەرکراو (سنّة مؤكّدة).

**٢- زیکـــر:**

زیکـری خواکـردن بە دڵو زمـان، دوای نوێژ، چاکتـرینو کاریگـەرترین هـۆی لـە خوا نزیکـبوونەوەو پاکـبوونـەوەی ئینسـانەو، ئەهلـی عیـرفان گوتوویـانە: (الـذکر

---

(١) لە مەوسووعەی: (خواپەرسـتیی ئیسـلامیـی...) کتێبی دووەمـدا، بـە تێـرو تەسەلـیی باسـی نوێـژو سەرجەم مەسەلەو بابەتەکانیمان کردوە، بڕوانە: چاپـی دووەم : نووسـینگەی تەفسـیـر.

منشور الولاية)[١]، خوای پەروەردگاریش لە گەلێك جێگای قورئانیدا فەرمانی کردوە، کە یادی بکەین، بۆ وێنە:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾﴾ الأحزاب.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بە یادکردنێکی زۆر یادی خوا بکەن.

ئاشکراشە، کە زیکری خوا، جۆری زۆرن‌و، هەر جۆرە بۆ حاڵەت‌و باروودۆخێکی تایبەتییە، بۆ وێنە:

زیکری (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ) بۆ حاڵەتی تۆبەکردن‌و هەست بە گوناحباریی کردن‌و، زکری (الْحَمْدُ لِلّهِ) بۆ ستایشکردنی خواو، زیکری (حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ) بۆ حاڵەتی تەنگانەو ترسان‌و... هتد.

هەڵبەتە چەمك‌و واتای ڕاستەقینەی زیکریش لەوە فراوانترە، کە تەنیا لە گوتنی ئەو جۆرە زیکرو وێردانەدا کورت هەڵبێ، لە جێگەی دیکەشدا بە تێرو تەسەلیی باسی زکرو یادی خوامان کردوە[٢].

### ٣- قورئان خوێندن:

قورئان خوێندن، گەورەترین‌و بەرزترین جۆری زیکرە‌و، لە هەموو جۆرەکانی، تەنانەت لە گوتنی (لا إلە إلا الله)ش، کە گەورەترین وشەیە، خێرترەو کاریگەرتریشە، بەتایبەت بۆ کەسێك، کە لێی تێ بگات، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِهِۦ ... ﴿٢٧﴾﴾ الكهف.

واتە: ئەوەی لە کتێبی پەروەردگارت بۆ لات سروش کراوە، بیخوێنەو گۆڕەریش بۆ ڕستەکانی نیە..

(١) واتە: یادی خواکردن بڕوانامەی دۆستایەتیی (خوا)یە.

(٢) بڕوانە: (یادی خوا) بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم: (١٩٨٧) و، بڕوانە: (خواپەرستی ئیسلامیی)، کتێبی چوارەم.

ئەوەندەش بزانە کە بە ئەندازەی خواناسینو لە خوا نزیکبوونەوەت، لە فەرمایشتەکەشی حاڵی دەبی، چونکە هەتا زیاتر بە یەکێك ئاشنابی، زووترو چاکتر لە قسەکانی تێ دەگەی.

٤- ڕۆژوو گرتن:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ ﴾البقرة.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ڕۆژوو گرتنتان لەسەر پێویست کراوە، وەك چۆن لەسەر گەلانی پێشووتان پێویست کرابوو، بۆ ئەوەی پارێزکاریی بکەن.

بەڵێ، بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە، ئینسان بەسەر نەفسو ئارەزووەکانیدا زاڵ دەبێو، جڵەوی هەواو غەریزەکانی جەستەی دەکەوێتە دەستی عەقڵو ڕووحی.

دەجا ئەی مسوڵمانی عەودالّی تەزکیەو کامڵ بوونو بەرەو خوا چوون! ڕۆژووگرتن بکە بە پەیژەی پێهەڵا چوونتو، لە خوا نزیکبوونتو، وەك فریشتان چوونتو، لە شەیطان دووربوونت، ڕۆژوو بگرە بە فەرزو سوننەتییەوە، فەرز کە مانگی ڕەمەزانەو، سوننەتیش ئەگەر بتوانی، ڕۆژ نا ڕۆژێك، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: چاکترین جۆری ڕۆژووگرتنەو عادەتی (داود) بووە عليه السلام، وەك (بخاري) [1] گێڕاویەتەوە، ئەگەر نەتتوانی دووشەممەو پێنج شەممەی هەر هەفتەیەك، بەلای کەمیشەوە مانگی سێ ڕۆژی هەر لێ بگرە، کە چاکتر وایە ڕۆژانی (١٣، ١٤، ١٥) بن، کە بە ڕۆژە سپییەکان (أيام البيض) ناسراون، واتە: ڕۆژانی شەوە سپیی و درەوشاوەکان بەهۆی مانگەوە.

توێژینەوەی ڕۆژووگرتنیش، پێویستیی بە جێیەکی دیکەی تەرخانکراو هەیە [2].

(١) أخرجه البخاري: ٣٢٣٨، ومسلم ١١٥٩، وغيرهما.

(٢) لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی..)دا بە تێرو تەسەلیی باسی ڕۆژوو کراوە.

٥- حـــەج و عــومـــڕە:

خوای بـەرزو باڵا دەست فەرموویەتی: ﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ... ﴿١٩٦﴾ ﴾البقرة.
واتە: حەج‌و عومڕەش بۆ خوا بە تەواویی ئەنجام بدەن.
ئـەمانیش هەردووکیـــان کاریگەرییـەکی یەکجـــار مەزنیـــان هـــەیە بـۆ پـاك‌و پوختەکردنی ئینسـان‌و لە خوا نزیکـخسـتنەوەی، لەڕاسـتییدا حـەج‌و عــومڕە، هـەر کـامێکـیان جۆرە خواپەرستییەکی هەمە لایەنـەی ڕووحیــی‌و فیکریــی‌و ئـەخلاقیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و سـیاسیی‌و سەربازیین‌و، لــە زۆر ڕووەوە کــار دەکەنــە ســەر مرۆڤـــ بـــۆ قوڵـــبوونەوەی ئیمـــانی‌و تەزکیـــەبوونی‌و پـــەروەردەبوونی، ئـــەمانیش توێژینەوەیـان شوێنی تەرخانـکراوی گەرەکـە(١).

٦- ئیـعـتیـکـــاف:

ئەمیش، کە خوای زاناو توانا لە چەند شوێنێکی قورئانێدا ئاماژەی پێ کردوە، بـۆ وێنە: ﴿ ...وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ... ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقـرة.
واتە: لە حاڵـێـکدا، کە لە مزگەوتـانـدا لە ئیعـتیکـاف دان، دەست مەگـــەیەننە هاوســەرەکانتـــان.
بەڵـێ ئەمیــش کــە شــەرعـــزانان ئــاوا پێنـــاسەیان کـردوە، (مانـــــــــەوە لــە مزگەوتێ بە مەبەسـتی عیبـادەت، بــە چــەند مــەرجێکی تایبەتییــەوە)، ڕۆڵـێکـــی یەکجار گرنگ‌و کــاریگـــەر دەگێـڕێ بـــۆ پاکـبوونـــەوەی دەروون‌و، گەشــەکردنی‌و کــامڵــبوونی ئیمـــان‌و بەرەو خـــوا چوونی ئینســـان(٢).

(١) هەروەهــا لە ســەرچاوەی پێشــوودا، حـەج‌و عومڕەش بە درێـژیی توێژراونەتەوە، هەمان کتێبی چوارەم.
(٢) ئیعـتیکـافـیش هەر لەگـەڵ ڕۆژوودا، لە ســەرچاوەی پێشــوودا باسـکراوە.

٧- بیرکردنەوە:

بیرکردنەوەو ڕامان لە بوونەوەرو دیاردە سەرسامکەرەکانی‌و، لە نەفس‌و جەستەو حاڵەتە سەیرەکانیان‌و، لە مێژووو کارەسات‌و ڕووداوە پەند بەخشەکانی‌و، لە مەرگ‌و گۆڕو دیاردە ڕاچڵەکێنەرەکانیان‌و، لە ناوو سیفەتە بەرزو پیرۆزەکانی خوای بێوێنەو، ئایەتە ڕاست‌و بەهێزو پیرۆزەکانی‌و...هتد، یەکێ دیکەیە لە توێشووە هەرە بەنرخەکانی سەفەری بەرەو خوا چوون، خوای زاناو پەنهانبینیش لەوبارەوە گەلێك شتی فەرمووە، بۆ نموونە:

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ... ﴿٤٦﴾ ﴾ سبأ.

واتە: بڵێ: من تەنیا یەك ئامۆژگارییتان دەکەم: ئەویش ئەوەیە کە بۆ خوا هەستنە پێ، دوو دووو یەك یەك، دوایی بیربکەنەوە...

٨- پاڕانەوە (الدعاء):

خوای وەڵامگۆ (مجیب) فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر.

واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە بەدەنگتانەوە دێم، بێگومان ئەوانەی لە ئاست پەرستنی مندا خۆیان بەزل دەگرن، لەمەو دوا بەزەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە.

بەڵێ، پاڕانەوە، کە پیرۆزترین‌و ناسکترین جۆری زیکرە، بەمەرجێك ئەو ئەدەب‌و مەرجانەی تێدا ڕەچاو بکرێن، کە قورئان‌و سوننەت خستوویاننە ڕوو، یەکێکە لە هۆکارە هەرە کاریگەرەکانی تەزکیەی نەفس.[١]

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، لەکاتی تەفسیرکردنی ئایەتی: (ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾)دا، باسێکی باشمان لەبارەی پاڕانەوەوە کردوە.

ئەوەندەش بزانە کە گرنگ ئەوەیە خوا جۆری پاڕانەوەکەت فێر بکات، دەنا وەلامدرانەوە ئاسانە، چونکە خوا بەخشەرو میهرەبانەو، هەر کاتێك جۆرە پارانەوەیەکی فێرکردی، سوور بزانە، کە بەخۆڕایی نەیخستۆتە دڵتەوەو، دەیەوێ وەلامیشت بداتەوە، بشزانە، کە جۆرو چۆنیەتی پاڕانەوەکەت لەگەڵ ئاستو قۆناغی بەرەو خوا چوونتدا، گونجاوو پڕ بە پێستە.

**٩- یارمەتییدانی خەڵکی:**

یاریدەدانی خەڵکیش بەدەستو زمان، یان بە ماڵو سامان، یان بە هەر شێوەیەکی دیکە، دەورێکی یەکجار بەرهەمدار دەبینێ لە بڕینی ڕێی بەرەو خوا چووندا، لەوبارەوە دەقی قورئانو سوننەت زۆرن، بۆ وێنە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾﴾ الحج.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕکووع بەرنو، سەجدە بەرنو، پەروەردگارتان بپەرستنو چاکە بکەن، بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {لأن يَمْشِي أَحَدكُم سَاعَة فِي حَاجَةِ أَخِيهِ خَيْر لَهُ مِنْ أَن يَعْتَكف فِي مَسْجِدي هَذا شَهْرَين}[١]، ئەگەر یەکێکتان ساتێك بە ئیشی برایەکییەوە بڕوات، بۆی چاکترە لەوەی، کە دوو مانگ لەم مزگەوتەی مندا بچێتە ئیعتیکافەوە.

هەروەها فەرموویەتی: {وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ}[٢].

واتە: کەسێك ئیشی برایەکی پێکبهێنێ، خواش کاری دەسازێنێ.

هەروا فەرموویەتی: {وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ، مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ.}[١].

(١) رَوَاهُ الحَاكم برقم: (٧٧٠٦) .

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٦٤٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٣١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٩٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٢٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ .

واتە: خواش هاوکاری بەندەکەیەتی، تاکو ئەو هاوکاری برایەکەی بێ.

شایانی باسیشە، کە ماڵو سامان بەخشین، کە زەکاتدان جۆرێکیەتیو چاکترینو گەورەترین جۆریشیەتی، بەرزترین شێوەی هاوکارییو چاکەکارییە لەگەڵ خەڵکداو، دەورێکی یەکجار کاریگەریشی لە تەزکیەکردنی نەفسو، مشتو ماڵو پاککردنەوەی دڵو دەرووندا هەیە، خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ... ﴿١٠٣﴾﴾ الحج.

واتە: لە سامانەکانیان زەکاتێك وەربگرە، کە بەهۆیەوە پاکیان بکەیەوەو گەشەیان پێبدەی..

### ١٠- خوو و ڕەوشتی جوان و پەسند:

خووو ڕەوشتی بەرزو پەسەندیش، یەکی دیکەیە لە هۆکارەکانی تەزکیەو، توێشوویەکی زۆر بەهێزو پێزی سەفەری بەرەو خوا چوونە، پێغەمبەری ڕەوشت مەزن (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيْمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً}[٢].

واتە: ئیمان تەواوترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانە.

هەروەها فەرموویەتی: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ}[٣].

واتە: بێگومان بڕوادار بەهۆی خوو ڕەوشتی جوانییەوە، دەگاتە پلەی کەسێك، کە بەردەوام بەڕۆژوو دەبێو، بێ پسانەوە شەو نوێژ دەکات.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٧٤٢١)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٧٠٢٨)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٩٤٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٩٤٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

(٢) رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٧٣٩٦)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٦٨٢)، وَالدَّارِمِي بِرقم: (٢٧٩٢)، وَابْنُ حِبَّان بِرقم: (٤٧٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (١)، وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيح عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَقَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

(٣) أخرجه أبو داود: ٤٧٩٨، وابن حبان: ٤٨٠.

**پێناسەی ڕەوشتی جوان :**

(النووي) لە (رياض الصالحين)[1]دا هێناویەتی، کە (الترمذي) لە (عبدالله بن المبارك)ەوە نەقڵی کردوە، کە لە پێناسەی ڕەوشتی جوان (حُسن الخلق)دا گوتوویەتی: (هو طلاقة الوجه، وبذل المعروف، وكفُّ الأذى) واتە: بریتییە لە: ڕووی خۆش و گەش و، چاکەکردن و بەخشین و، ئازارو نارەحەتیی لە خەڵکی گرتنەوە.

**١١- پاراستنی دەرو دەروون لە گوناح و هەڵەو قسەو ڕەفتاری پووچ:**

خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ...﴿١٢٠﴾ ﴾ الأنعام.
واتە: گوناحی ئاشکراو پەنهان واز لێبێنن.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: (بەندە هەڵبژاردەکانی خوا) ئەوانەن، کە لە شتی هەڵەو گوناحدا ئامادە نابن و، کاتێك بەلای شتی پووچدا ڕادەبرن، بەڕێزەوە ڕادەبرن، هەڵبەتە ئەم مەسەلەی خۆپاراستنە لە گوناحی ڕواڵەت و پەنهان، یەکجار کاریگەرە لە پرۆسەی تەزکیەی نەفسداو، لە بەشی چوارەمدا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

**١٢- کەم خۆریی و کەم خەویی و کەم دوێیی و کەم تێکەڵیی:**

هەر لە کۆنەوە زانایانی خواناسی دڵ بێدار گوتوویانە: بابای ڕێبواری ڕێی خوا، هەتا بەسەر چوار شتاندا زاڵ نەبێ و، نەیانخاتە ژێر ڕکێفی ئیرادەی خۆیەوە، هیچی لێ چاوەڕوان ناکرێ:

١/ خواردن و خواردنەوە (الأكل و الشرب).

٢/ نووستن (النوم).

---

(١) بڕوانە: (رياض الصالحين)، ص: (٢٢٩).

**٣/** قسەكردن (تكلم).

**٤/** تێكەڵ بوونی خەڵكی (الإختلاط بالناس).

چونكە ئەم چوارانە، هەروەك چۆن چەند داخوازییەكی بنەڕەتیی ژیانن، بنكو سەرچاوەی هەموو خراپەو تاوانەكانیشن، لە كاتێكدا زیادەڕۆییان تێدا دەكرێ‌و، لە شیرازەی شەرع دەچنە دەرێ.

بەڵێ مسوڵمانی خۆشەویست!

برسێتیی‌و شەونخونیی‌و بێدەنگیی‌و كەنارگیریی[1]، چوار هۆو ئامرازی هەرە گرنگ‌و پێویستن بۆ هەركەسێك كە بە مسوڵمانەتیی‌و خواپەرستییەكی سادەو عەوامانە قایل نەبێ‌و، خولیاو ئاواتی پێهەڵاچوونو بە دیداری جوانیی‌و شكۆ (جمال و جلال)ی خوا شادبوونی لەسەر دابێ، ئنجا لە تێكڕای دەقەكانی قورئانو سوننەتیش دەفامرێنەوە، كە: هەركام لە كەم خۆریی‌و، كەم خەویی‌و، كەم دوێیی‌و، كەم تێكەڵیی، شتی چاك‌و پەسەندن، بۆ وێنە:

١) خوا دەربارەی كەم خۆریی فەرموویەتی: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾﴾ الأعراف.

٢) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَا مَلأَ آدَميٌّ وِعَاءً شَرّاً مِنْ بَطْن، بِحَسْبِ ابن آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فإنْ كانَ لا مَحالةَ، فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ}[2].

---

(١) دیارە لێرەدا مەبەست حاڵەتی لەگەڵ خۆ تێكۆشان (مجاهدة النفس)ە، ئەگەرنا لە حاڵەتی ئاسایی‌و سروشتییدا، بە شێوەیەكی ئاسایی لەگەڵ ئەم مەسەلانەدا ڕەفتار دەكرێ، هەروەك چۆن نەخۆش، هەتا نەخۆشە پارێز دەكات‌و چارەسەر بەكاردێنێ، بەڵام پاش تێپەڕبوونی قۆناغی چارەسەرو دوای چاكبوونەوە، دەچێتەوە حاڵەتی ئاسایی‌و، واز لە پارێزو چارەسەرو دەرمان دێنێ.

(٢) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٧٢٢٥)، وَالتِّرمِذيُّ برقم: (٢٣٨٠)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٣٣٤٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٩٤٥) وَقَالَ: صَحِيح الإسناد، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢٣٦) وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة)، برقم: (٢٢٦٥)

واتە: ئادەمزاد هیچ دەفرێکی لە گەدەی خراپتری پڕنەکردوە، ئادەمزاد چەند پاروێکی بەسن پشتی پێ ڕابگرن، ئەگەر هەر ناچار بوو-بخوات-، با سێیەکی (گەدەی) بۆ خواردنەکەی و، سێیەکی بۆ خواردنەوەکەی و، سێیەکیشی بۆ هەناسەی بێ.

٣) خوا لە مەدحی کەسانێکدا، کە لە شەوێدا بێدارن‌و، سەرگەرمی ڕازو نیازن‌و کەم دەخەون، فەرموویەتی: ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ١٧﴾ الذاريات.

٤) پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی کەم دوێی فەرموویەتی: {مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ}[(١)].

واتە: هەرکەس بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با چاکە بڵێ، یان بێدەنگ بێ.

٥) هەروەها لە زۆر ئایەت‌و فەرمووداندا دەفامرێتەوە، کە زۆر تێکەڵبوونی خەڵکی پەسەند نیە، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ ٢ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ٣﴾ المؤمنون، دەجا گومانی تێدا نیە، ئەگەر بێت‌و بەس ئەم ئایەتەی: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ٣﴾ جێبەجێ بکەین، خۆمان لە تێکەڵ بوونی زۆربەی خەڵکی‌و، بەشداربوونی زۆربەی کۆڕو مەجلیسەکانیان دەپارێزین‌و کەنار دەگرین، چونکە مەگەر بەدەگمەن، دەنا خەڵکی هەر سەرگەرمی قسەو بابەتی پووچ‌و بێ کەڵکن!!.

ئەوەندە هەیە ڕەچاوکردنی چەند خاڵێك مەرج‌و پێویستە، لەوانە:

١/ نابێ کەم خۆریی‌و کەم خەوییەکەی بگاتە ڕاددەیەکی وا، بێ‌هێزو لاوازو نەخۆشی بکات، مەگەر لە چەند حاڵەتێکی زۆر پێویستداو، بۆ تەمبێ‌کردن‌و سەرشکاندنەوەی نەفس، هەڵبەتە ئەو دەمیش هەر دەبێ بە ئەندازەیەکی ماقووڵ

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ برقم: (٥٦٧٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٢).

بێ‌و، کارێك نەکات زیانی لە قازانجی پتر بێت.

٢/ نابێ کەم قسەییەکەی وای لێ بکات، کە لە ئاقار ناحەقدا بێ دەنگ بێ، یان مۆن‌و مرچ‌و بێ تام بێتە بەرچاوی خەڵکی، بەڵکو کەم دوێییەکەی لە بواری گێڕانەوەی زماندا بێ، لە قسەی خراپ‌و ناپەسەند.

٣/ نابێ کەم تێکەڵییەکەی بەشێوەیەك بێ، کە سەدان جۆرە ئیش‌و کاری خێرو چاکەی لەقیس بدات، کە بەبێ تێکەڵبوونی خەڵکی ناکرێن، وەك لابردنی زوڵم‌و خراپەو بێشەرعیی‌و چەسپاندنی بەرنامەی خوا، یاریدەدانی لێقەوماوان، سەردانی نەخۆش، مردوو ناشتن، بەشدارییکردنی شین‌و شادیی دۆستان...هتد.

خوێنەری سەنگین !

لەڕاستییدا ئەم خاڵی دوازدەیەمە، یەکجار گرنگ‌و کاریگەرە لە بەرەو خوا چوون‌و پێهەڵاچوونی ڕێبواری ڕێی خوادا، کەواتە، لەبەر کەم بایەخیی نەخراوەتە ئێرە، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو، کە بابای ڕێبوار کاتێك دەتوانێ: کەم خەوییی‌و، کەم خۆریی‌و، کەم دوێیی‌و، کەم تێکەڵیی، بەسەر تێرخواردن‌و، زۆر خەوتن‌و، زۆر دوان‌و، زۆر تێکەڵبووندا، هەڵبژێرێ، کە بەهۆی نوێژکردن‌و ڕۆژووگرتن‌و زیکرو قورئان خوێندن‌و پاڕانەوەو بیرکردنەوەو...هتدەوە، تا ڕاددەیەك دڵی ڕووناك بووبێتەوەو ڕووحی بەهێز بووبێ‌و، حاڵەتێکی وای بۆ ڕەخسابێ، کە تام‌و چێژ وەرگرتنی مەعنەویی، بەسەر تام‌و چێژ وەرگرتنی ماددییدا زاڵ بوبێت، بە واتایەکی دی: هەرچەندە ئەم مەسەلەیەی: کەم خۆریی‌و کەم خەوییی‌و کەم دوێیی‌و کەم تێکەڵییە، بە بەردی بناغەو بنچینەی دەروون پاککردنەوە (تزکیة النفس)و بەرزکردنەوەی دادەنرێ، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە، کە حاڵەتی ناوبراو ئەنجام‌و بەرهەمی ئەو شتانەی پێشەوەیە، خستمانە دوای ئەوانەوە، بەڵام ئامۆژگاریی خوێنەرە بەڕێزەکان دەکەم، کە زۆر وریابن! ئەو بیدعەت‌و هەڵەو ناشەرعییانەی، کە هەندێك لە ئەهلی طەریقەت، بەناوی خەڵوەکێشان‌و چلەکێشان‌و چی‌و چییەوە، دایانهێناون،

لەگەڵ ئەسڵی ئەم مەسەلەیەدا، کە شتێکی شەرعییەو بەڵگەی لەسەرە، لێیان تێکەڵ نەبێ‌و سەریان لێ نەشێوێ، کە نە بە هۆی (حق)ەوە (باطل) قبووڵ‌و، نە بە هۆی (باطل)ەوە (حق) ڕەفز بکەن‌و، ژیرانەو وردبینانە لە یەکیان جیا بکەنەوەو، هەر کامێکیان حوکمی خۆی بەسەردا بدەن.

**١٣- دۆستایەتیی و هاوەڵایەتیی کردنی ئینسانی صاڵح:**

یەکی دیکە لەو هۆیانەی، کە دەورێکی گەورەیان هەیە لە یاریدەدانی ڕێبواری ڕێی بەرەو خوا چووندا، بە توێشوویەکی یەکجار گرنگی ڕێی ناوبراو دادەنرێ، بریتیە لە نزیکییکردن‌و برادەرایەتییکردن لەگەڵ ئینسانی خواناس‌و پارێزکاردا، هەر بۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ}[1].

واتە: مرۆڤ لەسەر ئایینی خۆشەویستەکەیەتی، ئنجا با هەرکامتان سەرنج بدات دۆستایەتیی کێ دەکات!

دوایین پاڕانەوەی (یوسف)یش علیه السلام، ئاوایە: ﴿... أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ١٠١﴾ يوسف.

واتە: (ئەی خوایە!) بەس تۆ دۆست و سەرپەرشتیارمی لە دنیا و دوارۆژدا، ئنجا بە مسوڵمانەتیی بمرێنەو بە صاڵحانم بگەیەنە.

زانایانی پێشینمان خوا لێیان خۆش بێ، سەبارەت بە گرنگیی برادەرایەتییکردنی ئینسانی چاك، زۆریان گوتوە، بۆ نموونە گوتوویانە: سەرنج بدە ! چۆن مانگ، کە خۆی لە خۆیدا خڕۆکەیەکی تاریك‌و بێ شەوقە، لە بەرەکەتی برادەرایەتیی خۆردا، چۆن لە فەیزو بەخششی بەهرەمەند بووەو بۆتە چراخان !!

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٧٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالبَيْهَقِيُّ فـي (شعب الإِيْمان)، برقم: (٩٤٣٦) وَاللَّفْظُ لَهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَحَسَّنَهُ الألباني فـي (السلسلة الصحيحة) برقم: (٩٢٧).

هەروەها گوتوویانە: ئەوەندە بەسە بۆ سەلـماندنی گرنگیی هـاوەڵایەتیی چاکـان، کەسەگی برادەرانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف)، کە لە ماهیەتــدا هـیچ جیـاوازیی لەگەڵ سەگەکانی دنیادا نیە، بەهۆی نزیکیی لەو گەنجە خواناسو مەردانەوە، خوا لـە گەورەترین کتێبی خۆیدا ناوی هێناوەو باسی دەوری ئێشـکەگرتنی کردوە.

بەڵێ هـاوەڵایەتیی چاکـانو دۆستایەتیی کردنیـان، هۆیـەکی یـەکجار کاریگـەرو یاریدە دەرە، بۆ بەرچاوڕوونییو ورەبەرزییو تیژبوونەوەو پشــوو درێـژیی، ڕێبـوارانی ڕێـی خواناسی، هەر بۆیەش لە دێرزەمانەوە خاوەن دڵانی بێــدارو هۆشــیار ئایـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ التــوبة، یـــان کردۆتە شـیعاری خۆیـان !

بەڵام ئەوەی کـە گـرنگو پێویســتە، ئەوەیـە، کـە لـە تێگەیشــتنی مەعنــاو مەبەســتی:

(پارێزکاریی)و (لەگەڵ ڕاستان بوون)دا، بەهەڵەدا نەچینو، لەبەر تیشـکی قورئـانو سوننەتدا، لە ماناو چەمکی (مُتَّقي)و (صادق) حاڵی بین.

### ١٤- موتالاکـردن و ئاشنابوون بە ژیان و بەسەرهاتی صاڵحان و خواناسان:

هۆیـەکی دیکـە لەوانـەی، کـە دەورێکـی گـەورەیان هەیـە لـە (لـە خـوا نزیـك خســتنەوە)ی ئینســاندا، بریتـیە لە موتالاو سەرنجدانی ژیانو گوزەرانی بە قیمەتـی مەردانو شـێرە پیـاوو ژنـانی ڕێـی خواناسـی.

بەڵـێ... بەسەرهاتی (بۆ خوا ژیاوان) بە ئاسـمانی بەرزی مێـژووی خواناسـییەوە بۆ بابای مسـوڵمان، وەك ئەو ئەستێرە پڕشـنگدارانە وایـە، کـە لـە شـەوی تاریـكو تەڵەمـدا، بۆ بابای ڕێبـوار دەبنـە نیشـانەو دەلـیلو جێگـاو ڕێگـای خۆییـان پـێ دەدۆزێتـەوەو، ڕێـی لـێ تێك ناچێت، بەڵام گرنگ ئەوەیـە وردو وریـا بـێو، گوڵـە

ئەستێرەو[(١)] ئاورۆچکە، خۆی لێ نەکەنە مانگو ڕۆژو ئەستێرەو، بەدوای کڵاوی خوار نەکەوێ‌و، لە تەڵەو داوی ئینسانی زڕو نالەبار نەکەوێ!

ئنجا بۆ سەلماندنی گرنگیی شوێن پێ هەڵگرتنی صاڵحان، چەند دەقێکی قورئان بە نموونە دەهێنمەوە:

<u>یەکەم</u>: لە سوورەتی (الأنعام)دا خوای بەرزو مەزن، پاش گێڕانەوەی بەشێك لە بەسەرهاتی (ابراهیم) علیه السلام، بە ئیبراهیمەوە ناوی (١٨) کەسی لە پێغەمبەرانی پایە بەرز هێناوە، کە ئەمانەن:
(إبراهيم وإسْحاق ويَعقُوب ونُوح وَدَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ وأيّوبَ ويُوسُف وَمُوسَى وَهَارُون وَزَكَرِيّا ويَحيى وَعِيسَى وإِليَاس وإِسْمَاعِيل وَاليَسع ويُونس ولُوط) عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم، ئنجا پاش چەند ڕستەیەك فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ...﴿٩٠﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: ئەوانە کەسانێکن، کە خوا ڕێڕوونی کردوون، دەجا تۆش بەدوای ڕێبازی ڕوونی وان بکەوە..

وەك دەبینین خوای میهرەبان، ئامۆژگاریی پێغەمبەری هەڵبژاردە دەکات (صلی الله علیه وسلم)، کە ڕێوشوێنی بەرزی ئەو زاتە بەرزانە ڕەچاو بکات‌و، بیانکاتە سەرمەشقی خۆی.

<u>دووەم</u>: لە سوورەتی (هود)یشدا پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی هەرکام لە: (نُوح وهُود وصَالح وإِبْرَاهِيم ولَوط وشُعَيْب ومُوسَى) عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلاَم، دوای چەند ئایەتێك فەرموویەتی: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ...﴿١٢٠﴾ ﴾ هود.

واتە: لە هەواڵی هەرکام لە پێغەمبەران شتی وات بۆ دەگێڕینەوە، کە عەقڵ و دڵتی پێ دەچەسپێنین.

---

(١) گوڵە ئەستێرە: جۆرە زیندەوەرێکی باڵداری ڕووناك بەخشی لاوازو کەم تەمەنە، بەزۆریی لە کەشی بەهاردا دەبێ، لە شەوان دا دەردەکەوێ.

کەواتە ئاگاداربوونو شارەزابوون بە بەسەرهاتی خواناسان، مایەی[1] بڕوا زیادبوونو باوەڕ[2] پتەوبوونو، سەرەنجام دڵ چەسپانو دامەزرانە.

سێیەم: هەروەها لە کۆتایی سوورەتی (یوسف)داو، دوای گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ئەو زاتە بەرزە فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ... ﴿١١١﴾ ﴾ یوسف.

واتە: بە دڵنیایی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتیان دا، پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

کەواتە: مسوڵمانی خۆشەویستو بەڕێز!

کاتێکی چاك لە تەمەنت تەرخان بکە، بۆ خوێندنەوەو موتاڵای ژیانی خواناسان بەم شێوەیە:

١- پێغەمبەرانی خوا بەگشتیی (عليهم الصلاة والسلام).

٢- پێنج پێغەمبەرە زۆر خاوەن پێگەکان (نُوح، إِبْرَاهِيم، مُوسى، عِيسى، مُحَمَّد) بەتایبەتیی و، پێغەمبەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەتایبەتیتر.

٣- هاوەڵو شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، بەگشتیی، کە لە قورئانو سوننەتی ڕاست(صحيح)دا، بەسەرهاتەکانیان گێڕراونەوە، وەك بەسەرهاتی (مريم)و (أصحاب الكهف)و (طالوت)و (مؤمن آل فرعون)و (أصحاب القرية)...هتد.

٤- هاوەڵانی پێغەمبەرمان (رضي الله عنهم)، بەتایبەتیی چوار خەلیفە ڕاشیدەکان (أبوبكر و عمر و عثمان و علي).

٥- زاناو خواناسو ناودارانی مێژووی ئیسلام، هەر لە چاخی شوێنکەوتووان(تابعين)ەوە، تاکو ئێستا وەك: (الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ ، وَابْنُ سِيرِين، وَعُمَرَ ابْنَ عَبْدُالعَزِيز، سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَزَيْنُ العَابِدِين، وَإِبْرَاهِيم بن الأَدْهَم، وَجَعْفَر الصّادِق، وأَبُو حَنِيفَة، وَمَالِك، وَالشافِعِي، وأَحْمَد بْن

---

(١) بڕوا: (إيمان)ە.

(٢) باوەڕ: متمانە و (ثقة)يە.

حَنْبَل، والْحَارِث الْمحاسيي، وَمَعْرُوف الكَرْخِي، وَجُنَيد البَغْدَادِي، وَالغزَّالِي، وَالْجَيْلاَنِي، وَالعزّ بْن عَبْدُالسّلام، وَبهاءالدّين نقشبندي، وَجَلال الدّين الرومي، وَابْنُ تَيْمِيَة، وَابْنُ قَيّم الْجَوزية، والإمَام الرّبّاني، وصلاح الدين الأيّوبي، وَ وَلِي الله الدّهْلَوِي، وأمجد الزّهاوي، وَحَسَن البَنّاء، والنُورسي، وَأبو الأعلى الْمَودودي، وَسَيْد قُطب، وَمُحَمَّد إقبال، ...) خوا لە هەموو لایەکیان خۆشبێ‌و، پلەو پایەیان بەرزتر بکاتەوەو، ئێمەش هیدایەت بدات بۆ چاو لێکردنیان‌و بەهرە لێ وەرگرتنیان.

**١٥- پابەندیی تەواو بە ڕێو شوێنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم):**

لەڕاستییدا ئەم مەسەلەیەمان لەبەر کەم ئەمیەتیی دوا نەخست، بەڵکو ویستمان قورئان فەرموودەیی: (خِتامُهُ مِسك) بێ.

چونکە بەدڵنیاییی مەسەلەی پابەندبوونی ئینسان بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە، لە هەموو حاڵێکدا گەورەترین‌و گرنگترین‌و کاریگەرترین‌و، لە هەمان کاتیشدا قورسترین شتە لە ژیانیداو، ئەم مەسەلەیە هەموو ئەو مەسەلانەی، کە لە چواردە(١٤) خاڵی ڕابردوودا خرانە ڕوو، لەنێو خۆی وەردەگرێ.

ئنجا مسوڵمانی سەنگین !

وەك پێغەمبەری بەڕێزمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، زۆر بە بایەخ‌و گرنگیی پێدانەوە، پابەندی ڕێو شوێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەو، ددانی لەسەر ڕۆبگرە {عَضّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ}، چونکە هەموو ڕێ بەرەو لای خوا بەستراون‌و، هیچ ڕێیەك ناتگەیەنێتە دیداری خوا، بێجگە لە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری نەخوێندەوار، ڕووحم بە فیدای بێ، ئەمەی گوتیشم، قسەی گیرفانی خۆم نیەو، دەقی قورئانە: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٣١)﴾ آل عمران.

واتە: ئەی موحەممەد ! بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ‌و - حەز لە دیداری دەكەن - دوام بكەون، ئنجا خواش خۆشی دەوێن‌و لە تاوانەكانیشتان دەبووری...

بەڵێ، ئەو كەسەی دەیەوێ لە خوا نزیك بكەوێ‌و بە دیداری شادبێ، با خەت‌و شوێن پێی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگرێ‌و بەری نەدات، چونكە ئەو زاتە، ڕووحم فیدای بێت، دەلیلێكی كارامەو شارەزایەو، چۆتە خزمەت خواو گەڕاویشتەوە: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ ... ﴿١﴾ ﴾ الإسراء.

كەواتە: زۆر چاك دەزانێ بە كوێماندا بەرێ‌و، زۆرباش دەتوانێ ڕێگامان بۆ وەسف بكات‌و، سەر ڕاست‌و شارەزامان بكات‌و، مسۆگەر هەر كەسێك بەڕاستیی دامێنی بگرێ‌و خۆی تەسلیم بكات، ڕێی لێ ون نابێ‌و بە مەنزڵی دەگەیەنێ، خواش فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بێگومان بۆ ئێوە لە پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) سەرمەشقی چاك هەیە.

كەوابێ مسوڵمانی شیرین !

هەوڵ بدە پێغەمبەری پێشەواو ڕەندو ئاكار پەسندت: لە خواردن‌و خوردنەوەو، نووستنی‌و، قسەكردنی‌و، هەستانی‌و دانیشتنی‌و، ڕۆیشتنی‌و، چاك‌و چۆنیی‌و، بەرگ‌و پۆشاكی‌و، نوێژكردنی‌و، ڕۆژووگرتنی‌و، جیهادكردنی‌و، تووڕەبوونی‌و لێبووردنی...هتدیدا، چۆن بووە، تۆش وابە، چونكە بارتەقای ئەوە، كە وەك وی دەچی، بۆ لای وی دەچی[1]!! بەڵێ: شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاكترین‌و كاریگەرترین هۆی بەرەو خواچوون‌و لە خوا

---

(١) چاكترین سەرچاوە، كە من لێی بەهرەمەند بووبم، بۆ شارەزابوون بە خووو ڕەوشت‌و حاڵ‌و باڵ‌و وردو درشتی پێغەمبەری مەزن (صلى الله عليه وسلم)، كتێبی (الشفا)یە، كە (القاضي عياض) نووسیویەتی‌و لە چوار بەرگان دایەو (مُلاّ علي القاري)و (الخفاجي) شەرحیان كردوە.

نزیکبوونەوەیە، هەر بۆیەش خوای میهرەبان لە فەرموودەیەکی قودسیی دا فەرموویەتی:

{مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً، فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْب، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِل حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ، كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرهُ الّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيدَهُ الّتي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي أَعْطَيْتُهُ، وَلَئِن اسْتَعَاذَنِي لأعِيذَنَّهُ}[1].

واتە: بەندەی من هیچ شتێك لە من وەنزیك ناكەوێ، كە خۆشەویستتربێ لەلام، لەوەی لەسەرم پێویست كردووە، بەندەی من بەردەوام بەهۆی سوننەتانەوە لێم نزیك دەبێتەوە، هەتا خۆشمدەوێ، ئنجا ئەگەر خۆشمویست، دەبمە ئەو گوێیەی، پێی دەبیستێو، ئەو چاوەی، پێی دەبینێو، ئەو دەستەی، پێی دەگرێو، ئەو لاقەی، پێی دەڕوات و، ئەگەر داوای شتێكم لێ بكات دەیدەمێ و، ئەگەر پەنام پێ بێنێ، پەنای دەدەم!!

لەم فەرموودە بەرزو پیرۆزە، چەند شتێك وەردەگیرێن:

١- مرۆڤ لە هەموو شتێك زیاتر بە هۆی بەجێهێنانی فەرزەكانەوە، لە خوا نزیك دەبێتەوە، كەواتە: پێویستە ئەوپەڕی گرنگیی‌و بایەخ بە بەجێهێنان‌و پاراستنی فەرزەكان بداتو، هەتا شتێكی فەرز لەوێ بێ، خۆی بە سوننەتانەوە خەریك نەكات.

٢- هەركەسێك فەرزەكان بەتەواویی جێبەجێ بكات، دەم بۆ دەمێ پتر بەهۆی سوننەتانەوە لە خوا نزیك دەبێتەوەو دەیناسێ‌و پێی ئاشنا دەبێ، كەواتە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)، چاكترین هۆی خواناسین‌و بڕوا پتەو بوون‌و بەرەو خواچوونە.

٣- لە سۆنگەی ئەوەوە، كە (محمد) (صلى الله عليه وسلم) چاكترین‌و خۆشەویستترین بەندەی خوایە، مرۆڤ بەهۆی پابەندیی موو بە موو بە

(١) رَوَاهُ البُخَارِي برقم: (٦١٣٧).

سوننەتەکانیەوە، دەبێتە خۆشەویستی خواو، هەتا ڕاددەی پابەندیەکەی پتربێ، ئەندازەی خۆشەویستییەکەشی پتر دەبێ.

٤- کاتێك بەندە هێندە بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) پابەند بوو، کە ببێتە خۆشەویستی خوا، وای لێدێ دەبێتە دۆست (وَلِيِّ)ی خواو، ئەو کاتەش چاوو گوێو دەستو پێو باقی ئەندامە پەنهانو ڕواڵەتییەکانی، بەس بە فەرمانی خواو بەپێی ڕەزامەندیی وی دەجووڵێنو، هەموو دەمێ لەخزمەت خوادا دەبێ، هەر کاتێکیش پەنای بۆ بەرێ، پەنای دەداتو دەیپارێزێ.

## تەوەری هەشتەم:

### حەوت (٧) هۆکاری مەیدانی کاری ئیسلامیی:

مسـولْمانە بەڕێـزو شـیـرینەکـان !

خوا پشـتیوان بێ لەم خاڵی هەشتەمو کۆتاییەشــدا، حـەوت دانـە هۆکـاری دیکـەی گەورەو کاریگەری مەیدانی کارو چالاکی ئیسـلامیی، دەخەینە ڕوو، کە بەڕاسـتیی تـاوو تەئسـیـرێکی یەکجـار بەرچاویان هەیە لە صالْحـکردنـی ئینسـانو بەرەو خوا بردنیـدا، بەڵام بەکـورتیی ئاماژەیان پێ دەکەین، چونکە هەر کامێکـیان هەڵـدەگرێ، کـە کتێبـی تایبەتیی لەسەر بنووسرێو، لە شوێنی تەرخـانـکراودا باسو خواسی لەســەر بکرێ:

#### ١/ بانگـەواز (الدعوة):

خوای پەروەردگـار لەبارەی گەورەیی‌و بەرزیی خەڵـك بانگ کـردن بـۆلای خــواو، پایە بەرزیی بانگــەوازکارانەوە فەرمـوویـەتی: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ فصلت.

واتە: ئنجا کێ قسەی چاکتـرە لە هـی کەسـێك، کـە (خەڵـکی) بـۆ لای خــوا بانگـەواز دەکاتو، کردەوەی باش ئەنجـام دەداتو، دەڵـێ من لە مسـوڵمانـانم.

لەڕاسـتییـدا ئەم کـارە بەرزو پیـرۆزەی بانگەوازکردن، دەبێتە مایەی زیاتر لـەخۆ وریـابوونو وردبوونەوەی ئینسـان، نەبـادا شتێك بە خەڵك بڵـێ لـە کردنـی چاکــەو وازلـێـهـێنانی خراپە، کە خـۆی بەپێچـەوانەوە بێـتو، وەبـەر هەڕەشـەی: ﴿ ...لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الصـف، بکــەوێو، لەجیــاتی خێـر پـێ بـڕانو قازانجـکردن بەهـۆی بانگەوازەکەیەوە، لە سـۆنگەی قسـەو کـردەوە یەکــنەبوونەوە، قەرزداربـاریش ببێتەوە ! وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن

تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الصف، گوتنی شتێك، كه ڕەفتاری لەگەڵ نەبێ، لەلای خوا گەورەترین تاوانە، كە مایەی تووڕەبوونی خوایە.

دیارە هەر بۆیەش، کە خوای كاربەجێ لە ئایەتی (٣٣)ی (فصلت)دا یەكسەر دوا بەدوای ڕستەی: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ... ﴾دا فەرموویەتی: ﴿ ... وَعَمِلَ صَٰلِحًا ... ﴾.

**٢/ فێركردن (التعليم):**

دیارە مەبەستمان لە فێركردن ئەوەیە، كە ئینسان خەڵكی فێری هەر زانیارییەكی بەكەڵكو سوودبەخش بكات، كە بۆ دینداریی‌و دنیادارییان ئاتاجنی، بەتایبەت زانیارییەكانی شەرع (علوم الشرع)، واتە: ئەو زانیارییانەی لە وەحییەوە هاتوون و زانراون، ئەگەرنا هەموو زانیارییەكی سوودبەخش، شەرعییە.

ئاشكراشە، كە زانیاریی فێری خەڵككردنو، بەرچاو ڕوونكردنەوەو شارەزاكردنیان، یەكێكە لە چوار ئەركە بنەڕەتییەكانی پێغەمبەرمان (محمد) (صلی الله علیه وسلم)، كە لەنێو ئۆممەتیدا ئەنجامی داون، وەك پێشتر باسمان كرد: ﴿ ...يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ...﴿٢﴾ ﴾ الجمعة.

پێغەمبەری پایەبەرزیشمان (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی پلەی بەرزیی زانایانو زانست فێری خەڵكی كەرانەوە، فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە:

أ- {مَنْ دَعَا إِلَى هُدىً كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئاً}[1].

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٦٧٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٠٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٧٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَه، برقم: (٢٠٦)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (١١٢)، وَالدَّارِمِيُّ، برقم: (٥١٣) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

واتە: هەرکەسێك خەڵکی بەرەو هیدایەت بانگ بکات، بەئەندازەی پاداشتی هەموو ئەوانەی، کە شوێنی کەوتوون، پاداشتی هەیەو، هیچ لەپاداشتی ئەوانیش کەم ناکاتەوە.

ب- هەروەها فەرموویەتی: {فَضْلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ.. إِنَّ اللّٰهَ وَمَلائِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّماوَاتِ وَالأَرْضِ، حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا، وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِي النَّاسِ الخَيْرَ}[1].

واتە: پایەی زانا، بەسەر خواپەرستی بێ زانیارییدا، وەك پایەی من وایە بەسەر کەم پایەترینتاندا... بێگومان خواو فریشتەکانیو خەڵکی ئاسمانەکانو زەوییش، تەنانەت مێروولە لە کونەکەیداو، هەتا نەهەنگیش، صەڵەوات لەسەر ئەوانە دەدەن، کە چاکە فێری خەڵکی دەکەن.

ئنجا زانیارییو چاکە فێری خەڵك کردنو ڕێروونیی کردنیانو پەروەردەکردنو دەست گرتنیان بەرەو هیدایەت، کە هۆکارێکی یەکجار کاریگەرە بۆ تەزکیەبوونی ئینسانو، لە خوا نزیکبوونەوەی، پێچەوانەکەیشی، کە شاردنەوەی هەقو زانیارییە لە خەڵكو، سەر لێشێواندنیانە، بە بەراوەژووەو، خراپەو تاوانێکی یەکجار بێرەزاو فەوتێنەرەو، خاوەنەکەی لە دەریای تووڕەییو خەشمو قینی خوادا نوقم دەکات، خوا پەنامان بدات، وەك خوای دادگەرو تۆڵەستێن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ البقرة.

واتە: بێگومان کەسانێك، کە ئەوەی لە بەڵگە ئاشکرایەکانو هیدایەت ناردوومانەتە خوارێ، دوای ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوونمان کردۆتەوە، دەشارنەوە، ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەکاتو، هەرچی لەعنەتکەرە لەعنەتیان لێ دەکات.

---

(١) رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٨٥) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

### ٣/ دڵسۆزیی (النصیحة):

ساغییو دڵسۆزیی لەگەڵ خەڵکی، بەتایبەت لەگەڵ مسوڵمانانداو، نەبوونی کینەو غەرەزو حەسەدو ناپاکییو فێڵو فەرەج لەگەڵیان، یەکی دیکەیە لەو شتانەی، کە توێشووی ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون پێکدێنن، ساغو ڕاستبوونو دڵسۆزو بەپەرۆش بوونیش بۆ خەڵکی، یەکێکە لە خەسڵەتە بەرزو بەرجەستەکانی پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خوا (عَلَيهم أفضل الصلاة وأتم التسليمات) ئەوەتا هەر کام لە: (نوح، هود، صالح، شعيب) عليهم السلام لە ئایەتەکانی ژمارە (٦٢، ٦٨، ٧٩، ٩٣)ی سوورەتی (الأعراف)دا، بە (ناصح)و خاوەن (نُصح) خۆیان بە گەلو کۆمەڵەکەیان ناساندوە.

پێغەمبەری کۆتایی پێغەمبەرانیش (صلى الله عليه وسلم)، سەرتاپای ئایینی خوا لە (نصيحة)دا کورت دەکاتەوە، وەك فەرموویەتی: {الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ ؟ قَالَ: لِلَّهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَعَامَّتِهِمْ}.

واتە: ئایین (مەبەست دینداریی‌و بەڕێوەبردنی ئیسلامە، کە تاکە ئایینی دانپێداهێنراوی خوایە لەم ڕۆژگارەدا)، ساغییو دڵسۆزییە[1] گوتمان: بۆ کێ؟! فەرمووی: بۆ خواو، بۆ کتێبەکەیو، بۆ پێغەمبەرەکەییو، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانو بۆ تێکڕایان[2].

شایانی باسیشە، کە دڵسۆزییو پەرۆشو چاکییو ساغیی لەگەڵ خەڵکیدا، بەرهەمی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خوادا، ڕاستبوونە، وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿... فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ...﴾ الأنفال.

واتە: ئنجا پارێزکاریی لەگەڵ خوا بکەنو، نێوانی خۆتان چاك بکەن.

---

(١) وشەی (النصیحة) بە پێچەوانەی حاڵیبوونی زۆر کەسەوە، بە مانای ئامۆژگاریی (موعظة) نیە، چونکە ئامۆژگاریی خواو کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی ناکرێ، بەڵکو وەك نووسیومانە بە مانای (دڵسۆزیی) یان (ساغیی) دێت.

(٢) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٥) عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

(شێخ عبدالقادر)ی گەیلانییش گوتوویەتی: {دینداری لە دوو شتاندا کورت دەبێتەوە: (صدقٌ مع الحقِّ و خُلُقٌ مع الخَلْقِ) ڕاستیی لەگەڵ خواو چاکیی لەگەڵ خەڵك}.

### ٤/ دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی لەپێناو خوادا (الموالاة والمعاداة في الله):

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو شتانەی، کە توێشووی سەفەری بەرەو خوا چوون پێکدێنن‌و، ئینسان صالح دەکەن‌و بەرەو هەواری خوا بەیەکگرتن‌و بەندایەتیی بۆ خوا کردنی تێرو تەواوی دێنن و، بێگومانیش ئەم خەسڵەتە بە سەنگی مەحەکی دینداریی‌و مسوڵمانەتیی دادەنرێ‌و، بەبێ ئەم، مەحاڵە تەزکیەی نەفسی سەربگرێ‌و، درەختی لەگەڵ خۆدا تێکۆشان (مجاهدة النفس) بەربگرێ، چونکە قەت ناگونجێ ئینسان بەڕاستیی خواو پێغەمبەرەکەی لە هەموو کەس‌و هەموو شتێك خۆشتر بوێن، کەچی دۆست‌و خۆشەویستەکانی ئەوانی لەلا بەڕێزو خۆشەویست نەبن‌و، لەسەریان نەکاتەوەو پشتیان نەگرێ‌و، ڕقی لە دوژمن‌و ناحەزەکانیشیان نەبێ‌و، بەربەرەکانێتیی‌و دژایەتییان نەکات.

أ- خوای زانا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ المائدة.

واتە: ئەوانەی کافر بوون لە بەنی ئیسرائیل، لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی مەریەم لەعنەتیان لێکرا، ئەوەش لە سۆنگەی سەرپێچیی کردنیان‌و دەستدرێژیی کردنیانەوە، ئەوان دەستیان لە خراپەیەك، کە دەیانکرد،

هەڵــنەدەگرت، ئـەوەش خراپتــرین شــت بــوو، کــە دەیانــکرد. زۆریــان دەبینــی دۆستایەتیی ئەوانەی کافرن، دەکەن! خراپتـرین شـتێك کـە نەفسـیان بۆیـان پـێش دەخات، ئەوەیە کە خوا لـێیان توورەیەو لە ئازاریشـدا دەمێننەوە، ئەگـەر هــاتباو ئیمانیان بە خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و ئـەوەی بـۆی نێرراوەتـە خـوار، ببــووایە، ئەوان ئەو (کــافرانە)یان بەدۆســت نـەدەگرتن !، بـەڵام زۆرێکــیان لــە ڕێ دەرچوونە.

ب- هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ ....﴿٤﴾﴾ الممتحنة.

واتە: بەڕاستیی سەرمەشقییەکی چاك بۆ ئێوە لە ئیبـڕاهیمو ئەوانەدا کە لەگەڵی بوون، هەیە، کاتێك بە گەلەکانیان گوت: ئێمە دوور (بـريء)یـن لـە خۆتـانو لـەو شـتانەی، کە جگـە لە خوا دەیانپەرسـتن، بڕوامـان پێتــان نیــەو، دوژمنایــەتییو کینەیەکی یەکجارەکیی لە نێوانماندا ئاشکرا بووە، هەتا تەنیا بڕوا بەخوا دێـنن (کـە تاکە پەرسـتـراوتانە).

ج- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویــەتی: {أَوْثَقُ عُرَى الإِسْلامِ: الْحُبُّ فِي اللّٰهِ وَالْبُغْضُ فِي اللّٰهِ}[1].

واتە: قایمـتــرین قوڵــفەی ئیســـلامیەتیی: لەبـەر خـوا (خـەڵکی دینـدارو چـاك) خۆشـویسـتنو، لەپێنـاوی خـوادا (خەڵـکی بێ دیـنو خـراپ) بوغـزاندنە.

د- هەروەهــا فەرموویەتی: {الرَّجلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ}[2].

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٥٤٧)، وَالبَيْهَقِي فـي (شعب الإيْمان)، برقم: (١٣)، وغيرهم عَـنِ الْبَـرَاءِ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهُ، وَهُوَ حَسَنٌ بِمَجْمُوعِ طُرُقِهِ، وَحَسَّنَهُ الألباني فـي (صحيح الجامع) برقم: (٢٠٠٩).

(٢) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٨٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٣٧٨)، وَقَالَ: حَسَـنٌ غَرِيـبٌ، وَالبَيْهَقِـيُّ فــي (شعب الإِيْمَان)، برقم: (٩٤٣٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

واتە: ئینسان لەسەر ئایینی دۆستەکەیەتی، ئنجا با هەر کامێکتان سەرنج بدات! داخۆ لەگەڵ کێ تێکەڵ دەبێ‌و دەیکاتە دۆست !

**٥/ فەرمان بە چاکە کردن و ڕێ لە خراپە گرتن:**

ئەمیش، کە یەکێکە لە نیشانەو دروشمە سەرەکییو مەزنەکانی ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم)و، لە چەندان جێگای قورئانیدا باسی پلەو پایەی بەرزی کراوە، هۆکارو فاکتەرێکی دیکەی یەکجار کاریگەری تەزکیەبوونی ئینسانو کاملبوونی ئیمانو، تۆکمەو توندو تۆڵبوونی کۆمەڵگای مسوڵمانو، بژارکردنی چینو توێژەکانیو، پێکەوە جۆشاندنی ڕیزەکانیەتی.

أ- خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: با کۆمەڵێکتان هەبێ (یان کۆمەڵێك بن) بانگەواز بۆ چاکە بکەنو، فەرمان بە هەر شتێکی پەسەندو، ڕێگریی لە هەرشتێکی ناپەسند بکەن و، هەر ئەوانیش سەرفرازن.

ب- پێغەمبەری پێشەوامان فەرموویەتی (صلی الله علیه وسلم): {كَلاَّ، وَاللّٰهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَلَتَأْخُذُنَّ عَلَى يَدِ الظَّالِمِ، وَلَتَأْطِرُنَّهُ عَلَى الحَقِّ أَطْرَاً}[1].

واتە: نەخێر بەخوا دەبێ فەرمان بە چاکە بکەنو، قەدەغەی خراپە بکەنو، دەستی ستەمکار بگرن و، بیگێڕنەوە سەر هەقێ بە گێڕانەوەیەکی چاك.

دیارە هەویری توێژینەوەی: (فەرمان بە چاکەکردنو ڕێ لە خراپە گرتن) ئاوی زۆری دەوێو، پێویستیی بە شوێنێکی تەرخانو تایبەت هەیە[1].

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٣٣٦)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤٠٠٦)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٠٤٧) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيب عَلَى أنَّ سَند الحَدِيث مُنْقَطِعٌ، هَذَا لَفْظ أَبِي دَاوُد، وَضَعَّفَهُ الألباني في (السلسلة الضعيفة)، برقم: (١١٠٥).

### ٦/ كـۆچ كـردن (الهجرة):

لـە پێنـاوی خوادا بەجێهـێشـتنی ماڵو حـاڵو، دووركەوتنـەوە لـە نیشـتمانو خزمو ئاشنایان، كە یەكێكە لە بنەماكانی ڕێبازو ڕێـوشـوێنی پێغەمبـەران (علـیهم الصلاة والسلام)، بەمەرجێـك هـەلـومەرجە شـەرعییەكـانی تیێدا ڕەچـاو بكـرێن، دەرسێكی گـەورەو گرنگـی دینـداریی‌و، فـاكـتەرو هۆیـەكی بەرهەمـداری نـەفس پاكـبوونەوەو لە خوا نزیكـبوونەوەی ئینسـانە، خـوای پەروەردگـار فەرموویـەتی:

﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾﴾ النساء.

واتە: هەر كەسـێك لە ڕێـی خـوادا كۆچ بكـات، ئـەوە لـە زەویـدا هۆكارەكـانی لووت شكـاندن (ی ناحەزان)و فراوانیی (جێگـاو ڕێگـاو بژێوی) دەسـتـگـیـر دەبـێ و، هەر كەسـێك بە كۆچـكردوویی بـەرەو لای خـواو پێغەمبەرەكـەی لـە ماڵـەكەی بچێتـە دەرێ، ئنجا مردنی بگـاتە سـەرێ، بێگـومان پـاداشـتی لەسـەر خوایـەو، خـواش لـێبـوردەی بە بەزەییە.

---

(١) هـەم باسی ناوبراوو، هەم مەسەلەی (دۆسـتایەتیی‌و دوژمنایەتیی)و (بانگەواز)و سەرجەم ئەم بابەتانـەی پەیوەستن بە كارو چالاكی ئیسـلامییەوە، خوا یـاربێ لە دوو توێـی كـتێبێـكـدا كـە لـەبارەی {كـاری ئیسـلامیی‌و سیاسەتی شەرعیی}یەوە لەبەردەست دایە، دەخرێتـە ڕوو - إن شـاء الله تعالـی -.

ئێسـتاش (٢٣-٢٠١٢/١/٢٤) ز دەڵـێم:

سـتایش بۆ خوا كە سـەرجەم ئـەو بابەتـانەو هـی دیكـەش لـە كـتێبـی: (ڕوونكردنـەوەی: بنـەما شـەرعییەكانو هـێڵـە گـشـتییەكانی كۆمەڵـی ئیسـلامیی)دا، خرانە ڕوو، هەروەهـا كتێبـی: (چەنـد بابەتێـكـی سـیاسـی هاوچـەرخ لەبـەر تیشـكی عەقـڵو وەحیـی دا)، دیسـان چەنـد مەسـەلەیەكی گرنگـی ئەو بـوارەی گرتوونە خـۆی.

ئێسـتاش (٢٠٢٠/٩/٣٠ز – ١٤٤٢/٢/١٣ك) دەڵـێم:

سـتایش بێ پایان بۆ خوای بەخشەر، لە هەركام لـە: {مەوسـووعەی: بیركردنـەوەی ئیسـلامیی لـەنێوان وەحیی و واقیع دا} كە پێنج كتێبەو، {مەوسووعەی: بـەرەو باشـتر تێگەیشـتن و پێگەیشـتن} كـە دازدە كتێبە، تێكڕای ئەو بابەتانەو هی دیكەش، زۆر باش توێژراونەوە.

بەڵام مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ هەیە، لەمەڕ کۆچکردنو ئاوارەییەوە لەپێناوی خوادا، نابێ فەرامۆش بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە:

نابێ کۆچکردن پاساو (مبرِّر)و پەردەیەك بێ و، ڕاکردنو هەڵاتنی لەژێردا شێرابێتەوە، چونکە هەموو لە ماڵ دەرچوونو نیشتمان بەجێهێشتنێك، مەرج نیە بە کۆچ (هجرة) لەقەڵەم بدرێ.

سەرنج بدە! چۆن خوای زانای ئاشکراو پەنهان، ماڵو حاڵو نیشتمان بەجێهێشتنی کۆمەڵێکی بە هەڵاتنو ڕەفتارێکی ترسنۆکانە داناوەو فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟ ...﴿٢٤٣﴾ ﴾ البقرة. هەر بۆیەش، مەگەر چۆن، دەنا خوای کاربەجێ، کۆچکردنو جیهادکردنی هەر پێکەوە باسکردوون، کەواتە دەبێ کۆچکردن، جەنگو جیهادی بەدوادا بێتو، بەدوای یەکدا هاتنی کۆچو جەنگ (الهجرة والجهاد)یش چاکترین بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ئەوە، کە ماڵو حاڵ بەجێهێشتنەکە، هەڵاتنو خۆشاردنەوەو خۆ قوتارکردن نیە.

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ﴾ البقرة.

واتە: بێگومان کەسانێك، کە ئیمانیان هێناوەو، ئەوانەی کە لەڕێی خوادا کۆچیان کردوەو جیهادیان کردوە، ئەوانە بە ئومێدی بەزەیی خوانو، خواش لێبوردەی بە بەزەییە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَـٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾ النحل.

واتـە: پاشـــان بێگـــومان پەروەردگـــارت بـۆ کەســـانێك، کـە پـاش ئـازاردانو نارِەحەتـــکران، کۆچـیان کـردوە، دوایـــی جەنگـــاونو خـۆڕاگر بـوون، مســـۆگەر پـەروەردگـارت پـاش ئەم شـتانە (لەگەڵـیان) لـێبوردەی بە بـەزەییـە.

٧/ جـەنگ کـردن (الجـهاد):

ئەمیـش، کە قۆنـاغی کۆتایی کارو چالاکیی حاڵەتـی پێـش دەوڵــەتی کۆمـەڵی مسـوڵمانەو، لووتکەی هەرە بەرزی ئیسـلامەتییـــە، گـەورەترینو کـــاریگەرترین(١) هۆکـارو فاکتەری تەزکـیەی نـەفسو، پـەروەردەو پـــالاوتنی کـــۆمەڵو کۆمەڵگـــای مسـولْمـانیشـە.

بەڵـێ لەڕاسـتییدا جـەنگو جیهـادکردن لـەپێناوی خـوادا، کوورەیـەکی هێنـــدە بەتینـــە، هـــەرچی ژەنـــگو ژارە لـــە دڵو دەروونـــی ئینســـانـــدا لای دەبـــاتو، بۆتەیەکـە، بە شـێوەیەك کـۆڕو کـۆمـەڵی مسـوڵمـان قاڵ دەکـــاتەوەو لــە مەحـەك دەدات، کـە هەرچـی خەڵـــکی دڵ نـەخۆشو ئیمـان لاوازو دەغـەڵو پۆخـەڵ لـەنێو ڕیزەکانیاندا هەیە، کەشفیان دەکاتو پەردەیـان لەسـەر هـەڵـدەماڵـێو ئـابڕوویـــان دەبـات.

هەر بۆیەش یەکـێك لـە ناوەکـانی سـووڕەتی (التوبـة)، کـە باسـی ڕووداوەکـانی جەنگی (تبوك) دەکات، بریتیە لە (الفاضحة) ڕیسـواکـەر.

ئنجـا ئەهلـی عیـرفانو تەزکیە، تێکڕا لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە بـابـای ڕێبوار (سالِك)ی ڕێـی بەرەو خوا چوون (طريـق السَّير إلـى الله)، هـەتـــا دوارِۆژو بەهەشـــت بەسەر ژیـانی دنیادا هەڵـنەبژێرێو، ژیانی پێنجو دوورۆژەی دنیـا بەکـەم نەگرێ، لـە بـواری تەزکیـەی نەفسدا هیچی بۆ بە هیچ ناکرێو، داری پێ لەسەر بـەرد دانـانرێ، دەجا خـوای پەنهـانزانیش بـە ڕاشـکـــاویی ڕایـگــەیاندوە، کـــە هـەموو ئەوانـەی ئامادەیی جەنگو جیهـادیـان نیـــە لـەڕێـــی خـــوادا، لەبـەر ئەوەیـە، کـــە ژیـانو

(١) مەبەست لەو هۆکارو فاکتەرانەیە، کە بە کۆمەڵ دێنە دی، چونکە زانایان نوێژ بە گەورەترین خواپەرستیی شەخصییو تایبەتییو، جیهادیش بە مەزنتـرین جۆرە خواپەرسـتیی گشـتییو بە کۆمـەڵ دادەنێـن.

گوزەرانی کەم‌و کورت‌و کەم بایەخی دنیایان پێ چاکتـــرەو، بەســەر بەهەشـتی ڕازاوەو نەبڕاوەدا هەڵیانبـژاردوە، وەك فەرمووییـەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ التوبة.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەوە بۆچی کـاتێك پێتان دەگـوترێ لەڕێـــی خوادا بجەنگـن خۆتانتان بە زەوییەوە چەسپاند! ئایا ژیانی دنیاتان پێ باشتـرە لە هـی دواڕۆژ؟ جا بێگـومان ژیـانی دنیـا لەچـاو هـی دواڕۆژ بەس شـتـێکی کەمـە.

کـەواتـە:

با ئەوانـەی بەنـاوی طەریقـەت‌و عیـرفانەوە، واگومان دەبەن، کە جەنگ‌و جیهادو چەك هەڵـگرتن‌و، خۆ بەکوشتـدان‌و خەڵـك کوشتن، پێچـەوانەی تەزکـیـەی نەفـس‌و صـاڵح بوون‌و بەرەو خوا چوونـە !! ئاگـادار بن، کە زۆر خراپ بەهەڵەداچوون‌و ڕاسـت بە پێچەوانەوە، هۆکـارێکـی یەکـجار گەورەو کاریگەری تەزکـیـە، جەنگ‌و جیهادەو، لە گەرمەی جیهاددا مسـوڵمـانـان پـاڵاوتە دەبـن: ﴿ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... ﴿١٤١﴾ ﴾ آل عمـران، تەنیـــا کەسـانێکـیــش دەتــوانن لەڕێـــی خــوادا بجـەنگـــن‌و بکـوژرێن، کە بەڕاستیی بۆ خوا سـاغ‌و یەکـلابووینەوەو، بەشی دنیاو شەیطانیان پێوە نـــەمابێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَ ... ﴿١١١﴾ ﴾ التوبة.

واتە: بێگـومان خوا گـیان‌و سامانی لە بڕواداران کڕیـوە، کـە بەهەشـتیان هـەبێ، لەڕێـی خـوادا دەجەنگـن‌و دەکـوژن‌و دەشکـوژرێن...

ئنجا خوێنەری سەنگینو شیرین !

ئێستا ستایش بۆ خوای خاوەن هەموو چاکەو نیعمەتێك، کە لە هەشت تەوەردا، سەرجەم پەنجاو دوو (٥٢) هۆکارو ئامرازی پێ صالّح بوونی ئینسانو، بەرەو خواچوونمان نووسی، کۆتایی بەم بەشی سێیەمەی ئەم کتێبە دێنین، کە پێم وایە وەك چۆن لە ڕووی قەبارەوە گەورەترین بەشە، لە ڕووی نێوەڕۆکیشەوە گرنگترینیانە.

بەلّام بە پێویستی دەزانم لە کۆتایی ئەم بەشەدا، ئەم حەوت ئاگاداریی و ڕوونکردنەوەیەش بە کورتیی و گوشراویی بخەمە ڕوو، کە کەمو زۆر پەیوەستن بە هۆکارەکانو چۆنیەتی نەفس تەزکیەبوونو بەرەو خوا چوونەوە:



## حەوت ئاگاداریی و ڕوونکردنەوەی گرنگ

**یەکەم**: زانایانی پسپۆڕ لە تەزکیەی نەفس دا – بەتایبەت ئیمام موحەممەدی غەززالی، خوا لێی خۆشبێ – گوتوویانە:

چوار وشە هەن لە قورئانێ دا، ناون بۆ یەك حەقیقەت، ئەویش ئەو جەوهەرە مەعنەویی و نابەرهەست و ناماددییەیە، کە کاکڵ و نێوەڕۆکی ئینسانی تێدا شێردراوەتەوە، جەستە لەچاو وی وەك پۆشاك و توێکڵ و دیکۆر وایە، بەڵام هەرکام لەو چوار وشانە، وەسفی لایەنێکی ئەو حەقیقەتە دەکەن، ئەوانیش ئەمانەن:

١/ (روُح) گیان.
٢/ (قَلْب) دڵ.
٣/ (نَفْس) دەروون.
٤/ (عَقْل، فُؤاد) عەقل.

١- ئنجا هەرچی وشەی (روُح)ە، ئەوە ناوی تایبەتیی و (عَلَمْ)ی ئەو حەقیقەتە مەعنەوییەیە، هەربۆیەش وەك نهێنییەکی نەزانراو وەسف کراوە:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: لەبارەی ڕووحەوەش لێت دەپرسن، بڵێ: ڕووح لەکاری پەروەردگارمەو، کەمێکیش نەبێ زانیارییتان نەدراوەتێ.

٢- وشەی (قَلْب)یش تەعبیر لە لایەنی (هەست و سۆز و ویستن و نەویستن)ی گیان دەکات، ئەو دڵە مەعنەوییەش، کەم و زۆر، پەیوەندیی بە سینە و دڵی گۆشتینەوە هەیە، بەڵام نازانین چۆن؟

٣- وشەی (نَفْس)یش وەسفی ڕووحە لەو ڕووەوە، کە پەیوەندیی بەجەستەو داخوازییو غەریزە سروشتییەکانیەوە هەیە.

٤- وشەی (عَقْل، فُؤاد)یش تەعبیر لە حاڵەتی بیرکردنەوەو خەیاڵو خولیاکانی ڕووح دەکات، شایانی باسیشە، کە ڕووح بەبێ جەستەش دەگونجێ هەبێ، بەڵام نەفسو دڵو عەقڵ، پەکیان لەسەر هەبوونی جەستە کەوتوە، واتە (گیان) دەگونجێ بوونێکی سەربەخۆ (مستقلّ)ی هەبێ، بەڵام سێیەکەی دیکە وانیین.

**دووەم:** دڵی ساغ (قلب سليم) تاکە دەستمایەیە، کە لە ڕۆژی دواییدا فریای ئینسان دەکەوێو، دەبێتە هۆی لە دۆزەخ قوتاربوونیو بە بەهەشت شادبوونی، وەك خوای کاربەجێ فەرمووویەتی: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء.

واتە: ئەو ڕۆژە کە سامان و کوڕان سوود ناگەیەنن-بەهیچ کەس-، مەگەر کەسێك بە دڵێکی ساغەوە هاتبێتە لای خوا.

بێگومان دڵی ساغ، نیشانەی زۆرن، کەواتە بۆ ئەوەی هەرکامێکمان، تارادەیەك ئاگاداری ساغییو نەساغیی دڵمان بین، با چەند دروشمو نیشانەیەکی دڵی ساغ بخەینە ڕوو، ئەگەرچی بەکورتییش بێ:

١- لە دڵدا چەسپانو دەمەزرانی خوا بەیەکگرتن (التوحيد)، کە بە تاكو پاكو بێ وێنە دانانی خوایە، بە دڵو دەروونو بە زمانو بە کردەوە لە پەروەردگارێتیی (الربوبية)و پەرستراوێتیی (الألوهية)و ناوو سیفەتەکانیداو، خۆ بە دوور گرتنە، لە هەموو جۆرو شێوەکانی کوفرو شیركو نیفاقو سەرپێچیی.

٢- تامو چێژ وەرگرتن لە نوێژو ڕۆژوو زیکرو قورئان خوێندنو پاڕانەوەو...هتد.

٣- هەستکردن بە تاڵییو ناخۆشیی هەر گوناحو خراپەیەك، هەرچەندە گچکەش بێ.

٤- نیشـانەیەكی دیكـەی دڵی سـاغ ئەوەیە، كـە ئینسـان بەگشـتیی تـەنیایی پـێ خۆشـتـر بێت لە تێكەڵـبوونی خەڵك، مەگەر لە كـاتی ئەنجامـدانی ئـەو ئـەرك‌و كارە خێرانەدا، كە پەكیان لەسەر تێكەڵـبوونی خەڵكی كـەوتوە، وەك: بانگـەواز، فەرمان بە چاكەكردن‌و نەهی لە خراپەكردن، جیهـاد.

٥- پاكیی دڵ لە بوغزو غەرەزو ئێرەیی (حسـد)و، بە سووك سەیركردنی خەڵكـی.

٦- بەزەییی‌و پەرۆش‌و دڵ پێ سووتان، سـەبارەت بـەو كەسـانەی، كـە ئـازاری دەدەن‌و خراپەی لەگەڵدا دەكەن، هەروا دوعا بۆ كردنیان‌و، داوای شیفاو چـاكـبوونەوە بـۆ لە خوا كردنیـان.

٧- خۆشـویسـتن‌و دۆسـتایەتییـكردنی بـڕواداران‌و، بوغزانـدن‌و دوژمنایەتییكـردنی بێبڕوایـان، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بـە قـایمترین قوڵفـەی بـڕوا (أَوْثَـقُ عُـرَى الإِيْمَـانِ)ی لـەقەڵـەم داوە.

ئەمانە حەوت نیشـانەو بەڵگەی بنچینەییی‌و بەرچاوی، دڵی سـاغ‌و سـەلیمن، خـوا بەقسـمەتمان بكات‌و لە فەیزو بەخششـی خۆی بۆمان زیاد بكات.

سێیەم: ئینسـان ئەگـەر بیـەوێ بەرەو خواناسین‌و بە دیدار شادبوونی خـوا (لـقاء الله) ڕێ بگرێتە بـەر، نابـێ جگـە لـە ناسـینی خـواو، پەیـبـردن بـە سـیفەتە بـەرزو پەسندەكانی‌و، لـێ نزیكـبوونەوەی‌و ئەو شتانەی، كە پاشكۆی ئەوانـەن، وەك چـوونە بەهەشت‌و، چەپاڵـە دران لە دۆزەخ، هیچ نیـازو مەبەسـتێكی دیكـەی هەبێـت، تەنـانەت نابێ مەبەستی لەو بەرەو خوا چوونە (بووژاندنەوەی ئیسـلام)یـش بێـت![1] چونكە نەفس‌و شەیتان لە پەنـای ئەو جۆرە مەبەست‌و ئامانجە بەرزو پاكانەدا، گـەراو توخمی دەیـان جـۆرە نەخۆشـیی پیـس‌و كوشـندە دادەنێـن.

---

(١) مەبەست ئەوە نیە كە مسوڵمان خـەم لـە ئـایین‌و بەرنامـەی خـواو، چەسـپاندنی لـە ژیـان‌و گـوزەرانی كۆمەڵـگـادا نەخوات، بەڵكو مەبەسـت ئەوەیـە، كـە نابـێ ئـەو مەسـەلەیە بێتـە هـاندەرو پاڵـنەری بەندایەتیی بۆ خوا كردن‌و پەرستنی، چونكە بەندایەتیی بۆ خوا كردن، خۆی لە خۆیـدا بەرزترین مەبەستەو، ناكرێ بكرێتە ئامرازو پەیژە بۆ جگە لە خـۆی.

**چوارەم:** بۆ قبووڵبوونو وەرگیرانی هەرکارێکی خێرو چاکە، سێ مەرج پێویستن:

١- بەس خوا مەبەست بوونو ڕیا تێدا نەبوون (عدم وجود الرياء).

٢- هەست نەکردن بە خۆپەسندیی (عدم الإحساس بالعجب).

٣- دووربوون لە داهێنان (الإبتعاد عن البدعة) لە بواری بڕواو عیبادەتدا.

بەڵێ... خوا پێ مەبەست بوون (الإخلاص)و بە شانو شەوکەتی خۆنەنازینو، هەموو شتێك لە خوا زانینو، شوێن پێ هەڵگرتن (اتِّباع)ی شەرع، سێ مەرجی بنەڕەتیین، بۆ وەرگیرانی هەرکارێکی چاكو، بە نەبوونی هەر کامێکیان، ئینسان ڕەنج بە خەسار دەبێو، دەبێتە سەپانی پووشێ، بە واتایەکی دیکە: (رياء)و (عُجْب)و (إبتداع) سێ کرمو میکرۆبی پیسن، هەر کامێکیان - چ جای هەرسێکیان - بکەوێتە هەر کارێکی خێرەوە، وەك شیری هەڵگەڕاوو، گەنمی سنو کوێرو لێدراویی لێ دێتو، خاوەنەکەی ڕەنجەڕۆ دەبێت.

**پێنجەم:** هەر کاتێك ویستت بزانی داخۆ لەلای پەروەردگار چۆنی؟ ڕامێنە بزانە ئەو لەلای تۆ چۆنە، چونکە ئەو لەلای تۆ چۆن بێ، تۆش لەلای وی ئاوای.

کەوابێ:

١- تۆ چەندەت خوا لەلا بەقەدرە، ئەویش هێندە قەدرت دەگرێ.

٢- تۆ چەندەت ئەو خۆشدەوێ، ئەویش هێندە.

٣- تۆ چەندە بەتەنگ ڕەزامەندیی ویەوە بی، ئەویش هێندە.

٤- تۆ چەندە خێرایی دەکەی لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوادا، ئەویش هێندە لوتف دەنوێنێ، لە وەڵامدانەوەی داواکانتدا.

٥- تۆ چەندت ئەو لەیادە، ئەویش هێندە: ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ...﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة.

٦- تۆ چەندە لەسەر وی تووڕە دەبی، ئەویش هێندە: ﴿ ...إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ ...﴿٧﴾ ﴾ محمد.

٧- تۆ چەندە عادەتی خۆت بۆوی تێکدەدەی، ئەویش هێندە (خرق العادة)ت بۆ دەکات، سەرنج بدە! چۆن عادەتی سووتاندن (إحراق)ی لە ئاگردا نەهێشت بۆ (إبراهیم الخلیل).

٨- تۆ چەندە پشتی پێ ببەستیو تێیڕاببینی، ئەویش هێندە پشتت دەگرێو بەدەنگتەوە دێ.

٩- تۆ چەندە چاکەی لێ چاوەڕوان بکەی، ئەویش هێندەت چاکە لەگەڵ دەکات.

ئەمانەش هەموویان لە ڕستەی: {أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي..}[1]، دەفامرێنەوە، کە بوخاریی گێڕاویەتەوە.

بەڵام لێرەدا دەبێ دوو شتمان لەبیر نەچن:

أ/ چەندە خوا بناسی، ئەوەندەش لێی دەترسیو، خۆشتدەوێو، گومانت بەرامبەری چاك دەبێت، چەندەش خۆشتبوێو لێی بترسیو گومانی چاکی پێبەری، ئەوەندەش بەندایەتیی بۆ دەکەی، وەك زانای ناودار (الحسن البصري) گوتوویەتی: {لَوْ أَحْسَنُوا الظّن لأَحْسَنُوا العَمَل}[2]. واتە: ئەگەر گومانیان باشبووایە، کردەوەی چاکیان دەکرد.

ب/ (چەندە)ی تۆو (ئەوەندە)ی وی، یەکسان نینو پێکەوە ناخرێنە تەرازوویەکەوە، بەڵکو (چەندە)ی تۆ لەقەدەر خۆتەو (ئەوەندە)ی ویش لەقەدەر وی! هەربۆیەش خوا لە فەرموودەی قودسییدا فەرموویەتی: {وَإِذا أَقْبَلَ إِلَيَّ يَمْشِي أَقْبَلْتُ إِلَيْهِ أُهَرْوِلُ...}[3]. واتە: ئەگەر بە ڕۆیشتن بۆ لام بێ، بە ڕاکردن بۆ لای دەچم.

<u>**شەشەم**</u>: ڕێی بەرەو خواچوون کۆتایی نیە، چونکە خوا بێ سنوورە، دیارە دەریای ناسینیشی بێ سنوورەو، (کامڵ بوون)ی مرۆڤیش شتێکی ڕێژەیی (نسبيّ)یە،

---

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (٦٩٧٠)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٦٧٥).

(٢) فيض القدير على الجامع الصغير: ٧٥٧٠، و(الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج١٠، ص٦٠.

(٣) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (٦٩٧٠)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٧١٢٨)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

دەنا ئینسـان هەرگیز بەتەواویـی لە دنیادا (کـامڵ) نابـێ، چـونکە ئەگــەر وابــێ، جـمـوجـۆڵو بەرەو خواچـوونی کۆتـایی پـێدێو ڕادەوەسـتێ!!

**حەوتەم**: ڕەنگـە یەکـێـك بپرسـێ: باشـە ئەو ڕێـیـە شـەش قۆنـاغییەی، کـە تـۆ نـاوت لـێـنـاوە: (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون)، سـەر بـە کـام لـە ڕێبـاز (طریقة)ەکانی (تصوف)ەو، ئەگەر لە ڕێبازە ناسراوەکانی سـۆفـیـایەتـییش جـوێـیە، نـاوی چـییـە؟

دەڵێـیـن:

ئێمـە ڕێزو حـورمەتی زۆرمـان بۆ هـەموو ئەو ڕێبازە ڕاستو[1] ساغانەی (تصـوف) هـەیە، کە خەڵـکـێکی زۆریان بەرەو خوا گـێڕاوەتەوەو، ژمارەیەکـیشـیـان لــێ بـە خول گەیاندوونو، ئیسـلامێکی ڕاستو سـاغیان تێگەیانـدوون، بـەڵام ئـەوەی ئێمـە لێرەدا بە (ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون) مـان دانـاوە، ناوێکـی تایبـەتیی نیەو، ڕاستەوخۆ لـە قورئـانو سـوننەتو ئـەزموونی ڕاسـتو سـاغی خواناسـان وەرگیـراوە، ئەگـەر بگـونجێ هیـچ نـاویشـی لـێ بنـرێن، دەڵـێـین: (ڕێبـازی موحەممەدیی)یە.




(١) بەڵێ.. ئێمە ڕێزمان بۆ ڕێبازە ڕاستو ساغەکانی (تصوف) هەیە، بەڵام بەداخـەوە لەمیـژە (تصـوف)ی ڕاسـتەقینە، مەگەر بەدەگمەن، دەنـا بێ‌سەرو سۆراغەو، زۆر ڕێچکـەی خـوارو خێـچو پـڕ بیـدعەتو ئەفسـانەش بەناوی (تصوف)ەوە هاتوونە گـۆڕێ، کە لەجیـاتی تەقواو دینداریی و صەفای دڵو...هتد، هەر چـڵـكو چەپەڵو قـوڕاوی سەرکێشـیی و دنیـاداریی و ژەنگـی دەروونیـان لـێ دەچۆڕێ.

**پێشدەستیی:**

خوێنەری خۆشەویست !

بێگومان (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خواچوون) هەرچەندە لەورووەوە کە مایەی ئارام گرتنی دڵو ئاسوودەیی دەروونە: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، تاکە کالایەکە پڕ بە بالای ناخ و زگماک(فطرة)ی ئینسان: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ...﴿٣٠﴾ ﴾ الروم.

واتە: دەجا ڕووی خۆت بە چاکیی‌و پاکیی لەگەڵ ئاییندا ڕاست بکە، چونکە (ئا ئەوەیە) ئەو فیطرەتەی، خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، دروستکراوی خوا گۆڕینی بۆ نیە، ئا ئەوەیە ئایینی ڕێکو ڕاست (ی خوا، کە لەگەڵ فیطرەتدا پێکەڵپێکەو جووتە).

بەڵێ، لەو ڕووەوە، کە گوتمان، ڕووکردنە خواو خۆ تەزکیەکردن، نەك هەر ئاسانە، بگرە یەکجار بە لەززەتو بەتامو چێژیشە، بەلام لەو ڕووەوە، کە ئینسان بە مەبەستی تاقیکرانەوە لەم سەر زەوییە ڕۆنراوەو، ئەو ژیانو گوزەرانە کاتییەی بۆ ساز کراوە: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ الکهف.

واتە: ئێمە هەرچییەك، کە لەسەر زەوی هەیە، کردوومانەتە هۆی ڕازانەوەی، بۆئەوەی تاقییان بکەینەوە، داخۆ کامیان کردەوەی چاکترە.

بەڵێ، لەم ڕووەشیانەوە، کە ئینسان هەمیشە لەژێر چاودێریی‌و لە حاڵەتی تاقیکرانەوە دایەو، دەیانو سەدان کۆسپو لەمپەری جۆراوجۆرو، چەندان ئێشو گرفتاریی‌و ناسۆرو، گەلێك جەردەو ڕێگری بە زەبرو زۆر، خۆیان لەو ڕێیەدا بۆ مەڵاسداوەو، هەر لە دەرفەتێك دەخەفتێن، بۆ زەفەر پێبردنی‌و لە بۆسەکەوتنی، لەم

ڕووەشەوە، هەتا بڵێی ڕێگایەکی سەختو دژوارەو مەترسییدارە، دیارە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) ئەم لایەنو ڕووەی ژیانی دنیای لەبەرچاو گرتـوە، کـە فەرموویـەتی: {الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ}[1].

واتـە: ژیـانی دنیـا حەپسـخانەی بـڕوادارو بەهەشـتی کـافرە[2]، هـەروەها، کـە فەرموویەتی: {حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ}[3].

واتە: بەهەشت بە سەختییەکان ئابڵووقە دراوەو- ئاگری دۆزەخ- یش بـە ئارەزووەکـان دەورە دراوە.

ئنجا خوا یاربێ ئێمە لەم بەشەی چوارەمەدا، لە هەشت تەوەردا سەرژمێرێکی خێـرای ئەو کۆسپو تەگەرە سەرەکییـانە دەکـەینو، سـەرو تیشـکێکیان دەخەینـە سـەر، تـاکو ڕێبوارانی ڕێی بەرەو خواچـوون، لـەلایان نـامۆو نەناسـراو نـەبنو، لەنـەکاو بەسـەریاندا نەکەونو، بێ ئاگایانەو نەزانانە بەتەڵەو داویانەوە نەبنو، لە بۆسەی بەدیان نەکەونو، لـە ئاکامـدا لە تاقیکردنەوەی گرنگو گەورەو مەترسـییداری ئەم ژیانە دنیاییـە نەکـەونو، لەجیاتی بەرزبوونەوە بۆ پلـە بڵـندەکانی بەهەشت، لە پەوڕوو لـە ئـاگری نێـڵـدراوی[*] دۆزەخ نەکەون !! خـوا پەنـامان بـدات.

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٦٠٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٢٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٤١١٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٧) وَغَيْرُهُم، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

(٢) واتە وەك چۆن مرۆڤ لە زینـدان دا ئـازاد نیەو جموجۆڵەکانی سـنووردار کراون، بە هەمان شێوەش بابای مسوڵمان لەژیانی دنیای دا، ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی جموجـۆڵ بکـاتو، شـەریعەت هەڵسوکەوتـەکانی سنووردار دەکات، نامسوڵمانیش لەو ڕووەوە کە چی کەیفی لـێ بێ لە دنیادا دەیکات بـێ گوێدانـە دیـنو ڕەوشت، لەو ڕووەوە وەك ئەهلـی بەهەشـت وایە، کە هیچ شتێکیان لـێ قەدەغە نیـە.

(٣) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٨٩٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٣٠٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧١٩) عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهُ.

(*) نێـڵـدراو: کـڵـپـە سـەندوو، بڵێسـەدار.

## تەوەری یەکەم:

### بەهەڵە حاڵیی بوون لە ئیسلام

بەڕاستیی بەهەڵەو ناڕاست تێگەیشتن لە ئیسلام - بەڕای بەندە - گەورەترینو بەزەڕترین کۆسپو لەمپەری تەزکیەی نەفسو صالّح بوونو بەرەو خوا چوونی ئینسانە.

چونکە ئاشکراو بەڵگەنەویستە، کە لەڕێی خواوە نەبێ مرۆڤ بەرەو خوا ناچێو، تاکە ڕێگایەکیش، کە خوا پێشانی بەندەکانی داوە بۆ بەندایەتییکردنیو لێ نزیکبوونەوەیو بەرەولاچوونی، ئەو ئیسلامەیە، کە لە دوو سەرچاوە ڕوونو بێ چەندو چوونەکەی دایە، کە قوڕئانو سوننەت (الكتاب والسُّنَّة)ن.

بەڵێ، تەنهاو تەنها بەڕێی ئیسلامداو، بە پابەندیی بە قوڕئانو سوننەتەوەو، بە فەرمانبەریی کردن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) ﴿...أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ...﴾ (٥٩) النساء، ئینسان ڕێی ڕاستو دروستی تەزکیەی نەفسو صالّح بوونو بەرەو خواچوونو بە دیدار شادبوونی، بۆ تەختو هەموار دەبێ.

بەلام بێگومان خودی بڕوا بە ئیسلام هێنان، چەندە گرنگەو شوێنکەوتنی ئیسلامەتی چەندە مەبەستە، چۆنیەتیی ئەو بڕوا پێهێنانو شوێنکەوتنەش، هێندە گرنگە، دیارە، کە مەبەستیش لە: (أحسَنُ عملاً) هەر ئەوەیە وەك (الفضيل بن عياض) گوتوویەتی: خوا هیچ کردەوەیەك وەرناگرێ[1] تا دوو مەرجی سەرەکیی تێدا نەبن:

أ- بەس بۆ خوابوون (خالص).

ب- ڕاست بوونو بەپێی شەرعی خوا بوون (صواب).

خۆ بۆ خوا ساغ کردنەوە (الإخلاص لله)ش، زادەو بەرهەمی خوا بەیەکگرتن (توحيد)و (لا اله الا الله) گوتنەو، شوێن شەرع کەوتن (الإتِّباع للشرع)یش، بەرهەمی

---

(١) بڕوانە: (الأساس في التفسير) سعيد حوّى، ج: (٥)، ص: (٢٥٣٦).

شوێن پێی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەڵگرتن‌و (محمد رسول الله) گوتنە، ئەم دووانەش: (لا اله الا الله و محمد رسول الله) کلیلی دەرگای چوونە نێو ئیسلام‌و، دوو شاباڵی پێ فڕین‌و پێ بەرەو خوا چوونی ئینسانن.

ئێستاش با لە چوار بڕگەدا مەسەلەی {بەهەڵە لە ئیسلام حاڵی بوون}و، چۆنیەتیی کۆسپ‌و پەرچبوونی لە ڕێی بەرەو خوا چووندا‌و چارەسەرکردنی، بتوێژینەوە:

**یەك: بە هەڵە تێگەیشتن لە ئیسلام چییەو چۆنە؟!**

هەر بەکورتیی دەڵێین:

هەر جۆرە گۆڕین‌و دەستکاریی‌و کەم‌و زیادکردنێك، لە ئایین‌و بەرنامەی ڕاست‌و تێرو تەواوی خوای پەروەردگارو دادگەرو زاناو کاربەجێ‌و بە بەزەییدا، هەتا لە بواری تیۆریی (نظري)و لە بازنەی عەقڵ‌و زەین‌و بیرو بۆچووندابێ، بە (بە هەڵە لە ئیسلام حاڵیی بوون) دادەنرێ، بۆ وێنە:

١) ئەو کەسەی، پێی وایە ئیسلام تەنیا پەیوەندییەکی ڕووحیی نێوان خواو ئینسانەو، ئەو پەڕەکەی لە جوغزی باری کەسێتیی (الأحوال الشخصية) ناچێتە دەرێ‌و، بە هیچ ڕەنگێك بەرەو ئاسۆی خەمخواردن لە کۆمەڵگاو حوکم‌و سیاسەت هەڵناکشێ‌و ناچێتە سەرێ(١)!!.

٢) ئەو کەسەی، پێی وایە: ئیسلام، ڕاستە بەرنامەو پەیڕەوی سەرلەبەری ژیان‌و گوزەرانە، بەڵام بە هیچ جۆرێك‌و لە هیچ حاڵێکدا پەنا بردنە بەرهێزو چەکی تێدانیەو، مسوڵمان دەبێ هەمیشە خەڵك‌و کۆمەڵێکی سەلامەت‌و بێ زەڕو هێدیی‌و مەندبن‌و، بە هیچ شتێك شڵوێ، نەبن، تەنانەت ئەگەر ستەم‌و دەست درێژیشییان لێ بکرێ(٢)!!.

---

(١) وەك عەلمانییەکان‌و خەڵکێکی عەوامی بێ ئاگا گومان دەبەن.

(٢) مەبەست ئەوانەیە کە وشەی جەنگ‌و جیهادیان لە فەرهەنگی مێشکیاندا سڕیوەتەوە.

٣) ئەو كەسەی، پێی وایە ئیسلام، تەنیا لایەنی مەعنەویی و ئەخلاقییەو، تەنیا بە زیكرو فیكرو تەزكیەی نەفس، ئینسان دەتوانێ ببێتە مسوڵمانێكی تێرو تەواوو كامڵ[1]!.

٤) ئەو كەسەی، پێی وایە هەرچی زانیاریی‌و حیكمەت‌و دەستوورو یاسای نێو قورئان‌و سوننەت هەیە، زاناو پێشەوا پێشووەكانمان هەموویان لێ هەڵهێنجاون‌و، ئێمە ئێستا دەبێ بە هیچ ڕەنگێك ڕێگا بەخۆمان نەدەین، كە لە بازنەو جوغزی ئیجتیهادو بۆچوون‌و كەلەپووری ئەوان دەربچین‌و، پێویستە چی ئەوان گوتوویانە، بەبێ تێفكرین‌و بەندو مەرج (قید و شرط) وەریبگرین‌و پێیەوە پابەند بین[2]!!.

٥) ئەو كەسەی وا دەزانێ هەرچی كاتی خۆی زاناو پێشەوایانمان لەكاتی هەبوونی قەوارەو حوكمێكی نیمچە ئیسلامییدا، لەبواری سیاسەتی شەرعییدا گوتوویانەو نووسیویانە، ئێمەش - بەبێ ڕەچاوكردنی هەلومەرجی سیاسیی‌و گۆڕانكارییەكانی دنیا -، لەسەرمان پێویستە پێیەوە پابەندو، بۆی گوێ لەمست بین‌و لێی دەرنەچین[3]!!.

٦) ئەو كەسەی، پێی وایە مسوڵمانان بۆیان نیە كۆمەڵ‌و حیزبی جۆراو جۆر، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانج‌و مەبەستە شەرعییانە پێكبێنن، كە بە كاری بەكۆمەڵ‌و هەرەوەزكاریی نەبێ دابین ناكرێن، وەك فەرمان بە چاكەو ڕێگرتن لە خراپەو، جێبەجێ كردنی یاساكانی شەرع‌و چەسپاندنی سنوورو سزایەكانی‌و، جەنگ كردن لەدژی دوژمن‌و ناحەزانی ئیسلام‌و داگیركەرانی خاك‌و وڵاتیان دا، گومانی وایە، كە هەر كارو چالاكییەكی لەو جۆرە، شتێكی ناشەرعییەو

---

(١) مەبەست زۆربەی هەرەزۆری ئەهلی تەصەووفی ئەم ڕۆژگارەیە، هەروەها كۆمەڵێك ڕەوت و مەشرەبی دیكەی هاووێنەیان.

(٢) مەبەست لاساییی كەرەوەكانن، بە هەردووك جۆری مەزهەبیی‌و سەلەفیی ناوەوە، كە لەم خاڵەدا یەكسانن.

(٣) مەبەست هەر كەسێكی فیكر قاڵب بەستووی بە واقیع ئاناشنایە.

بیدعـەتێکی پەیداکراوە[١]!!.

٧) ئەو کەسـەی، پێـی وایـەو ڕای وایـە، بـۆ ئـەوەی خەڵـکی دنیـاو هـەندەران وانـەزانن، کە ئێمـەی مسـوڵمانو ئایینەکـەمان دواکەوتوەو بـەجێ مـاوین و، بـۆ ئەوەی ڕێزمان لـێ بگرنو توانجو پلارمان تێنەگـرنو، تۆمەتی دژی دیموکراسـیی‌و مافی مرۆڤـو شـارستانەتییمان پاڵ نـەدەنەلاو، مۆری توندڕەویی‌و ڕەشەکـوژیی‌و تۆقانـدن (التطـرف والإغتيـال والإرهـاب)مـان بەنێوچـەوانەوە نـەنێن، گەرەکـە دەستـبەرداری هەنـدێك لـە وشـەو زاراوەکـانی خۆمـان بـینو، هەنـدێك لـە وشـەو زاراوەکانی ئەوان بەکاربێنینو، خۆمانو ئایینـەکەمان لـەو قـەیرانی تۆمەتبـاریی‌و ڕەخنە لـێگیـرانو توانجو پلـلار تێـگیـرانە، قوتـار بکـەین[٢]!!.

٨) ئەو کەسەی، پێـی وایە هەرچەندە تواناو ئامادەیی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەشـمان لەگەڵ کۆمەڵگـاو دەوروبەری تێکەڵو پێکەڵ (لە مسـوڵمانی چاكو گونـاهبـارو بیدعەتچیی‌و هەڵگەڕاوەو، مرۆڤی کافرو هـاوبەش دانەرو زەندیقو...هتـد)مانـدا، نەبـێ، یان تواناشـمان هـەبێ، بـەڵام لەبـەر هـەر هـۆیەك بـێ، ئـەو جـەنگو بەرەنگـارییە دوابخـرێ، یـان هـەر نەکـرێو بەپێویسـت نـەزانرێ، بەڵـێ، ئـەو کەسـەی لەگەڵ هەبوونی هـەل و مەرجێکـی ئـاواشـدا، پێـی وایـە، کـە بـە هـیچ ڕەنگـێك دروسـتو ڕەوا نیە، سڵاوو مەرحەبا لەو خەڵـكو کۆمەڵـگـایە بکـرێو، هیچ جۆرە مـودارایەکـیان لەگەڵ بکرێو، وا دەزانێ بەو مەرحەبـاو موداراو پێکەوە

---

(١) مەبەست هەموو ئەوانەیە کە بڕوایان بەکاری ڕێك و پێـكو یاسـادار (العمـل الـمرتب و الـمنظم) نیـە، بێئاگـا لەوەی کە بەدیلی ئەوە بەس بێ سەروبەریی‌و پاشاگەردانیی‌و کەس بەکەسییە!! سـەرەڕای ئـەوەی، کە چەندان دەقی قورئانو سوونەت فەرزبوونی کـاری بەکۆمەڵو هەرەوەزییان لـێ دەفامرێتـەوەو، چـەندان دەقیش فەرمانیان بەکۆمەڵ بوونو ڕێـك وپێکـیی مسـوڵمانان کـردوەو، پـرژوبـڵاویی‌و پەرتـەوازەیی‌و بێسـەرەوبەرەییان قەدەغە کردوە.

ئنجا ئەو جۆرە کەسانەش ئەو قسانەش دەکەن بە تیۆریی: بـەکردەوە خۆیـان هـەوڵی کۆمـەڵبوون و کـاری هەرەوەزیی و پێکەوەیی، هەر دەدەن!!

(٢) مەبەسـت ئـەو جـۆرە کەسـانەیە کـە لـەژێر فشـارو تـاوو تینـی ڕێچـکەو بیـردۆزەکانو، شـەپۆلی سـیکـۆلاریزمی ڕۆژئـاوادا، بەزیـونو تێشـکـاون.

هەڵکردنە، تەنازول لە ئیمانو ئیسلام دەکرێو، خاوەنەکەی لە بازنەی ئایینو وەدەردەنرێ[1]!!.

٩) ئەو کەسەی، پێی وایە ئێمەی مسوڵمان، ئەگەر بمانەوێ لە ڕەوڕەوەی ژیارو شارستانییەت بەجێ نەمێنینو، لەم سەدەی پازدەی کۆچیی و بیستو یەکەمی زایینی دا، بەرەی خۆمان لە ئاوێ دەربێنین، ناچارین کە لەژێر فشارو گوشاری زانستو بەرەو پێش چوونو گۆڕاندا، دەستبەرداری گەلێك شتی ئایینەکەمان بینو وازی لێبهێنین، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە لەگەڵ زانستو بڕیارەکانیدا ناگونجێن[2]!!.

١٠)ئەو کەسەی، پێی وایە بۆئەوەی بتوانین کارو چالاکیی ئیسلامییانەمان درێژە پێ بدەینو، لەنێو سەرجەم چینو توێژەکانی کۆمەڵگادا کاریگەریی خۆمانمان هەبێ، حەتمەن پێویستە سەرجەم ئەو شتانەی، کە خەڵکی باری پێیانەوە گرتوەو پێیانەوە ڕاهاتوون، ئەگەر شیركو بیدعەتو گوناحو دابو نەریتی کافرانو نەفامێتیی (جاهلیة)یش بن، لەبەر دڵگران نەبوونی خەڵكو دڵڕاگرتنیان، لێیان بێدەنگ بینو دەستیان لێ نەدەین[3]!!.

١١) ئەو[4] کەسەی پێی وایە – بەپێچەوانەی پێشوو – پێویستە لەسەر بچووکترین مەسەلە هەرچەندە سوننەت، یان ڕاجیایی(إختلاف)یەکی فیقهییو جوزئییش بێت، ئەگەر دنیای لەسەر تێکچووە، پێویستە وەدەنگ بێینو بەشەڕ بێین !! بەبێ ڕەچاوکردنی قازانجو زیان (المصلحة والمفسدة)و گرنگو

(١) مەبەست ئەو جۆرە کەسانەیە، کە بەشێوەیەکی ئایدیایانەو ناواقیعییانە بیر دەکەنەوە، بێ ئەوەی بتوانن هیچ هەنگاوێکی کردەیی بنێنو، هەردەم خەریکی ڕەخنە گرتنن لەمو لەوو، حوکم دەرکردنی عاتیفییانەیان بەسەر خەڵکیدا، کردۆتە پیشە.

(٢) مەبەست ئەو جۆرە کەسانەیە، کە ئێستاش هەر لەسەر مەزەبی {لە دەروونەوە تێشکاندن} و بریقە بریقی تەکنۆلۆژیا چاوی ئەبڵەق کردوونو، باوەڕ (ثقة)ی لەق کردوون.

(٣) مەبەست زۆربەی خەڵکی عەشایەرو عەوامو ژمارەیەکیش لە مەلایەکانە.

(٤) مەبەست خەڵکێکی زۆرە لە گەنجو لاوی تازە زمان بە ئیسلام پژاو.

گرنگتـــرو، فـــەڕزو ســـوننەتو، ڕیزبەنـــدیی (ترتیـــب)ی لەپێشـــترەکـــان (الأولویـات)!!.

بەڵـێ خوێنـەری خۆشـەویسـت !

مەبەسـتم لــە {بــە هەڵــە لــە ئیســـلام گەیشـــتن} ئــەو جــۆرە بۆچـــوونانەو هـاووێنـەکـانیـانە.

ئێسـتاش با لە برگەی دووەمـدا، تیشـك بخـەینە سـەر هۆکارەکـانی پەیـدابـوونو سـەرهـەڵـدانی دیـاردەی بە هـەڵـە لە ئیسـلام حـاڵیی بـوون.

**دوو: بەهـەڵە لـە ئیسلام حـاڵیی بوون، بۆچـی و چـۆن پەیدا دەبێـت ؟**

هۆکارەکانی سەرهەڵـدانی دیاردەو نەخۆشیی نـاوبراو زۆرن، کـە ڕەنگـە ئـەم حـەوتە سـەرەکـییەکـانیـان بـن:

**١) دووریـی لە قورئانو سوننەتو ئەو زانیاریـیانەی، کە پێیانەوە پەیوەستن:**

پێغـەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) بەڵـێنی داوە، کە هەر کەسێك دەست بە قورئانو سوننەتەوە بگرێ، هەرگیز ڕێـی لـێ تێکـناچـێو سـەرگـەردان نـابێ: {تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ: لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا كِتَابَ اللَّهِ، وَسُنَّةَ رَسُولِهِ}[١].

**٢) دووریـی لـە پێشـەواو زانایانی ڕەسەنو، میـراتگرانی ڕاستەقینەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام:**

بەڵـێ، بەڕاسـتیی وەك فـارس گوتوویـانە: (نیمە حکیم جان می بَرَدْ، نیمە ملاّ دین می بَرَدْ)، ئەو کۆلـکە زاناو بەناو پێشـەوایانەی، کە تەنیـا بەرگو پۆشاکیان لە خەڵکی عەوام جیـایەو، هیچـیان لەو خەڵکە زیاد نیەو، خۆشیان لە خەڵکی سادەو

---

(١) رَوَاهُ مَالك فـي (الْموطأ)، برقم: (١٣٩٥)، وَصَـحَّح إسـنادَهُ الألبـاني فِـي (السلسـلة الصـحيحة)، بـەڵام لەجیـاتی (سـنة) وشـەی (أهـل بيـتي)یە.

عەوام کردۆتە پێشەواو چاوساغ، ڕۆڵی سەرەکییان هەیە لەسەر لـێشـێواندنو بەهەڵەداچوونیان لە ناسینی ئـاییـنی خـوادا.

**٣) خۆ کـورت هەڵـهـێنـان لەسـەر بەرهـەمو کەلـەپووری زانایـەك، یـان چـەند زانـایـەك:**

چونکە زۆرجـاران وابووەو دەبێ، کە یەکێك لە زانایانی ئیسـلام بۆ ڕاسـتـکردنەوەی چەند هەڵەو ناتەواوییەكو، تیشـك خسـتنە سەر چەند مەسەلەیەك، کە ئەو زانایە لەکـاتی خۆیدا بەپێویسـتی زانیون، کـتێبێکـی نووسـیوە بۆ وێنـە: (إحياء علوم الدين)ی (غـەززالیی)و (كتاب التوحيد)ی (محمد بن عبد الوهاب)و (كليات رسائل النور)ی (نۆرسیی) خوا لـێیان خۆش بێ، کە هەموویان لەو جۆرەن، ئنجا ئەو جۆرە کتێبو بەرهەمانە بەتایبەتو، کتێبو بەرهەمی زانایان بەگشـتیی، ناگونجێ بۆ تێگەیشتن لە ئیسـلام بە هەموو لایەنەکـانیـەوە، پشـتیان پێ ببەسـترێ، چونکە هەر کامیان لایەنێك، یان چەند لایەنێکی ئیسـلام باس دەکات، نەك تێکڕای لایەنەکانو هەموو ئیسـلام و، تەنیـا کتێبو سەرچاوەیەك، کە سەرجەم ئیسـلامەتیـان تێدا خرابێتـە ڕوو (قورئانو سـوننەت)ن و بەس.

**٤) (دەمارگیـریی) (تعَصُّب) بۆ مەزەبو قسـەو بەرهەمی زانـایەك، یـان چـەند زانـایـەكو بیـر تەسـکیی:**

چونکـە دەبـێ هەموومان دڵـنیـاو مسـۆگـەر بین، کە بێجگە لە پێغـەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هیچ کەسی دیکە لە هەڵە پارێزراو (معصوم) نیەو، وەك مالـیك ڕەحمەتی خوای لـێبێ، گوتوویەتی: (مَا مِنْ أَحَدٍ إِلاّ مَأْخُوذٌ مِنْ قَوْلِهِ، وَمَرْدُودٌ عَلَيْهِ، إِلاّ صَاحِبَ هَذَا الْقَبْرِ)(١).

واتە: هەموو کەسێك قسـەی لـێ وەردەگیرێو بە سەریشـیدا دەدرێتەوە، تەنیا خـاوەنی ئەم گۆڕە نەبـێ، (کە مەبەسـتی پێغـەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)و ئاماژەی بۆ گۆڕەکـەی کرد لە کـاتی قسـەکردندا).

---

(١) روح المعاني لمحمود الآلوسي، ج١١، ص١٨٨، عن مالك.

ئاشـكراشـە، كە تەسـلـيمـبوونى بە ڕەهايى بۆ قسـەو بۆچوونو بەرهەمى زانـاو پێشـەوايەك، بريتيـە لە بە كردەوە بەبێ هـەڵە (معصوم) دانـانى.

## ٥) كەوتنـــە ژێــر فشـــارو تەئسيـــرى شەپۆلـــى دنياگـەرايىو، ڕێچكـــەو بيــردۆزەكـانى ڕۆژهــەڵاتو ڕۆژئـاوا:

ئەميش كـاريگـەرييەكى گەورەى هەيە لە خۆ دۆڕاندنو كارتێكردنى خەڵـكـێكى ئيمان دانەمەزراو چاك تێنەگەيشتوو، چونكە خەڵـكى تێگـەيشـتووو ئيمـان دامەزراو، لـەو جـۆرە حـاڵـەتانە پـارێزراوە.

كـەواتـە:

ئينسـانى مسـوڵمان، هەرچەندە هەر زانياريـيەكى بەسوود بە موڵـكى خۆى دەزانێ، {الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا}(١)، بەڵام هەميشـە لە خۆى ورياو ئاگادارەو، هيچ كاتێك بەچاوى ئەبلەقو حەپەسـاويـيەوە، تەماشاى فەرهەنگو كـلـتوورى هيـچ گەلو كۆمەڵـگـايەك ناكـاتو، دووچـارى خۆ بەكـەم زانينو ڕووخانى دەروونيى نابێـت.

## ٦) كـاريگـەريى بـابو دايكو برادەرو دەوروبەر:

ئەم هۆكـارەش ڕۆڵێكى گەورە دەگێڕێ لەسەر لـێ تێكدانو بەهەڵەدابردن، لە ناسينو ئاشنابوونى ڕاستو دروستى ئينسـاندا بۆ ئيسـلام، وەك ئەو فەرموودەيەى پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەى پێ دەكـات: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، وَيُنَصِّرَانِهِ، وَيُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تَجِدُونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟}(٢).

---

(١) أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِيّ، برقم: (٢٦٨٧)، وَقَالَ هَذَا حَـدِيثٌ غَرِيـب، وَقَـالَ الشـيخ الألبـاني ضَـعِيف جداً، بـەڵام بێگومـان مانايەكـەى ڕاسـتو دروسـتە.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ، برقم: (١٢٩٢)، وَمُسْلِمٌ، بـرقم: (٦٩٣١)، وَأَبُـو دَاوُد، بـرقم: (٤٧١٤) عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیطرەتی خواپەرستیی لەدایك دەبێ، پاشان باب و دایکی دەیکەنە جوو، یان دیان، یان مەجووسیی، وەك چۆن ئاژەڵ بە تێروتەواویی پەیدا دەبێ، ئایا هیچ دانەیەکی لووت بڕاویان تێدا دەبینن؟!

**٧) خولیا بە دڵەوە بوون و مەیلکردنی لادان و خراپە:**

هەندێك کەس هەر لەخۆوە کەیفی بەلادان و لاڕێبوون و شتی ڕیزپەڕو دەگمەن دێت و، ڕاستەڕێی ئاسان لەوێیە، کەچی ئەو، ملی هەورازی هەڵەمووت و هەڵدێرو عاسێ دەگرێ ! خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ... ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: (خوا) ئەو زاتەیە، کە کتێبی ناردۆتە سەرتۆ، بە شێك لە ئایەتەکانی مانایان ڕۆشنە، کە ئەوانە ئەسڵی کتێبەکەن و، هەندێکی دیکەیان مانای لەیەکچوو هەڵدەگرن، ئنجا ئەوانەی، کە لادان بەرەو خراپەیان لە دڵدا هەیە، شوێن ئەوانەیان دەکەون، کە مانای وێکچوویان هەیە، بە مەبەستی ئاژاوەنانەوەو، بە مەبەستی تەئویلکردنیان .

بەڵێ خوێنەری مسوڵمان !

ئەمانەی ڕابردن هۆکارە سەرەکییەکانی بەهەڵە لە ئیسلام حاڵیبوونی ئەوانەن، کە بە شێوەیەکی کرچ و کاڵ و ناتەواو لە ئیسلام تێدەگەن.

**سێ: ئاکامی شـوومی بەهەڵە لە ئیسلام حاڵی بوون:**

ئاکامی خراپو شوومی لە ئیسـلام حاڵـیینەبوونو زەرەرو زیانـەکانی یەکجـار زۆرن، بـەڵام لە دوو شـتـدا خڕدەبنەوە:

**١/** دینـداریی بۆ نەکـران بە شـێوەیەکی ڕاستو سـاغ، کە خـوا پێـی ڕازییـە.

**٢/** دەسخەڕۆ بوونو ڕەنج بەفیـڕۆچوون لـە قیامەتـداو، دەسـت لـە بنـی هـەمبـانەی بەتـاڵەوە دەرچـوون.

بۆیەش بابای بەهەڵە لە ئیسـلام تێگەیشـتوو، دینـداریی ڕاسـتو سـاغی بۆنـاکرێ، چونکە وەك چۆن هەر دەزگاو ئامێرێك، کە دروست دەکرێ (کەتەلـۆك)ی ڕەگەڵ دەخـرێ، چونکە ئەگەر بێتو بەو شێوەو چۆنیەتییەی، کە دروسـتـکەرەکەی دیاریی کـردوە، کـاری پێ نەکرێ، نەك هەر کـار ناکاتو بەرهەمدار نابێـت، بگـرە زۆریش نزیکـە، کـــە هـەر خـراپیش بێو یەکـجاریی تێـك بچـێ.

دەجا ئیسـلامیش تەنیا کاتێـكو لەحاڵـێـکدا دەگونجـێ بـەڕێوە ببـرێو، ئامـانجو مەبەستە دنیـاییو قیامەتییـەکانی پـێ دابـین بکـرێن، کـە بـەو چـۆنیەتییە بـێ، کـە خاوەنەکەی (تبارك وتعالـی) دیاریی کـردوە!

ئنجا دەستخەڕۆبوونو ڕەنج بەزایەچوونی بابای بەهەڵـە لـە ئیسـلام تێگەیشـتووش، شـتێکی ڕوونو ئاشـکرایە، چـونکە خـوای پەروەردگـارو کـاربەجێ بـەس فـەرمانی نەکردوە، کە بپەرسـترێ، بەڵـکو وێڕای ئـەوە فەرمانیشـی کـردوە، تـەنیا بـەو جـۆرە بەندایەتیی بۆ بکرێو بپەرسـترێ، کە بۆخۆی لـە قورئانو سـوننەتـدا دیاریی کردوە.

ئنجا بۆ سەرژمێرکردنێکی خێرای زەرەرو زیانەکانی بەهەڵە لە ئیسـلام حـاڵـیینەبوون، ئەوەندە بەسـە، کە جارێکـی دیکـە سەرنجێکی خێـرا لـە زەرەرو باجـەکانی ئـەو یـازدە (١١) جـۆرە بۆچـوونو تێگەیشـتنە هـەڵـەیە بـدەین، کـە لـە بڕگـەی یەکـەمـدا نووسـیمانن.

هـەر بۆ نـموونـە:

یەکەمیان، کە ئیسـلام لە پەیوەندییەکی ڕووحیـی نێـوان خـواو ئینسـاندا کـورت هـەڵدێنـیّو، دیـن لـە ژین دادەبڕێو، حوکمو حیکمەتو، بـازاڕو مزگـەوتو، ئیمـانو سامانو، زانسـتو ڕەوشتو، قانوونو ویژدانو، دادگەرییو دەستەڵاتو، دنیـاو دوارۆژو، ڕووحو جەستەو، عەقڵو وەحییو...هتد، لە یەك دەترازێنیّ، دەزانـی چـەند جـۆرە بـەڵاو گرفتارییو ئاشووبو خراپەکاریی دەڕەخسـێنیّ !!

ئاخر ئەم شتانەو گەلێك شتی دیکـەی لـەم بابەتـەش، هەمیشـە (جـووت)نو بـەبیّ یەکدی نایانـکریّو نایانـکریّ و، لەکاتی لەیەکـدی ترازاندنیانـدا، هـەموویان نێـوەڕۆکی خۆیان لەدەست دەدەن، بێگومان گچکـەکردنەوەی ئـایینیـش (مەبەسـت ئیسـلامە)و کـورت هـەڵـێنانی لە پەیوەندیی ڕووحیی نیـوان خـواو ئینسـانـدا، هـەموو ئـەو شـتـە جووتانەی، کە گوتمانن هەر لە (دیـن)و (ژیـن)ەوە، هـەتا (عـەقـڵ)و (وەحیی)، نەك هەر لەیەك دەترازێنـیّ، بگـرە پێکەوەشـیان بەشـەڕ دێنـیّو، جـەنگی گـەرمو گـوڕی نێـوان (زانسـت)و (ڕەوشـت)و، (ویـژدان)و (بەرژەوەندیی)یش، کـە لـە ئـەورووپاو ئەمریکـاو ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوای جیهـاندا لە ئـارادایە، چاکتـرین بەڵـگەو شـایەدی ئیسـپاتی ڕاستیی ئەم قسـەیەیەو، پیسـترینو خراپتـرین بەرهەمی ئەو کارگـەو فابریقـەیەیـە.

بۆ زیاتر ڕوونکـردنەوەی مەبەسـتیـش، بـا ئـەم قوڵـە نەزیلـەیـەی خۆمتـان بـۆ بگـێڕمـەوە:

سـاڵی (١٩٨٦) کە ئەو کـاتە تازە گوندی (سەرسیان)م بەجیّ هێشـتبوو لـە چـنگ دائیـرەی ئەمنی (ڕانیە)و (دووکان)و، کەمێك بوو لە گوندی (گەڵـووی ماخـۆ بزنـان) بە مەلایەتـیی نیشـتەجـیّ بووبووم.

ڕۆژێکـیان چـەند مامۆسـتا (مەلا)یـەك بەمەبەسـتی سـەردان هاتنـە لامو، پـاش دانیشـتنو ئیسـڕاحـەت، قسـەو باس هـاتنـە پێشـەوەو، من ڕووم لەو بەڕێزانـە کـردو گوتم: مامۆستایەکـان! بەڕاستیی خەڵـكو میللەتەکـەمان خەریکـە یەکجـاریی سـەری

لــێ بشــێوێ و[١] بفەوتێ‌و، ئێمەو مانــانیش بەر لــە هــەموو کــەس لە بەرامبەر خوادا، لەوبارەوە بەرپرســیارین، بۆیە پێویســـتە تەکـــانێك بدەینــە خۆمــانو بجوولـــێینو، لـــێ نەگەڕێین کۆمەڵـگـای کوردەوارییمــان، کــە بــە ڕەنـــجو زەحمـــەتو خوێنـــی هــاوەڵانی بەڕێــزو دڵســۆزی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیســلامی پێگەیشــتوە، گــورگ‌و دزوجــەردەی ڕژێمــی طــاغووتیی‌و ڕێچکــە شــەیطــانییەکــان، وا بەئاســانیی بیــرفێــنن‌و لــەبن دەســتمان دەربــبێنن!.

بەرلــەوەی قســەکانم تەواو ببــن، یەکــێــك لەو بەڕێزانە بە دڵـگەرمیــیەوە گــوتی:

فــلانەکــەس ! تۆ گــەنجــی‌و تازە پێ ڕادەگەی‌و تەجرەبەت نیەو خەڵـــکی نــانــاســـی، بەو قورئانەی، لــێــم خــوێنــدوە، ئەو خەڵـــك‌و میللــــەتە هــەمووی دڵـــی ڕەش بــووەو، مۆری بەسەر دڵەوە نراوەو، هەرچی بۆیان بڵــێــی هەر بێــســوودە، چونکــە ئێمــە پـــارەو دەســتەلاّتــان نیــە، گوێمان لــێ نــاگــرن !

منیــش گــوتــم:

مامۆســتا ئەو خەڵــکە تەنیا گەدەو گیــرفانی نیە، تاکو ئێمە نــەتوانین هــیچ کاریــان تێبکەین، ئەگەر ڕژێم‌و ڕێچکــەکــان لەڕێــی گەدەو گیــرفانیانەوە، دەیانخەنە ژێــر ڕکێفــی خۆیانەوە، دەرگای عــەقڵ‌و دڵیشــیان بۆ ئێمە ماوە، تاکـــو لـــەو دەروازەیـــەوە لـــێیـــان بچــینە ژوور!

ئــەویــش لــە وەلاّمــدا گــوتی:

ئاخــر کاکــە مەلا! من پێم گــوتی، کــە ئــەو خــەڵك‌و میللـــەتە دڵـــیان ڕەش بــووەو ئامۆژگــارییکردنیان هیچ فایدێی نیە! با بەڵــگەیەکــت بۆ بهێنمەوە، کە پێــم وایـــە بــێ قســەت دەکــەم !!

---

(١) ئەوکاتە خەڵـکـێـکی زۆر ملی دابووە چەك هەڵگرتن بۆ ڕژێم‌و سـیخوریی‌و ڕاپـۆرت نووسـین، بەشـێکی زۆری خەڵـکـیش لەتاو ستەم‌و چەوساندنەوەو دڕندایەتی ڕژێـم، پــەنایان بردبــووە بــەر ڕێچکـــەو کـــوێرە ڕێییەکــان، بەتایبەت مارکسـیزم، کە ئەوکــاتە بــازاڕی زۆر گەرم بوو و یەکجــار بە برەوو ڕەواج بوو.

گـوتم فـەرموو:

گــوتی: خـۆت دەزانــی مــن لــە ئۆردوگــای (......) مــەلام، ڕۆژێـك بەهەڵـەداوان هــەواڵـیان دامێ، كە مامۆسـتا، فریـا بكـەوە ئەوە لـە فـــلان ماڵـــە شـــاییو ڕەش بەڵـەكـەو وەرە لـێیـان تێك بدە! منیش بەپەلـە چوومو پێنـج شـەش ڕیش سپییش، كـە هەمیشـە لەپشـت منەوە نوێژ دەكەنو زۆربەشـیان حـەجیان كـردوە، وەدوام كـــەوتنو لەگـەڵم هـاتن، دیـارە من هــەر لە دوورەوە تێمـخـــورپینو، پێمـــگوتن ئـەو شـــاییو ڕەشبەڵـەكـە حـەڕامەو تێكی بدەن، ...هتـد.

ئیدی هەر هێـندەم زانی كابرای زاوا، كە دیاربوو چەكداری ڕژێم بووو بەرپرسـیش بوو ! بەرەو ڕووم هـاتو بەتووڕەییەوە گـوتی:

ئەوە چییە مەلا ! هیچ شتێك نەماوە هاتووی شاییو زەماوەندی ئێمە بشـێوێنی؟!

ئیـدی هـــات تونـد یەخـــەو بەرۆكـــی گـرتمو ڕایـتەكـانــدم! ئـەو ڕیـش سـپییو حـاجییانەش، كە لەگەڵم هـاتبوون، كـە هەرگــیز لـەكاتی نوێژەكانــدا پشــت منیـان بەرنەدەداو، هەمیشـە مشـتو مڕیان بوو لەسەر جێگای نوێژو نزیكتــربوون لـە ئیمـامو میحڕابەوە، بەڵـێ ئەوانیش لێم كشـانەوەو لەبەر خۆیانەوە هەر پەكـوو پەكـوویان[1] بوو، دەیانـگوت: شەرت بێ ئێسـتا مامۆستا دەكـوتێ!

منیش، كە زانیم هەر بەتەنیامو ئەو چەكدارەو من بێچـەكو بـاری نابەم، بەناچـاریی دەستم كرد بە قسەی ئارامو نەرم، بەكوردیی پاڕامەوە.. هەتا كابرا وازیـهـێنـــاو منـیش باش بوو، بە سەلامەتیی قوتـارم بووو گـەڕامەوە.

ئنجـا كـاكـی خـۆم ئەو خەڵكـە، كە تۆ دیفـاعیان لـێ دەكـەی ئـائەوانەن!

منیش گوتم: مامۆستا پێت وایە ئـەو بەسـەرهاتو ماجەڕایـە، بەڵگـەی قسـەكانی جەنابتـن، یان پشـتگیـری قسـەكـانی منن ؟!

گـوتی: بۆچی دەپرسی: دیـارە من بەڵگـەم هێنـایەوە بۆ قسـەكانی خـۆم.

---

(١) وشـەیەكە لەكاتی سەرسوڕمان (تعجب)دا بەكاردێ، لـە گـەلێك ناوچـەی كوردسـتانی سـەر بـە ئێـرانو عێراقـدا.

گوتــم: دەجــا مامۆســتا گیــان! با عــەرزت بکــەم:

ئایــا ئەگەر پارچە زەوییەکــت هەبێو تەنیا نیســکی تێدا بچێــنی، ئەگەر نۆکــی تێدا ســەوز نەبوو، ئەو زەویــیە هیچ ســووچی هەیــە؟!

گــوتی: نەخێــر.

گــوتم: مامۆســتای بەڕێز ! جەنابیشــت ئەو ڕیش سپییو حاجییانەت تەنیا فێری ئەوە کردوە، کە پێنج فەرزە نوێــژت لە پشــتەوە بکــەنو، هــەر کاتێــك چــوویە ســەر شــاییو شینێکیش، یان داوەتو میوانییەك، لە پشــتتەوە بڕۆنو لە خزمەتت دابن ! ئەوەش، کــە بەڕێزت فێرت کردوون، وەك خۆت گوتت، زۆربــاش جێبەجــێ (تنفیذ)یان کردوەو هیچیــان لــێ نەبواردوە، بەڵام ڕۆژێــك لــە ڕۆژان جــەنابت ئــەو دەرســـەشت پــێ نەگـــوتوون، کــە هەرکــاتێــك ناکەسێك دەســتی دایــە یەخـــەت، یــان هەڕەشــەی لــێــکردی، ئــەوانیش بەرگرییت لــێ بکــەنو، کــابرای بلّــح کوتەك کــاریی بکــەن[1]!

جــا بەڕێــز! مادام ئەو دەرسو ئامۆژگارییەی کــە پێــت گوتــوون، زۆر چــاکیان ڕەوان کردوەو لەبەریان کردوە، نەدەبوو لەسەر ڕەواننەکردنی دەرسو ئامۆژگارییەك، کــە جــارێ پێت نەگوتوونە، هیچ گــلەییەکــیان لــێ بکــەی! ئەگــەر نــا، بەمــەرەدی ئــەو جووتیــارە دەچی، کە گــلەیی لە زەوییەکەی بکات، بۆچی (نــۆك)ی سەوز نەکردوە، لە حالــێکدا کە تەنیا تۆوی (نیسك)ی تێدا وەشــاندوە!

هەڵبــەتە مامۆســتا بێ قســە بوو، ئنجا نازانم لە قەناعەتەوە بوو، یــان هــەر قســـەو بەڵــگــەی پێ نەمــان.

---

(١) دیارە لابردنو نەهێشتنی هەڵــەو ناشــەرعیی (منکــر)یــە وردەکــان، هەرچــەندە بــەگوێرەی توانــا لــەنێو کۆمەڵگادا هەر فــەرزە، بــەڵام لــەکاتی نــەبوونی حــوکمی خــواو فەرمانڕەوایــەتیی شــەریعەتەکەیدا، کــە ناشەرعیی هەرە گەورە (الــمنکر الأکبــر)یە، پێویســتە زیاتر لەبیــری لابردنو نەهێشتنی وی دابین، ئەگەرنا گەلــێك جاران کارو چالاکییەکانــمان بۆ پاکســازییو چــاکســازیی، دەبنە نەخشــی ســەر ئاوێ.
ئێستاش: (٢٠٢٠/٩/٣٠ز- ١٤٤١/٢/١٣ك) دەڵێم: بێگومان (فەرمان بە پەسند و ڕێگریی لــە ناپەســند) هەمیشــەیی و بەردەوامــە لــە هــەموو ئاســتەکاندا، بــەڵام وردەکــاریی زۆری پێویســتە و لــە کتێبــی: (هەڵوەشاندنەوەی پەرگیریی)یشدا تۆزێك تیشکمان خستۆتە سەر.

خوێنــەری بەڕێــز!

کورتەی چۆنیەتیی زیانگەیانـدنی بەهەڵـە لـە ئیسـلام حـاڵیی بـوون، بـە مەسـەلەی تەزکیـەی نەفس، ئەوەیە، کە ئینسـانی مسـوڵمان تەنیـاو تـەنیا بـە جێبەجێکـردنی تێکـڕای ئیسـلام (بەگوێرەی تواناو بۆ لوان) صالح دەبێو، نەفسـی پاك دەبێتـەوەو چـاك دەبـێو گەشـە دەکـات، مـادام وابـێ هەرکـاتێك لـە سـۆنگەی خـراپ لـە ئیسـلام تێگەیشـتنەوە، بەشێكو لایەنێك، یان زیاتری لـە ئیسـلام فـەرامۆش کـردو هەڵـبوارد (وەك مەسەلەی حاجیی‌و ڕیش سپییەکان)، ئەوە بێگومان بەئەنـدازەی فەرامۆشـکردنو هەڵبواردنەکەی، لە پرۆسە (عملیة)ی تەزکیەکەیـدا، کەلـێنو ناتەواویی پەیدا دەبێـت.

**چـوار: چارەسـەری دەردو دیـاردەی بەهـەڵـە لە ئیسلام حـاڵیی بـوون:**

ئاشـکرایە، کە وەك بنچـینــە (قاعیــدة)یــەکی گشــتیی، هــەموو شـتێك بــە دژو پێچەوانەکەی خۆی چارەسەر دەکرێ، لەم مەسەلەیەی ئێمەشـدا بنچـینەی نـاوبراو، هـەر لەئـارادایــەو هەموو ئەو هۆکارانەی، کە لە بڕگەی دووەمـدا باسمـان کـردن - کـە ئێمـە حـەوتی بنەڕەتییـانمان سـەرژمێر کردن- دژو پێچەوانە (نقیض و عکس)کانیان، فاکتـەرو هۆکاری باش لە ئیسـلام تێگەیشـتنو، چارەسەری دەردی کوشـندەو بێـڕەزای، بەهـەڵـە لە ئیسـلام حـاڵیی بوونن.

کـەوابــێ:

چارەسەری دەردو دیاردەی (بەهـەڵـە لە ئیسـلام حالـیی بوون) لەو حـەوت خـاڵانەی خـوارەوە دایــە:

## ١/ نزیکیی لە قورئانو سوننەتو ئـەو زانیارییانـەی، کـە بـە هۆیانـەوە چاکتـرو ئاسـانتـر لە قورئانو سـوننەت تێ دەگـەینو شـارەزا دەبیـن:

بەڵـێ، گـەورەترینو سـەرکـییتـرینو ڕاسـتتـرینو متمانـە پێکراوتـرین ڕێگـا، بـۆ باش لە ئیسـلام تێگەیشـتنو نەهێشـتنو بنبـڕکردنی دەردو دیـاردەی بەهـەڵـە لـە ئیسـلام حـاڵیی بوون، ئەوەیە، کە ئینسـان هەوڵ بدات، هەرچی زیـاتر بـە قورئـانو

سوننەت ئاشناو لێیان نزیك بێ، هەربۆیەش یەكەمین و سەرەكییترین ئەرك و كاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەنێو ئوممەتیدا، بریتی بووە لە خوێندنەوەی ئایەتەكانی خوا بەسەریاندا ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ... ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة.

دیارە لە هەر چاخ و ڕۆژگارێكیشدا، پێوەری دووریی و نزیكیی ئوممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ئیسلامەوە، بریتیە لە دووریی و نزیكییان لە كتێبی خواو ڕێبازو ڕێو شوێنی پێغەمبەری پێشەواوە (صلی الله علیه وسلم)، ئەو كتێب و ڕێبازەی، كە پێغەمبەری ڕەوشت مەزن لەبارەیانەوە فەرموویەتی[1]: {إِنَّ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا}[2].

واتە: بەڕاستیی چاكترین فەرمایشت كتێبی خوایە و، چاكترین ڕێباز، ڕێو شوێنی موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم) و، خراپترین شت، پەیداكراوەكانن (لە ئاییندا).

## ٢/ نزیكیی لە پێشەواو زانایانی ڕەسەن و میراتگرانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم):

چونكە نە هەموو كەس بۆی دەڕەخسێ ڕاستەوخۆ لە قورئان و سوننەت نزیك بێت و، نە ئەگەر نزیكبوونەوەشی بۆ بلوێ، هەموو كەس توانای چاك لێ تێگەیشتنیانی هەیە، هەر بۆیەش خوای میهرەبان فەرموویەتی: ﴿ ...فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل.

---

(١) لە ڕیوایەتێكی دیكەیدا كە تەنیا هی (مسلم)ە و لە (جابر بن عبدالله)وەیە خوا لێیان ڕازی بێت لەجیاتی وشەی (أَحْسَنَ)، وشەی (خَيْرَ) هاتوە، لە هەردووك شوێنەكەدا، بڕوانە: (شرح السنة للإمام البغوي)، ج: (١)، ص: (٢١١).

(٢) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ برقم: (٦٨٤٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٤٢)، عَنْ عَبْدِالله بْنِ مَسْعُودٍ.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی[١]: {إِنَّ الْعُلَمَاءُ هُمْ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ، إِنَّ الأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلا دِرْهَمًا، وَإِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَ بِهِ، فَقَدْ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ}[٢].

واتە: بەدڵنیایی زانایان میـراتگری پێغەمبەرانن علیهم الصلاة والسلام. بێگومان پێغەمبەرانیش زێڕو زیویان بەمیـرات بەجێ نەهێشـتوە، بەڵکو زانیارییان کردۆتە میـراتیان، ئنجا هەرکەسێك ئەو میراتەی پێ بڕابێ، ئەوە پشـك‌و بەشێکی زۆری وەرگرتوە.

## ٣/ ڕێزگـرتن لـە تێکـڕای زانـاو پێشـەوایانو، بەهرەمەنـدبوون لـە بەرهـەمو کـەلـەپووری هـەموویـان:

ئەمیش فاکـتەرو هۆکارێکـی زۆر گرنگی ڕاسـتو دروسـت لە ئیسـلام حاڵیی بوونە، چونکە هیچ زانایەك نیە، کە توانیبی هەموو زانیاریی‌و نهێنییەکانی ئیسـلام لەخۆیدا کۆ بکـاتـەوە، هیچ کەسێکـیش نیـە لە هەموو ڕاو بۆچوونەکـانیدا، نیشـانەی پێکـا بێت، کـەواتە، با بەهـرەو سوود لە بەرهەمو کەلەپووری تێکـڕای زانـاو پێشـەوایانی ڕەسەنی ئیسـلام وەربگـرین، وێـڕای بەکـارهێنـانو جـووڵاندنی عەقـڵو زەینـی خۆمان، هەم بۆ لە بێژنگو مەحەکـدانو هەڵسـەنگاندنو لـێ هەڵبـژاردنی بەرهـەمو کـەلـەپووری ئـەوانو، هـەم بۆ خسـتنە سـەرو هەڵـهێنجـانی تایبـەتی خۆشـمان، واتە: ئەگـەر تواناکمان هەبووو زەمینەمان بۆ خۆش بوو، ئیجتهـادیش بکـەین، بـەڵام وریـابین و کۆشـشـکردن و ئـارەزووکردن، تێکـەڵ نەکـەین، چـونکە یەکـەمیان، کـە کۆششـکردن (إجتهاد)ە، فەڕزەو، ئەوی دیکەشـیان، کە ئارەزووکردن (إشـتهاء) ـە، حەڕامە!

---

(١) بڕوانە (شرح السنة) ج١ ص٢٦٧.

(٢) رَوَاهُ وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٦٨٢)، وَابْنُ مَاجَة، برقم: (٢٣٩)، وَابْنُ حِبَّانَ، وَصَحَّحَهُ الألبـاني فـي (صحيح ابْنُ ماجهْ)، برقم: (٢٢٣).

**٤/ نەبوونی دەمارگیـریی (تعصب) بۆ قسـەو ڕاو ئیجتیهـادەکانی هـیچ زانـاو پێشـەوایەكو، خۆنەبەستنەوەی موو بە موو، بە هیچ کەسو مەزهەبو لایـەنو ڕێـڕەو (اتجـاه)ێکـەوە:**

بەڕاستیی ئەمیش یەکێکە لە دەستەبەرکەر (ضمان)ە هەرە کاریگەرەکان، بۆ ڕێكو ڕاست تێگەیشتن لە ئیسلام، چونکە بێگومان لاساییکردنەوەو دەمارگیریی (تقلید و تعصّب)، ناوی خۆیان بە خۆیانەوەیەو، دەبنە هۆی گەردن بادرانو عەقڵ داخرانو، لەکارخرانی تواناو وزەکانو، خۆ دۆڕاندنو متمانەو باوەڕ بەخۆنەمان[1].

**٥/ خۆ لەدەست نەدانو خۆبەدەستەوە نەدان، لەبەردەم شارستانێتیی ئەورووپاو، ڕێچکەو بیردۆزە هەڵەو وەهمییەکاندا:**

بەڵێ لاساییکردنەوەو باوەڕ بەخۆنەمانو خۆ بەدەستەوەدان، ئەگەر بۆ پێشینانێك، کە لەسەر ڕێبازی هەق بوون، خراپ بێت، دیارە حەوجار بۆ کافرانو لاڕێیانێك، کە هەر چۆن بێ هەر بە سەرلێشێواو دادەنرێن، هەڵەو حەرامە، ئاشکراشە، کە سوودو بەهرە لێ وەرگرتنیان، لەو بوارانەدا، کە پەیوەندیی بە بەرنامەی ژیانو دیارییکردنی چاکەو خراپەو حەڵاڵو حەرامەوە نیەو، زیاتر پەیوەستن بە لایەنە ماددییەکانی ژیانو گوزەرانو بەڕێوەبردن (إدارة)ی کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە، ناکۆك نیە لەگەڵ ئەوەدا، کە گوتمان.

---

(١) بەداخەوە کە ئەم دەردی لاساییکردنەوەی کوێرانەو دەمارگیرییە، هەم زۆربەی مەلاو شێخەکانو، هەم گەلێك لەو گەنجانەش، کە بەحیساب بە دینداریی ئەوان ڕازی نینو ڕەخنەیان لە (تقلید)و (جمود)یان هەیە، پێیەوە گیرۆدە بوون!! بەلام هەر کۆمەڵەیان بە شێوەیەك، مەلاو شێخەکان بۆ مەزهەبو طەریقەتو پێشووەکانیانو، هی ئەو جۆرە گەنج و لاوانەش بۆ هەندێك کتێبو نامیلکەو کەسایەتیی، کە بۆخۆیان پێیان سەرسامنو گەلێك جاریش، بە هەڵەو ناتەواویی لە قسەو مەبەستی ئەو کەسایەتییانەش تێدەگەن! هەڵبەتە تەقلیدو دەمارگیرییش لە هەر کەسێکەوە بێو بە هەر شێوەیەك بێ، هەر خراپو هەڵەو ناشەرعییەو، هەڵەش هەرگیز بە هەڵە چارەسەر ناکرێ !

**٦/ لەخـۆ وریـابوون، لە برادەرو دەوروبەری خـراپو هەڵبـژاردنی هی چـاك:**

پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) لەوبـارەوە فەرموویەتی: {الْرَّجلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ}[1].

واتــە: پیــاو لەســەر بەرنامــەو پــەیڕەوی دۆســتو خۆشــەویستەکەیەتی، ئنجـا یەکـێکتـان، با بـاش سـەرنج بدات وردبێتـەوە، کە لەگـەڵ کـێـدا دۆسـتایەتیی بگـرێ.

هەروەها فەرموویەتی: {إنمَّا مَثلُ الجَلِيسِ الصَّالحِ وَجَلِيسِ السُّوءِ، كَحَامِلِ المِسْكِ، وَنَافِخِ الْكِيرِ...}[2]، واتە: وێنەی هاوەڵی چاكو هـاوەڵـی خـراپ، وەك بـابـای عەتـر فرۆشو بـابـای کـوورەچیی وایـە...

**٧/ خۆ پاراسـتن لە ژەنـگو ژارو خـلـتـە پەیدابـوون لـە دڵو دەروونـدا:**

باشـتـرین ڕێگا بۆ گەیشـتن بەم ئامانجەو پـاكو خـاوێن ڕاگرتنـی دڵو مێشـكو، تەڵخو چڵـكن نەبوونیان بەهۆی بیـروڕای هەڵـەو، تێگەیشـتنی هەڵـەی قورئـانو سوننەت، بریتیە لە دووره پەرێزیی‌و تێکەڵـنەبوون، لەگـەڵ ئـەهلی کوفـرو خـاوەن بیدعەتەکان، مەگەر لە حاڵەتی بانگەوازو بەرپەرچدانەوەیداو، بۆ کەسێك، کە توانـاو بڕستی تەواوی هەبێت، خـوای کاربـەجێ لـەوبارەوە فەرموویـەتی: ﴿فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٢٩﴾﴾ النجم.

واتە: دەجا واز لەو کەسـە بێنە (پشـتی تێبکەو خۆتی لـێ دوور بگرە) کـە ڕووی لە بەرنامەی ئێمە وەرچەرخـاندوەو، جگـە لە ژیانی دنیـا چی دیکـەی نـاوێ.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٨٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٣٧٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإِيْمَان) برقم: (٩٤٣٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

(٢) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (١٩٩٥)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٥٢١٤)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٥٦١)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإِيْمَان)، برقم: (٩٤٣٥)، عَنْ أَبِي مُوسى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

ئەمە لەبارەی ئەهلی کوفرو شیرکەوە، لەبارەی ئەهلی بیدعەتیشەوە، (الإمام البغوي) لە (شرح السنَّة)ەکەیدا، پاش ئەوەی چەند دەقێکی قورئانو سوننەتی لەژێر سەرباسی: (بابُ مجانبة أهل الأهواء)دا هێناونەوە، گوتوویەتی:[١] (قد أخبر النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم عن افتراقِ هَذِهِ الأُمَّة، وظهور الأهوَاء والبِدَع فِيهم، وَحَكَمَ بالنَّجَاة لمن اتبع سُنَّته وسنة أصحابه رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ، فعلى المرء المسلم إذا رأى رجلاً يتعاطى شيئاً من الأهواء والبدع معتقداً، أو يتهاون بشيء من السنن، أنْ يهجرَهُ ويتبرأ منه، ويتركه حياً وميتاً، فلا يُسلِّمُ عليه إذا لَقِيَه، ولا يجيبُه إذا ابتدأ، إلى أن يَتْرُكَ بدعته ويُراجع الحق).

واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕایگەیاندوە، کە ئەم ئۆممەتە پەرتەوازەو تاقم تاقم دەبێ و، بیروبۆچوونی لە ئارەزوو هەڵقوڵاوو داهێنراوی تێدا پەیدا دەبن، ئنجا حوکمی قوتاربوونی بۆ هەرکەسێك داوە، کە دەکەوێتە شوێن ڕێبازی خۆیو ڕێو شوێنی هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ، بۆیە لەسەر ئینسانی مسوڵمان پێویستە، کە هەرکاتێك کابرایەکی بینی سەرگەرمی یەکێك لەو بیروبۆچوونە بە ئارەزوو گوتراوو داهێنراوانە بوو، ئنجا چ وەك بڕوا پێبوون، چ وەك بەکەمگرتنی هەندێك لە سوننەتەکان، کە دەنگی لێ ببڕێتەوەو حاشای لێ بکاتو بەجێی بهێڵێ، چ زیندووبێ، چ مردوو، نابێ سەلامی لێ بکات کەپێی گەیشت و، ئەگەر ئەویش سڵاوی کرد، وەڵامی نەداتەوە، هەتا واز لە بیدعەتەکەی دەهێنێو بۆ هەق دەگەڕێتەوەو سەر دادەنەوێنێ[٢].

(١) بڕوانە: (شرح السنة) ج: (١)، ص: (٢١٩ تا ٢٣٠).

(٢) دیارە بۆ هەڵسوکەوت (تعامل) لەگەڵ ئەهلی بیدعەتدا، وردەکاریی زۆر پێویستە، چونکە هەم بیدعەتەکان جیاجیانو، هەم لە ڕۆژگارێکەوە بۆ یەکێکی دیکە حوکمیان دەگۆڕێو، هەم لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دیکە، هەڵوێست دەگۆڕێو، هەم بنچینەی بەرژەوەندییەکانو زیانەکانیش (المصالح والمفاسد) کاریگەریی زۆری هەیە، لە حوکمو جۆرو چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی بیدعەتەکانداو...هتد، بۆیەش ئەم ڕاستییەم ڕاگەیاند، چونکە ئاگادارم هەڵەو پەڵەی زۆر بەو بیانووەوە دەکرێنو، شتی سەیرو سەمەر هەیە!!.

ئێستاش، کە پێم وایە تیشکێکی باشمان خستە سەر مەسەلەی (بە هەڵە حاڵیی بوون لە ئیسلام)، کە یەکەمینو گرنگترین هۆیە دەروونییەکانی تەزکیە نەبوونی ئینسانو، زیانبەخشترینو خراپترین کۆسپو پەرچی صاڵح بوونو بەرەو خوا چوونە، دەچینە سەر باسی کۆسپو پەرچەکانی دیکەشو بەکورتیی دەیانتوێژینەوە.



تەوەری دووەم:

## گوناحە ڕواڵەتیی و دەروونییەکان

گوناح‌و تاوان‌و سەرپێچیی‌و خراپە (الإثم والذنب والمعصية والسّيِّئة)، یەکی دیکەیە لە کۆسپ‌و پەرچەکانی سەر ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون، وەك چۆن فەرمانبەریی‌و چاکەکاریی (الطاعة والإحسان) بەگشتیی توێشووی ڕێبوارانی ڕێگای ناوبراون، کە بە وردیی لە هەشت تەوەر و پەنجاو دوو(٥٢) بڕگەدا، لە بەشی سێیەمدا خستمانە ڕوو.

شایانی باسیشە، کە گوناح‌و خراپەکان لەڕووی ئاشکراو پەنهانییانەوە، دوو جۆرن:

أ- گوناحە ڕواڵەتییەکان (الآثام الظاهرة).

ب- گوناحە پەنهان‌و دەروونییەکان (الآثام الباطنة).

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ .. ﴿١٢٠﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: واز لە گوناح‌و خراپەی ئاشکراو پەنهان بێنن.

کە دیارە مەبەست لە گوناحە ڕواڵەتییەکان، ئەوانەن، کە ئاشکراو دیارن‌و بە ئەندامە ڕواڵەتییەکانی جەستە، وەك: دەست، لاق، زمان، گەدە، گوێ، چاو،...هتد ئەنجام دەدرێن، گوناحە پەنهان‌و دەروونییەکانیش، ئەوانەن، کە پەیوەندییان بە عەقڵ‌و دڵی ئینسانەوە هەیەو، خۆیان بەرهەست نین‌و، بە پەرێزو شوێنەوارەکانیان دەناسرێن.

هەروەها گوناح‌و تاوانەکان لەڕووی گەورەیی‌و گچکەییشەوە دیسان، دووبەشن:

أ- گوناحە گەورەکان (الكبائر).

ب- گوناحە گچکەکان (الصغائر).

بەڵگەش زۆرن لەسەر ئەوە، کە گوناح و خراپەکان، بۆ گەورەو گچکە دابەش دەبن، بۆ وێنە: خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾﴾ النساء.

واتە: ئەگەر خۆتان لەو گوناحە زلانە دووربگرن، کە لێتان قەدەغە کراون، بێگومان خراپە (گوناحە گچکە)کانتان لێدەسڕینەوە..، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُمَا إِذَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ}(١).

واتە: پێنج نوێژەکان‌و، جومعە بۆ جومعەو، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، گوناحەکانی نێوان خۆیان دەسڕنەوە، بەمەرجێك دووریی لە گوناحە گەورەکان کرابێ.

زانایان سەبارەت بە پێناسەی گوناحی زل‌و هی گچکە، مشت‌و مڕو ڕاجیایی زۆریان لەنێواندا هەیە، بەڵام لە هەموو ڕایەکان ڕاستترو بەڵگەدارتر ئەوەیە، کە:

(الكبيرة: هيَ كل مَعْصيةٍ نصّ على كونها كبيرة من كتاب أو سنة، أو الإجماعُ عليها، أو وَرَدَ فيها حَدٌّ وتهديدٌ وتَوعُّدٌ عليها بالنّار، أو لَحِقَ مُرتَكِبَها الوَصْفُ باللعنِ والفِسْقِ).

واتە: گوناحی گەورە هەر سەرپێچییەکە، کە دەقێکی قورئان، یان سوننەت هەبێ لەسەر زلیەتیی، یان یەکدەنگیی (إجماع)ی زانایانی لەسەر دامەزرابێت، یان سزای شەرعیی‌و هەڕەشەو ترساندن بە ئاگری لەبارەوە هاتبێ، یان خاوەنەکەی بەلەعنەت‌و لەڕێ دەرچوون (فِسْق) وەسف کرابێ.(٢)

شایانی باسە پێناسەی ڕابردوو (الحافظ ابن حجر العسقلاني) لە (القرطبي)یەوە هێناویەتی‌و، بە چاکترین پێناسەی داناوە(٣)، ئنجا ئەگەر گوناحە زلەکان ئەوانەبن، کە پێناسەکران، ڕوون‌و ئاشکرایە، کە هەر گوناحێك نەکەوێتە بەر ئەو پێناسەیەو، بە

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ، برقم: (٥٧٤)، واللَّفْظُ لَهُ، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٢١٤) وَالبَيْهَقِيُّ في (شعب الإيْمَان)، برقم: (٣٦١٩)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

(٢) بڕوانە: (التوبة في ضوء القرآن الكريم)، ص: (٩٨)، د. آمال بنت صالح نصير.

(٣) بڕوانە: (فتح الباري)، ج: (١٢)، ص: (١٨٢).

دەقێکی شەرعیش زانرابێ، کە خراپەیەو گوناحە، ئەوە بە گوناحو خراپەی گچکە دادەنرێ، بۆ وێنە: ڕوانینی حەرام (النظر الحرام).

زۆر لە زانایانیش وشەی (اللَّمَمْ)[١] یان بە گوناحی گچکە تەفسیر کردوە، لەو ئایەتەدا، کە خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ .... ﴿٣٢﴾ ﴾ النجم.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوییدا هەیە، هی خوایە، تاکو سزای ئەوانە بدات، کە خراپەیان کردوە بەگوێرەی کردەوەیان و، پاداشتی ئەوانەش، کە چاکەیان کردوە، بەچاکترین (پاداشت) بداتەوە، کەسانێك، کە خۆیان لە گوناحە زلەکانو ناقۆلاّیەکان دوور دەگرن، جگە لە وردە گوناح، بێگومان پەروەردگارت لێبوردنی فراوانە..

(القرطبي) لە پێناسەی (اللَّمَمْ)دا گوتوویەتی[٢]: (اللَّمَمْ: صغائر الذنوب التي لايَسْلَمُ مِنَ الوقوع فيها إلاّ مَنْ عَصَمَهُ اللهُ و حفظهُ).

واتە: لەمەم: ئەو وردە گوناحانەن، کە هیچ کەس، لە تووشبوونیان سەلامەت نابێ، مەگەر کەسێك خوا چەپاڵەی دابێ‌و پاراستبێ.

ئێستاش، با سەرژمێرێکی خێرای هەندێك لە گوناحە گەورەکان بکەین، بە ڕواڵەتو پەنهانەوە:

### ١- گوناحە زلە پەنهانەکان:

١. کوفر.
٢. شیرك.
٣. زەندەقە (الإلحاد).

---

(١) خاوەنی (لسان العرب) دەربارەی (لَمَمْ) گوتوویەتی: (الإلْمامُ واللَّمَمُ: مقاربة الذنب، وقيل اللمم مادون الكبائر من الذنوب، وأَلَمَّ الرجُلُ: من اللمم وهو صغار الذنوب، ويقال هو مقاربة المعصية من غير مواقعة)، (لسان العرب)، ج: (١٢)، ص: (٥٤٩).

(٢) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج: (١٧)، ص: (١٠٦).

٤. دەغـەڵـیی (نفـاق).
٥. خـۆبەزل گرتـن (الکـبر).
٦. حەسـوودیی.
٧. خۆپەسـەندیی (العـجب).
٨. بوغـز.
٩. کـینـە (الحقـد).
١٠.بەدگومانیی (سـوء الظـن).
١١.خەڵـك بەکـەم زانیـن (احتقار النـاس).
١٢.ڕژدییو چرووکـیی (البخل و الشـح).
١٣.دنیـا هـەڵبژاردن بەسەر دوا ڕۆژدا (إیثار الحیاة الدنیا علی الآخـرة).
١٤.نـاڕەزایی لـە قەزاو قـەدەری خـوا.
١٥.خـۆشـنەویسـتنی بـڕواداران.
١٦.ڕق لـێـنەبوونـەوەی کـافران، (واتە: کوفرو کـردەوە خراپـەکانیان، نـەك خـودی خۆیـان وەك مـرۆڤ).
١٧.بێـهـیوابـوون لە بـەزەیـی خـوا.
١٨.گومـان خـراپ بوون بەرامبـەر بە خـوا.

### ٢- گوناحـە زلـە ئاشـکراکان:

١. هەر قسـەو ڕەفتـارێك، کە (کفر وشرك ونفاق) بگـەیەنێ.
٢. جـادووکـردن.
٣. کوشـتنی بەناهـەق.
٤. سـوود خـواردن (أکـل الرّبـا).
٥. خواردنـی ماڵـی هەتیـو.
٦. زینـا کـردن.
٧. نێـربـازیی.
٨. پشـت لە دوژمـن کـردن لەکـاتی هێـرش دا.

٩. بوختــان کــردن
١٠. دزیـــی.
١١. ڕێگــریی.
١٢. درۆ کــردن.
١٣. مەیخــۆریــی.
١٤. ســوێند خواردنــی بە درۆ.
١٥. شــایەدییــدانی بە نــاهــەق.
١٦. دڵ ئێشــاندنی بــابو دایــك.
١٧. پەیمــان شــکاندن.
١٨. خیــانەت کردن لە ئەمــانەت.
١٩. قومــار (الـمیـسر).
٢٠. گــاڵــتە بەخەڵـکی کــردن.
٢١. خــۆ پێ چــاك بوون (تزکیـة النـفس).
٢٢. خــۆ هــەڵـکــێشــان (الفـخر).
٢٣. فیــزو کەشــخەکــردن.
٢٤. زەمو غـەیبــەت کــردن.
٢٥. نــاوو نــاتۆرە لە خەڵـکی هەڵـدان.
٢٦. توانجو پــلارگرتنــە خەڵـك.
٢٧. فــێـڵ کــردن (الغــش).
٢٨. خــەڵـك ڕووشــکــێن کــردن.
٢٩. چــاکەو خــێر بە چــاوی خەڵـکی دادانەوەو منەت کردن.
٣٠. قســە هێنــانو بــردن (النمیمـة).
٣١. قســەی ســووكو جنێــو گــوتن.
٣٢. یــارییدەنــەدانی لــێقــەومــاو.
٣٣. پشـــت بەردانــی مســـوڵـمان (خُذْلان الـمسـلم).
٣٤. ســتەم کــردن (الظـلم).

پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە: گوناحە پەنهانو دەروونییەکان، بنكو ڕیشەی سەرجەم گوناحەکانی دیکەنو، مەگەر چۆن، دەنا هیچ گوناحێکی ئاشکراو ڕواڵەتیی ئەنجام نادرێ، هەتا لە دڵو دەروونو مێشکدا نەچەسپێو عەزمی لەسەر جەزم نەکرێ.

ئەگەر لەنێو گوناحە ڕواڵەتو ئاشکراو جەستەییەکاندا، هەم هی گەورەو هەم هی گچکەش هەن، ئەوە گوناحە پەنهانو دەروونییەکان، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا هەموویان هەر زلو گەورەنو گچکەیان تێدا نییە!

لەبارەی کاریگەریی گوناحو تاوانو خراپەش بۆ سەر ئینسانو، ڕۆڵی زۆر خراپی لەسەر نەگرتنی پرۆسەی تەزکیەی نەفسداو، بوونە کۆسپو پەرچی ڕێی صالح بوونو بەرەو خوا چوونی ئینساندا، دەقی قورئانو سوننەت یەکجار زۆرن، بەڵام ئێمە بەس دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

١) خوای بەبەزەیی و خاوەن کەرەم فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُو الْجَحِيمِ ﴿١٦﴾﴾ المطففين.

واتە: سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بە درۆزانان، ئەوانەی ڕۆژی دوایی بە درۆ دەزاننو، بێگومان جگە لە هەر یاخییەکی گوناهبار، هیچ کەس بە درۆی نازانێ، کاتێك ئایەتەکانمانی بەسەردا بخوێندرێنەوە، دەڵێ: ئەفسانەکانی پێشینانە، نەخێر، بەڵکو ئەو گوناحانەی دەیکەن، ژەنگی لەسەر دڵەکانیان پەیداکردوە، نەخێر (وانیە کە دەڵێن) بێگومان ئەو کەسانە لەو ڕۆژەدا لە دیداری پەروەردگاریان (بێبەشنو) پەردەپۆش دەکرێن. پاشان بێگومان دەخرێنە دۆزەخەوە.

وەك دەبینین خوای دادگەر ڕایگەیاندوە، کە لە ئەنجامی گوناحو تاوانو خراپەدا، دڵو دەروونی ئینسان ڕەش دادەگەڕێو کەمڕە دەبەستێو، لە دنیادا چاوی عەقڵو

دڵ کوێرو کوتر دەکات‌و، دەرفەتی نادات خوای خۆی بناسێ‌و ببینێ، سەرەنجام لە دواڕۆژیشدا، لە دیداری بەرزو پیرۆزی خوا بێبەش دەبێ‌و، ڕووڕەش‌و سەربەهەش دەبێ.

٢) پێغەمبەری ڕەوشت بەرزو ئاکار پەسندیش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ الْعَبْدَ إِذا أخْطَأَ خطيئَة، نُكِتَتْ في قَلْبِه نُكْتَةٌ، فَإِذا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتابَ، صُقِلَ قَلْبُه، وإنْ عادَ، زِيدَ فيها، حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ}(١).

واتە: بێگومان بەندە هەر کات گوناحێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ، ئنجا ئەگەر وازیهێناو داوای لێبووردنی کردو گەڕایەوە (لای خوا)، ئەوە دڵ‌و دەروونی سپی‌و ساف دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر هات‌و گەڕایەوە سەر گوناحەکە (لەسەری بەردەوام بوو)، ئەوە خاڵە ڕەشەکە زیاد دەبێ، هەتا سەرتاپای دڵی دادەگرێ.

لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری پێشەواشماندا (صلى الله عليه وسلم) کاریگەریی بەدی گوناح‌و تاوان زۆر جوان ڕوون‌و ئاشکرا کراوە، وەك چۆن کاریگەریی چاك‌و بەهێزو پیرۆزی گەڕانەوە (توبة)و پەشێمانبوونەوەش، لە سپیی‌و ساف‌و ساغکردنەوەی دڵ‌و دەروونداا، لە سەرنج ڕاکێشترین دیمەن‌و تابلۆدا خراوەتەڕوو.

بەڵێ، بێگومان گوناح‌و تاوان‌و سەرپێچیی، بە ئاشکراو پەنهان‌و گەورەو گچکەیەوە، یەکێکە لە کۆسپ‌و پەرچە هەرە مەترسییدارەکانی سەر ڕێی بەرەو خواچوون‌و، جاری وایە بەهۆی گوناحێکەوە، ئینسان هێندەی نێوان ئاسمان‌و زەوی لە خوا دوور دەکەوێتەوە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ، مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا، يَنْزِلُ بِهَا إِلى النَّارِ أَبْعَدَ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ}(٢).

واتە: بەندە جاری وایە وشەیەك دەڵێ، لێی ورد نابێتەوە، هێندەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، پێی بە ئاگردا دەچێتە خوار..

(١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٣٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى)، برقم: (١٠٢٥١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٤٤)، وَالحَاكِمُ، برقم: (٦)، وَقَالَ: صَحِيح، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٢) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (٦١١٢)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٧٦٧٢)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ الله عَنْهُ.

بەڵام خـوای پـەروەردگار بـۆ هـەر دەردێـك دەرمـانو چـارەیەكی دانـاوە، دەرمـانو چارەسەری گوناحو هەڵەكردنیش، گەڕانەوە لای خوا (تـوبـة)و پەشـیـمـانـبوونەوەیە، هـەر بۆیەش ئەهلی تەزكیەو عیرفان گوتوویانە: جاری واهەیە شەیطان یەكێك لە بەندەكانی خوا تووشی گوناحو خراپەیەك دەكات، بەڵام دوایی بـابـای گوناحبار هێندە پەشێمان دەبێتەوە، كە شەیطان لەو گوناح پێكردنەی پەشێمان دەبێتەوە، چونكە دەزانـێ، كە حاڵەتی دوای گوناحكردنو تۆبەكردنی، چاكترە لە حاڵەتی پێشـوویو لە خوا نزیكترە !!

(عطاء الله السكندري)یش لە حیكمەتەكانی خۆیدا، لەوبارەوە شتێكی زۆر جوانی گوتوە: (وَمَعْصِيةٌ أَوْرثتْ ذُلاًّ واحْتِقاراً، خَيرٌ مِنْ طاعَةٍ أورثت عِزّاً واسْتِكْباراً).

واتە: سەرپێچییەك كە حاڵەتی گەردن كەچیی و خۆ بەكەم سەیركردنێ، لە خاوەنەكەیدا پەیدا دەكات، چاكترە لە فەرمانبەرییەك، كە حاڵەتی شانازییو خۆبەزلگریی تێدا پەیدا دەكات !!



## تەوەری سێیەم:
## زیاد لە پێویست گرنگییدان بە ژیانی دنیا

بەڵێ هەرچەندە ژیانی دنیا لەخۆیدا، گەورەترینو چاكترین نیعمەتو چاكەی خوایە بۆ ئینسان، بەڵام لە كاتێكدا ژیانی دنیا زیاد لە ئەندازەی پێویست گرنگیی پێ دەدریو دەكرێتە ئامانج، دەبێتە بێڕەزاترین كۆسپو چەپەری سەر ڕێی صالح بوونو بەرەو خواچوون، هەر بۆیەش خوای زانا، خۆشەویستیی و هەڵبژاردنی ژیانی دنیای كردۆتە مایەی چوونە نێو دۆزەخ: ﴿...وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ ...﴿٣﴾﴾ إبراهيم.

واتە: سزای سەختیش لە ئازارێكی توند بۆ بێبڕوایان، ئەوانەی ژیانی دنیا بەسەر دوارِۆژدا هەڵدەبژێرن.

بەڵگەش لەسەر سەلماندنی ئەو ڕاستییە – كە زیاد لە پێویست گرنگییدان بەژیانی دنیا كۆسپو بەربەستێكی گەورەیە لەڕێی ناوبراودا - زۆرن، بەڵام لێرەدا دەرفەت كەمەو، تەنها ئاماژە بۆ یەكێك لەو بەڵگانە دەكەین:

لە جەنگی (ئوحود)دا، دوای ئەوەی تیرهاوێژەكانی سەرچیا، فەرمانی پێغەمبەریان شكاندو شوێنەكانیان بەجێهێشتو، بەقسەی فەرماندەكەشیانیان نەكرد، مسوڵمانان سەركەوتنی سەرەتای جەنگەكەیان لێبوو بە تێشكانو، حەفتا (٧٠) كەسیشیان لێ شەهید كرا، ئنجا خوای كاربەجێ بەو بۆنەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ... ﴿١٥٢﴾﴾ آل عمران.

واتە: بەدڵنیاییی خوا بەڵێنی خۆی لە گەڵتان دا ڕاست بردە سەر، کاتێك بـە مۆڵـەتی وی بێ هەستتان دەکرد (دەتانکوشتن) تاکو بێهێز بوون و، لە کاردا نـاکۆك بـوون و، دوای ئەوەی ئەوەی خۆشتاندەوێ پێشانی دان، سەرپێچییتان کرد، هەتانبوو دنیـای دەویسـت و هەتانبوو دوارۆژی دەویست.

لـەم ئایەتە بەپێزەدا، خوای زانا ئاماژە بۆ چەند هـۆیەك دەکـات، کـە بوونـە هــۆی دۆڕاندنی جەنگی ئوحود، بەڵام پاشان ئەسـڵ و بنکـی هـەموویان بە خـۆشـویسـتنی دنیا ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾ دا دەنـێ، بەم شـێوەیە:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ﴾، ﴿وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾، ﴿وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ﴾ = ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾!!

بەڵـێ ... بەهۆی زیـاد لەپێویسـت خۆشـویسـتن و گرنگییـدان بـە ژیـانی دنیـاوە، تیـرهاوێژەکـان کۆکردنەوەی ماڵ و غەنیمەتیان، لە جێبـەجێکردنی فـەرمانی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـەلا گرنگتـر بـوو! بۆیـە خڕکردنـەوەی غەنیمـەت، دووچـاری فەرمانشـکاندن (عصیان)ی کردن و، بەهۆی فەرمان شـکاندنیشـەوە، گیـرۆدەی دەردی ناکۆکـیی (تنازع) بوون و، سەرەنجـام تێشـکان (فشـل) یەخـەی گرتـن !!.

## تەوەری چوارەم:

### نەفس و هەواو ئارەزووەكانی

وەك پێشتر ڕوونمان كردەوە، دەروون (نفس)یش هەر ناوە بۆ گیان (روح)، لەو ڕووەوە، كە لەگەڵ جەستەدا ئاوێتە دەبێتو، هەوڵ دەدات داواكاریی‌و داخوازییەكانی جێبەجێ بكات.

دیارە خوای كاربەجێش لە سۆنگەی ئەوەوە، كە ئینسانی بە مەبەستی تاقیكردنەوە دروستكردوە، هەردووك تواناو هێزو ئامادەیی چاكەكاریی‌و خراپەكاریی تێدا داناون، بۆئەوەی بتوانێ هەم بەرەو سەرەوە بچێ، بەهۆی بەندایەتیی بۆ خواكردنو چاكەكارییەوەو، هەم بەرەو خواریش شۆڕبێتەوە، بەهۆی هەواو ئارەزووپەرستییو خراپەكارییەوە، خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠ ﴾ الشمس.

واتە: سوێند بە نەفس‌و بەو كەسەی، كە ڕێكیخستوە. ئنجا خراپەكاریی‌و پارێزكاریی فێركردوە. بێگومان كەسێك پاك‌و چاكی كردبێت سەرفرازەو. كەسێك (لەژێر چڵك‌و چەپەری گوناحدا) سەرنگوومی كردبێ، پەشێمانە.

بەڵێ خوشك‌و برا مسوڵمانە خۆشەویستەكانم !

نەفسی ئینسان ئامڕازێكە، خاوەنەكەی دەتوانێ پێی بچێتە پلە بەرزەكانی بەهەشتەوە، ئەگەر كۆنترۆڵی بكات‌و، بەهۆی تەقواو طاعەتەوە تەزكیەی بكات، دەشتوانێ پێی بەرەو دۆزەخ بچێ‌و، بە چاڵی قووڵی دۆزەخدا خلۆرو شۆڕبێتەوە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ٣٧ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ٣٨ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ

ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعات.

واتە: ئنجا کەسێك سنوور ببەزێنێ و، ژیانی دنیا هەڵبژێرێ. ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی، بەڵام کەسێك لەپایەی پەروەردگاری بترسێو، نەفس لە ئارەزووەکانی قەدەغە بکات، بێگومان بەهەشت جێگایەتی.

بەڵێ:

یاخیی بوونو سنوور شکاندن + هەڵبژاردنی ژیانی دنیا = چوونە دۆزەخ.

لە خوای پایە بەرز ترسان + گێڕانەوەی نەفس لە ئارەزووە (ناشەرعییە)کانی = چوونە بەهەشت.

### سێ حاڵەتەکەی دەروون:

نەفسی ئینسانیش بەڕای سەرجەم زاناو پسپۆڕانی بواری تەزکیەو تەصەووف سێ حاڵەتی هەن:

**١- دەروونی فەرمانکەر بەخراپە (النَفسُ الأَمّارة بالسّوء):**

وەك خوای پەروەردگار لەسەر زمانی (یوسف) علیه السلام فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِىٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ یوسف.

واتە: نەفسی خۆشم لە خراپەو هەڵە بەریی ناکەم، چونکە بەڕاستیی نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات، مەگەر پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ (و ئینسان بپارێزێ).

ئنجا ئەم حاڵەتو بارە خراپەی نەفس حاڵەتو باری ئاسایيو سەرەتاییو ئەسڵییەتی، بەرلەوەی خاوەنەکەی لە بواری تەزکیەو جلەوکردنیدا، دەستبەکاربووبێو هەنگاوی نابێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە نەفس لە ئەسڵدا ئارەزوو و مەیلی خراپەو تاوان دەکات، زۆرن یەکێکیان ئەو ئایەتەیە، کە قسەی پێغەمبەرێکی پاکو پایە بەرزی وەك (یوسف)ە علیه السلام.

بەڵگەیەکی دیکەشی ئایەتی: ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ ﴾یە، کە دەقە لەسەر ئەوەی، نەفسی مرۆڤ لە ئەسڵی دروستبوونیدا، مەیلو ئارەزوو و ئامادەیی گوناحو خراپەی تێدا دانراوە.

**٢- دەروونی ڕەخنەگر: (النّفْس اللّوامة):**

وەك خوای ئاشکراو پەنهانزان، فەرموویەتی: ﴿ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾ القيامة.

واتە: سوێندیش ناخۆم بە نەفسی زۆر سەرکۆنەکەر.

ئەمیش حاڵەتی دووەمی نەفسە، کە خاوەنەکەی دوای ئەوەی لە پاکو چاککردنی وەخۆ کەوتوەو، لە پرۆسەی تەزکیەیدا دەست بەکاربووەو، بۆ سەفەری بەرو خوا چوون سازو تەییار بووە، دەیەوێ نەفسی سەرکێشو یاخیی، لە یاخیی بوون (طغیان)و سەرپێچییەکان (المعاصي)ەوە، بەرەو فەرمانبەریی (طاعة)و کردەوە چاکەکان (الصالحات) بگێڕێتەوەو، نەفسیشی جاروبار دێتە ژێرباری شەرعو، جاروباریش دەگەڕێتەوە سەرباریی ناڵەباری پێشووی‌و، لۆمەو گلەییش لە خاوەنەکەی دەکات، کە بۆچی ئارەزووە ناشەرعییەکانی لێ قەدەغە دەکات! یان لۆمەو سەرکۆنەی خۆی دەکات لەسەر جاروبارە لادانو خراپەکانی.

**٣- دەروونی ئۆقرەگرتوو: (النّفْسُ المُطْمَئنّة):**

وەك خوای بەخشەرو دادگەر، فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر.

واتە: ئەی نەفسی ئۆقرەگرتوو! بگەڕێوە لای پەروەردگارت، تۆش ڕازیی‌و ئەویش لێت ڕازییە. دەجا بچۆ نێو ڕیزی بەندە (هەڵبژاردە)کانمەوەو، بچۆ بەهەشتەکەمەوە.

دیـــاره ئـــەم حاڵەتـــەی نەفســـیش، حاڵـــەتی ســـێیەم‌و كۆتـــایی تەزكیـــەو تێكۆشان(مجاهدة)یەو، نەفسی مرۆڤـ لەم قۆناغو حاڵەتەیدا، گەیشـــتۆتە پلـەی كـاملْ بوون، چونكـە خوای دادگـەرو بەخشـــەر زۆر بــە لـــوتفو ڕێــزو حورمەتــەوه بـانگی كـردوەو دواندوویەتی، جگـە لە وەسفـكردنی بە ئۆخـــژنو ئارامـــگرتوویی، مـــوژدەو مزگێنی هەم چوونە بەهەشتو، هەم شادبوون بــە دیـــداری بەنـدە چـاكو پەسـەندو هەڵبژاردەكانیو، هـــەم ڕازیـــبوونیو، هـــەم خـــوا لـــێ ڕازی بـوونی، پـێ دراوە !! بێگومانیش ئەو هەموو ڕێزو لوتفو بەزەییو بەخشـشو موژدەو مزگـێنییانـە، جگە لە ئینسـانی ئیمان كاملو پێگەیشـتوو، شـایسـتەی هیچ كەسی دیكـە نین !.

پێویسـتە ئـەوەش بگــوترێ، كـە هەرچـەندە ملـكەچـكردنی ئینسـان بـۆ هـەواو ئارەزووەكـانی نەفـس، ڕێگرێكـی زۆر بێـڕەزای سەر ڕێگـای صـالح بـوونو بـەرەو خـوا چـوونە، بەڵام دەبێ وریـاش بین، كە بە هیچ جۆرێك ئیسـلام نـەك هـەر فـەرزی ناكـات، بگرە مۆڵەتیش نادات، كە ئینسـان یـەكجاری ئـارەزووو داخوازییـەكانی نەفسـی كـپ بكاتو سەركوتی بكات ! چونكە ئەمە لەدرێژ خایەندا نەدەگونجێو نـە تەزكیـەی نـەفس پـەكی لەســەری كـەوتوەو، نـە ژیـانی دنیـاش بـەبێ ئـەو داخوازیـــیە سروشـتیانەو، وەلامدانەوەی شـەرعییـان بەڕێوە دەچـێ.

هەربۆیەش پێغەمبـەری پێشـەواو كـارزانمان (صلی الله علیه وسلم)، لە وەلامی قسـەو هەڵوێسـتی هەڵـەو ناشـەرعییانەی ئەو كۆمەڵـەدا، كە هاتنە ماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و لەبارەی چۆنیەتیی دینداریيو طاعەتی شـەخسـیی ئەو لە خێزانەكانیان پرسیار كرد، پاشان گوتیان: ئێمە لەكـوێو پێغەمـبەر (صلی الله علیه وسلم) لەكـوێ؟! كە خوا لە گوناحی ڕابردوو داهاتووی خۆشـبووە، ئنجا یەكـیان گوتی: من لەمەودوا شەوانە هەمیشــە شەونوێژ دەكەم، یەكێكیشیان گوتی: منیش بەردەوام ڕۆژوو دەگرمو نایشـكێنم، ئەوەی دیكەش گوتی: منیش بەلای ژنانـدا ناچمو هەرگیز ژن ناهێنم!! ئنجـا كـاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتەوە ماڵ، پێـی فەرموون: ئێـوەن، كە ئـاواو ئـاواتـان گوتـوە؟! گوتیان: بەڵـێ، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە وەلامی ئەو قســەو هەڵوێستە هەڵەو عاتیفییەی ئەو سێ كەسەدا، فەرموویی: {أَمَا واللّٰهِ إنيِّ

لأخْشَاكُمْ للَّهِ، وَأتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أصُومُ وَأُفْطِرُ، وأُصَلِّي وَأرْقُدُ، وَأتَزَوَّجُ النِّساءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي}[(١)].

واتە: ئاگاداربنەوە! بە خوا من لە هەموانتان لەخواترسترمو لە هەموانیشتان زیاتر پارێزکاریی لێ دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا: ڕۆژوو(ی سوننەت) دەگرمو (جاری واش هەیە) نایگرم، شەونوێژیش دەکەمو دەشخەوم، ژنانیش دەهێنم، هەر کەسێکیش لە ڕێبازی من لابدات، ئەوە لەمن نیە.

کەواتە:

ئەوەی شەرع فەرمانی پێکردووەو مۆڵەتی داوە، کۆنترۆڵکردنی نەفسو دەستەمۆو ڕامکردنی داخوازییو غەریزەکانیەتی، کە لە سنووری شەرع دەرنەچن، نەك سەرکوتکردنو کپکردنی یەکجاریی، کە نە شتێکی گونجاوەو نە دینداریيو طاعەتیش پێویستی بەوەیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە: تێرکردنی داخوازییو غەریزەکان لەڕێی شەرعییەوەو، لە سنوورو ئەندازەی ڕێگا پێدراوی شەرعدا، بە طاعەتو خێرو چاکەش لەقەڵەم دەدرێ، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی جیماعکردنی ئینسان لەگەڵ هاوسەریدا، فەرموویەتی: {وَفِي بُضْعِ أحَدِكُمْ صَدَقَةٌ}[(٢)].

واتە: جووتبوونو سەرجێیی کردنی یەکێکتان، بە خێرو چاکە دادەنرێ!!



(١) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البُخَارِيُّ برقم: (٤٧٧٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٤٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣١٧) عَنْ أنس بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

(٢) رَوَاهُ أحْمَد برقم: (٢١٥١١)، مُسْلِمٌ برقم: (١٤٠١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٦٧) عَنْ أَبِي ذرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

## تەوەری پێنجەم:

## شوێنکەوتن و لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینان و دەوروبەر

ئەوە کە لاساییکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانو دەوروبەری خوارو هەڵە، دەورێکی گرنگی هەیە لە لادانو گێڕانەوەی ڕێبوارانی ڕێی صالح بوونو بەرەو خوا چووندا، ڕاستییەکی مێژوویی واقعییو بەرچاوەو، خوای بەرزو مەزنیش لە زۆر جێیان ئیشارەتی پێکردوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە چەند فەرموودەیەکدا باسی کردوە، بۆ نموونە: خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الزخرف.

واتە: هەر بەو شێوەیە لەپێش تۆدا هیچ وریاکەرەوەیەکمان لە هیچ ئاوەدانییەك دا نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێیەك دیوە، بێگومان ئێمەش شوێنەواری ئەوان دەکەینە سەرمەشقمان.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾﴾ البقرة.

واتە: هەرکات پێیان گوترا: شوێن ئەوە بکەوون خوا دایبەزاندوە، گوتیان: بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانمان لەسەری دیوە، ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان هیچیان نەفامیبێ و ڕێی ڕاستیشیان نەزانیبێ؟!

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أو يُنَصِّرَانِهِ، أو يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تَجِدُونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟}[1].

واتە: هیچ منداڵێك نیە كە لەسەر سروشتی ساغ -ی خواناسین - لەدایك نەبێ، پاشان باب‌و دایكی دەیكەنە جوو، یان نەصرانیی، یان مەجووسیی، هەروەك چۆن ئاژەڵ بەچكەی ساغ‌و سەلیمی دەبێ، ئایا هیچ بەچكەیەكی لووت‌و گوێ بڕاویان تێدا دەبینن ؟!!

بەڵێ... باب‌و باپیران‌و خەڵك‌و دەوروبەر، دەورێكی كاریگەریان هەیە بۆ سەر ئینسان، چ بەلای چاكەدا، ئەگەر چاك بن‌و، چ بەلای خراپەو لادانـدا، ئەگەر خوانەكردە خراپ‌و لار بن، هەربۆیەش ئیسلام گرنگییەكی زۆر بە چاككردن (إصلاح)ی كۆمەڵگا دەدات، لە هەموو لایەنەكانی فیكریی‌و ئەخلاقیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و سیاسییەوە، چونكە هەروەك چۆن عەقڵی ساغ لە جەستەی ساغ دایە (العقل السليم في الجسم السليم)، بەهەمان شێوەش، مرۆڤی ساغ لە كۆمەڵگای ساغدایە (الإنسان السليم في المجتمع السليم).




(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (١٢٩٢)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٦٩٢٦)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٤٧١٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

## تەوەری شەشەم:

## بێ مامۆستایی و چاوساغیی

گرنگیی‌و پێویستیی ڕابەرو ڕێ پیشاندەر، لە هەموو بوارێکی ژیانی ئینساندا، مەسەلەیەکی ڕوون‌و ئاشکرایەو مشت‌و مڕ هەڵناگرێ، بەڵام لە بواری صالح بوون‌و بەرەو خواچووندا، ئەو گرنگیی‌و پێویستییە، زیاتر دەبێتە مەسەلەیەکی ئاشکراو بەڵگەنەویست، چونکە مەسەلەی صالح بوون‌و بەرەو خواچوون، وەك لە پێشەوەش گوتمان، یەکجار گرنگ‌و ئاڵۆزو دژوارەو، ئینسان زۆر وریاو بێدار نەبێ، گیرۆدەی سەدو یەك گیرو گرفت‌و کۆسپ‌و هەڵدێر دەبێت.

هەڵبەتە من لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم: ئینسان بەزەحمەت دەتوانێ خۆی چاك بکات‌و خواپەرستیی بکات، چونکە ئینسان بە سروشتی خۆی خواناس‌و خواپەرستەو، وەك لە خاڵی پێشوودا لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەرکەوت، کە خستمانە ڕوو: مرۆڤ بە ئەسڵ‌و سروشت، چاك‌و پاك‌و خواناسە، بەڵکو ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە، کە ئەگەر یەکێك بیەوێ، زۆر بە مەسەلەی خۆ چاککردن‌و خواناسیندا بچێتە خوارێ‌و، بەخواناسینێکی ئاسایی‌و هاکەزایی عەوامانە قایل نەبێ‌و، بە کەمی قەناعەت نەکات‌و، بەرەو چاکترو بەرزتر بڕوات، ئەوە دەبێ زۆر وریاو بێدار بێ‌و، مەگەر بەدەگمەن، دەنا مەبەستی ناوبراو، بەبێ مامۆستاو چاوساغێکی ڕاست‌و تەواو مەیسەر نابێت، ئنجا بۆیەش دەڵێم دەبێ زۆر وریا بێ، چونکە ئەو بەرەو لووتکەو دوندە بەرزەکانی عیرفان‌و خواناسی دەچێ‌و، دیارە ئینسانیش، هەتا بەرزتر بێتەوە، هەم مەترسیی کەوتنە خوارەوەی پتر لێ دەکرێ‌و، هەم ئەگەر بکەوێتە خواریش زیانی زیاتر دەبێت.

هەر بۆیەش ئەهلی عیرفانو تەصەووفی ڕەسەن، ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩ ﴾ التوبة، یان کردۆتە دروشمی ڕێبوارانی ڕێی بەرەو خوا چوون.

بەڵێ هەر بەوەندە کارت پێك نایەت، کە پارێز لە خوا بکەی، بەڵکو دەبێ لەگەڵ (ڕاستان)یش دابی.

هەروەك چۆن قوتابییەك، کە دەیەوێ فێری زانیاریی پزیشکیی (علم الطب) بێت، هەر بەوەندە بە مراد ناگات، کە کتێبو بەرهەمی ئەو زانایانە بخوێنێتەوە، کە لەوبارەوە شارەزابوون، بەڵکو پێویستە لەسەر دەستی شارەزاو چاوساغانی ئەو زانیارییە، تێ بگاتو پێ بگات.

هەڵبەتە وشەی (شێخ)یش کاتی خۆی بەو مەعناو مەبەستە بەکارهێنراوەو، بە کەسێك گوتراوە شێخ، کە بە زمانی حاڵو وتار لەسەر بنچینەی قورئانو سوننەتو لەبەر تیشکی شەرحو تەفسیری پێشینان (سلف)ی صالحدا لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیاندا، خەڵکی تێدەگەیاندو پێ دەگەیاندو چاك دەکردو بەرەو خوا دەبرد، بەڵام دوای لاڕێ بوونو لە ئیسلام دوورکەوتنەوەو ڕێ لێتێکچوون، وشەی ناوبراویش، وەك دەیان وشەو زاراوەی دیکەی ڕەسەنی ئیسلام، دووچاری گۆڕانو شێوێنران بوو.

## تەوەری حەوتەم:

### بێ ئاگایی (الغفلة)

لەبیرچوونەوەو بێ ئاگـایی، یەکی دیکەیە لـە کۆسـپو بەربەسـتەکانی سـەر ڕێگـای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، چونکە هەر وەك چۆن دزو جـەردە لەکـاتی خـەوتنو بـێ ئاگـاییو تاریکیی نیوە شـەودا، زەفەر بە بـابای خاوەن ماڵو خـاوەن دووکـان دەبـەنو، گورگـیش لەکـاتی بێ ئاگایی شـوانـدا، دەرفەت وەردەگرێ، شەیتانی بـەدیش بەهـەمان شێوە لەکـاتی بێ ئاگایی ئینسـاندا، خەریکی کاری خـۆی دەبێـت، ئەمـە لەلایەکـەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، مرۆڤ بەهـۆی بێ ئاگـاییو خـافـڵانەوە، ئەگەر گریمان شـەیتانیش دنەی نەداتو تووشی خراپەی نەکات، بێ ئاگـاییو خافڵان، هەر خۆی لـەخۆیـدا تەمـەن بەزایـە چوونو کـات لەدەسـت چـوونەو، دیـارە تاقـە سـەرمایەی دەسـتی ئینسـانیش لەژیـانیدا تەمەنیـەتیو، ئەگـەر ئەمیشـی بەبێ هـۆو سوود بەفیـڕۆدا، مانـای وایـە خـۆی دۆڕاندوە !!

دەربارەی مەترسـییو زیانی لەبیـرچوونەوەو بێ ئاگاییش لەژیـانی ئینسـانـدا، دەقی قورئانو سـوننەت زۆرن، کە بۆ نموونـە هەندێکـیان دەخـەینـە ڕوو:

- ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾ طه.

واتە: بەدڵنیایی پێشتر ئادەممان ڕاسپارد و ئامۆژگـاریی کردبـوو، بـەڵام لـەبیری چووەوەو، ویستی پتەومان-لەو مەسەلەیەدا- پێوە نەدی.

- ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر .

واتە: وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لەبیرکرد، ئەویش خۆیانی لەبیربردنەوەو ئەوان بوون لادەران.

* {الشَّـيْطَانُ جَـاثِمٌ عَلَـى قَـلْـبِ ابْـنِ آدَمَ، فَـإِذا سَـهَا وَغَفَـلَ وَسْـوَسَ، وَإِذا ذَكَـرَ اللَّهَ خَنَسَ}[١].

واتە: شـەیتان چۆکی لەسەر دڵی ئادەمزاد داناوە، ئنجا ئەگـەر یـادی خـوای کـرد، خـۆی پەنهـان دەکاتەوە، هەرکـاتێکـیش بێ ئاگا بوو، خوتخـوتەی دەخـاتە دڵـەوە.

کـەواتە: خوێنـەری خۆشەویسـت !

هـەوڵ بـدە هەمیشـە بەهـۆی یـادی خـواوە ئاگـادارو وریـاو دڵ بێـداربیو، وەك شـوانێکی وریاو ئازاو بەمشـوور، زۆر بە وردیی بەسەر ڕانەمەڕەکانی تەمەنت ڕابگـەو چـاودێرییـان بکـە، کە بێ هـوودە لەدەسـت نەچن، بەهـۆی یـادی خـواوە، با هەمیشـە مـاڵـی دڵت ڕووناكو درەوشاوە بێو، جێگای شـەمشـەمە کـوێرەی خوتخـوتەو داڵـغـەی شـەیتانو نەفسـی بەدی تێدا نەبێتـەوە.



(١) رَوَاهُ البُخَـارِيُّ مُعَلَّـقـاً في التفسير، باب (قل أعـوذ بـرب النـاس)، وأخرجـه ابـن أبـي شـيبة في (المصـنّف) (٣٦٩/١٣ - ٣٧٠) والضيا في (المختارة) (٣٦٧/١٠) بإسنادٍ صحيح عن ابن عباس رضي الله عنهما.

## تەوەری هەشتەم:

## شـــەیتـــان

لەڕاستییدا شەیتان -لەعنەتی خوای لـێبـێ- سەختتـرین‌و بێڕەزاتـرین کۆسـپ‌و لەمپـەری سـەر ڕێگـای صـاڵح بوون‌و بەرەو خواچوونە، خوای بەرزو مەزنمان جل جـلالە، لە چەندەهـا ئـایەتـدا ئاماژەی بۆ ئەو مەسەلەیە کردوە، بـۆ وێنـە: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ... ﴿٦﴾﴾ فاطر.

واتە: بێگومان شـەیتـان دوژمنتـانە، دە جا ئێـوەش بیکـەنە دوژمنتـان.

بەڵام ئێمـە بۆیە خستمانە دوای هەموو کۆسپ‌و بەربەستەکانی دیکەی سـەر ڕێگـای ناوبراو، چونکە شەیتانی بەد، هەر بەهـۆی ئەو حەوت تەڵەو داوانـەی پێشـەوەیە، کـە دەتوانێ زەفـەر بە ئینسـان بەرێ !

بەڵـێ شـەیتانی نەگریس‌و پیس لەعنەتی خوای لـێبێ، بەهـۆی: بە هەڵە لە ئیسـلام حـاڵیی بوون‌و، گونـاحە ڕواڵـەتیی‌و[1] پەنهانـەکان‌و، خۆشـویسـتنی دنیـاو، هـەواو ئارەزووەکـانی نەفـس‌و[2]، شـوێنکەوتن‌و لاسـاییکردنەوەی کوێرانـەی پێشـینان‌و دەوروبەری خـوارو هەڵـەو، بێ مامۆستایی‌و چاوساغیی‌و، بێ ئاگایی‌و لەبیـرچوونەوەوە، دەرفەت لە ڕێبوارانی ڕێـی بەرەو خواچوون دەبینێ‌و ئامانج‌و مەبەستی گلاوی خۆییـان - کە بریتیە لە خوا دوورخسـتنەوە، یان لانیـکەم مەحتەل کردن — لـێ وەدەسـت دێنێ.

---

(١) خـوای بـەرزو مـەزنمان فەرموویـەتی: ﴿وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ﴿١٢٠﴾﴾ الأنعام، واتـە: واز لـە گونـاحە ئاشـکراو پەنهانەکـان بێنـن.

(٢) گوتراوە: (حب الدنيـا رأس كـل خطيئـة) هەڵـبەتە ئـەم قسـەیە زۆر جـوان‌و ڕاسـت‌و بەجـێـیە، بـەڵام سـەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەر لەقەڵەمـدرانی، مشـتـومڕی لەسـەرە، بڕوانـە (كشـف الخفـا ومزيـل الإلبـاس)ی العجلـوني، ب: (١)، ص: (٤١٢، ٤١٣).

ئنجا مسـولمانی بەڕێـزو خۆشـەویسـت !

ئەمانە بەکورتیی هەشت کۆسپو چەپەرو بەربەستە هەرە سەختو بێڕەزاکـانی سـەر ڕێگـای صالّح بوونو بەرەو خوا چوونن، خوا یـاربێ زۆرت ئاگا لەخۆ بێو چاکـیان لـێ وردببەوەو، هێندەی سەری دەرزییەش لـێیـان مەترسـە، چونکـە هـیچ شـتێك خـۆی بـۆ پیـاوان (رجـال) ڕانـاگرێو، هـیچ کۆسـپێك ڕێگـا بەمـەردی خـوا نـاگرێ، دیـارە کەسـێکیش گوڵی بوێ، دەبێ ئـازاری دڕكو داڵـیش لەخـۆی بگـرێو، عـەرەبیش زۆر جوانیـان گوتـوە:

بِقَدرِ الكدّ تكتَسَـبُ المعالـي

مَنْ طَلَـبَ العُـلى سَهَرَ اللّيـالـي[١]

ئیـدی هیـوادارم تۆی بەڕێزیش، تێکڕای ئەو گرێو گـۆڵانەی سـەر ڕێـت، بـە بـڕوای بەتینو عـەزمی پۆڵایـینو دڵی پڕ لە ئەوینەوە، وەك خەنجەری دەبان هەڵـبـڕیو، تێیـان نەوەسـتیو ڕانەوەسـتی، هەتـا دەگەیە مەنزڵو بە ئاکـامو مراد دەگـەی.



(١) واتە: بەپێـی هەوڵو تێکۆشانو مانـدووبوونی خـۆت، پلـەو مەنزڵـگـای بـەرزت دەسـتدەکەوێ، ئـەو کەسـەش بیـەوێ مەنزڵـی بەرزی ببێ، شـەونخوونیی زۆریش دەبینـێ.

# بەشـی پێنجـەم

# ڕوونكردنەوەی چەند ڕاسـتییەك و ڕاسـتـكـردنەوەی چـەند هەڵەیەك لەبواری: تەزكـیەی نەفـسـدا

خوشك‌و برا مسوڵمانە بەڕێزەكانم !

دوای ئەوەی لە بەشەكانی ڕابردوودا، تاڕاددەیەك تیشكمان خستە سەر پێناسەی تەزكیەی نەفس‌و، قۆناغەكانی سەفەری بەرەو خوا چوون‌و، هۆكارەكانی صالّح بوون‌و لە خوا نزیكبوونەوەو، كۆسپ‌و پەرچەكانی سەر ڕێی ناوبراو، خوا پشتیوان بێ، لەم بەشی پێنجەمەشدا لە دە(١٠) تەوەری كورتدا، چەند ڕاستییەك ڕوون دەكەینەوەو، چەند هەڵەو پەڵەیەكیش ڕاست دەكەینەوە، كە كەم‌و زۆر شوێنكەوتوو لایەنگرانی عیرفان‌و تەصەووف‌و، نەیارو ڕەفزكەرەكانیشی، تێیاندا دووچاری دوو نەخۆشیی لەمێژینەی: تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفراط وتفريط) بوون‌و دەبن.

خوا بە كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕێ، كە ئەم دوعایە دەكەن‌و لێشیان قبووڵ دەفەرمووێ: (اَللّهُم أرِنا الحقَ حقّاً وارزقنا اَتباعهُ، وأرنا الباطل باطلاً وارزقنا اَجتنابهُ) واتە: ئەی خوایە ! هەق‌و ڕاستییمان وەك خۆی پێشان بدەو، شوێنكەوتنیشیمان پێ ببەخشەو، ناهەق‌و چەوتمان بە ناهەق‌و چەوت بخە بەرچاوو، یاریدەشمان بدە خۆمانی لێ دوور بگرین.

## تەوەری یەکەم:

### تەزكیەی نەفس خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانە بەتایبەت زاناو پێشەوایانیان، بەڵام هەندێكیان تێیدا پسپۆڕ (مُتَخَصِّص)ن:

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

تەزكیەی نەفس، كە خوای پەروەردگار، سەرفرازیی موتەڵەقی كردۆتە ئەنجامو بەرهەمی: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ الأعلى، بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆر كەسەوە، شتێك نیە، كە لەسەر كۆمەڵێكی دیاریكراو تاپۆ كرابێ، بەڵام وەك چۆن لەلایەنەكانی دیكەی دینداریيدا وەك: بانگەوازو، جیهاد، فێركردنو پەروەردەكردن...هتد، هەندێك كەس شارەزاو پسپۆڕترن، مەسەلەی تەزكیەی نەفسیش بەهەمان شێوەیە، ئنجا نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ، كە هەروەك چۆن مەرج نیە هەر كەسێك ناوی لە خۆی نا (سەلەفیی) بە ڕێبازو ئەدەبی پێشینەی چاك (السَّلف الصالح)ەوە پابەند بێتو، لە ڕووناكییو بەرەكەتیان بەهرەمەند بێت، مەرجیش نیە هەر كەسێك شۆرەتی صۆفیایەتیی وەرگرت، نێوەرۆكو جەوهەری تەزكیەو عیرفانیشی تێدا هاتبێتە دی، بەڵكو هی وا هەیە لە سەلەفیی بوون، تەنیا ناوو، لە صۆفیی بوونیش، بەس شۆرەتی پێ بڕاوە، هەیشە چ ناوو لەقەبی سەلەفیی بوونی بەسەر خۆیدا نەبڕیوە، بەڵام وەك كاكڵو جەوهەر خێرێكی زۆری لە شوێنكەوتنو شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو سێ وەچەو سەدەیە دیوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێ كردوون[١]، دواییش بە چاكترین سەدەكان (خير القرون)یان پێشینەی چاك (السَّلف

---

(١) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ}، رَوَاهُ البُخَارِي، برقم: (٢٥٠٨)، هەروەها فەرموویەتی: {خَيْرُ القرون الْقَرْنُ الَّذِي بُعِثْتُ فِيهِمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ}رواه مسلم، هەروەها فەرموویەتی: {خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ

الصالح) ناوبانگیان دەرکردوە، وەك چۆن هی واهەیە، بەبێ ناوی صۆفیی بەسەردا بڕان، گەورەترین پشكو بەشی لە حەقیقەتی تەزکیەو تەصەووفو عیرفاندا هەیە.

کەواتە:

با وریاو بێدار بینو زیاتر سەرنجی نێوەڕۆكو جەوهەری خەڵكی بدەین، نەك دیکۆرو ناوو ڕواڵەتیان، بۆئەوەی لە تێڕوانینو هەڵسەنگاندنماندا، بۆیان دووچاری هەڵەو بۆچوونی سەیرو عەجایب نەبین.




الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} رَوَاهُ البُخَارِي، برقم: (٦٦٣٥)، ومُسْلِمٌ، برقم: (٦٦٣٥)، انظر (السنة) لابن أبي عاصم،ج: (٢) ص: (٩٧٥- ٩٨٢)، و(السلسلة الصحيحة)،ج: (٢)، رقم: (٦٩١، ٧٠٠).

## تەوەری دووەم:

## تەزکیەی نەفس لە مەیدانی کارو خەباتدا نەبێ، وەك پێویست نایەتەدی:

زۆر لە ئەهلی تەریقەتو تەصەووف، بە بیانووی سەرگەرمبوون بە تەزکیەی نەفسیانەوە، نێو خەڵكو كۆمەڵگاو مەیدانی كارو كاسبیی‌و، گۆڕەپانی جەنگو جیهادو، مشوورخواردن لە كاروباری مسوڵمانان، بەجێدەهێڵنو بە خەیاڵی خۆیان بەم ڕەفتارەیان زەمینەسازیی دەكەن، بۆ تەزكیەبوونی نەفسیان:

بەڵام لەڕاستییدا ئەو جۆرە بیركردنەوەو بۆچوونە هەڵەیە، چونكە:

أ/ دەقەكانی قورئانو سوننەت ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە، كە دەبێ پرۆسەی تەزكیەی نەفس لە گەرمەی كارو كاسبیی‌و چالاكیی‌و جموجۆڵی نێو كۆمەڵگادا ئەنجام بدرێ، بۆ وێنە:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿٣٧﴾ ﴾ النور.

واتە: لە چەند ماڵێكدا، كە خوا فەرمانی كردوە بەرزبكرێنەوەو ناوی ویان تێدا بهێنرێ. پیاوانێك بەیانیانو ئێواران سەرگەرمی بەپاك گرتنینی، هیچ بازرگانیی‌و مامەڵەیەك، لە یادی خواو نوێژ بەرپاكردنو زەكاتدان بێ ئاگایان ناكات، لەو ڕۆژە دەترسێن، كە دڵەكانو چاوەكان تێیدا هەڵدەگەڕێنەوە.

بەڵێ هونەرو ئازایەتیی ئەوەیە، كە لە گەرمەی كارو كەسابەتی بازاڕو بازرگانیی‌و مامەڵەدا، خوات لەبیر نەچێ‌و فەرزەكان فەرامۆش نەكەی!

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ الّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذاهُمْ، أَعْظَمُ أَجرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى

أَذَاهُمْ}[(١)].

واتـــە: ئـــەو بـــڕوادارەی کـــە تێکـــەڵیی خـــەڵکی دەکـــاتو، لەســـەر ئـــازارو نارەحەتییەکانیشیان خۆڕاگرە، پاداشتی گەورەترە لەو کەسەی کە تێکەڵیی خەڵکی ناکاتو، تەحەممولـی ئازارو نارەحەتییشیان ناکات.

**ب/** ئینســـان لەمیانـــەی بەرەنگاربوونـــەوەو ڕووبەڕووبوونـــەوەی کێشـــەو گیروگرفـــتو دەردەسەرییو نارەحەتییەکانی ڕۆژگاردا، لە خۆی حاڵیی دەبێ، کە ئایا ئەنـدازەی: خۆڕاگریی، ئازایەتیی، پشـت بـەخوا بەسـتنی، دوارۆژ هەڵـبژاردنو دنیـا بەکـەم گرتنی، چەندەو چۆنە؟ لەڕاستییدا وەك غەززالـیی گـوتوویەتی:

عـەیبو ناتەواوییـەکـانی ئینسـان کـە بـە (رذائـل) ناسـراون، وەك ئـەو کـوانو دوومەڵانە وان، کـە لە جەستەیدا هاتوون، بەڵام هەتـا شـتێکـیان پـێ نەکـەوێ، ئـازاریـان نـابێو خـاوەنەکـەیان هەسـتیان پێ ناکـات!!

**ج/** ئنجا ئەو خەڵكو کۆمەڵـگـایەی دەوری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بـە هـاوەڵـە دڵســـۆزو بەڕێزەکانیشـــیەوە، لـە گەرمـەی جـەنگو بـەرەنگارییو نەبەردییەکانو، لەمیانەی ئێشو ژانو گرفتارییو میحنەتە ماددییو مەعنەوییـە جۆراو جۆرەکانـدا، لەمەحەکـدرانو پاكو پیسو چـاكو خراپەکانیـان، لـە یـەك هەڵاوێرانو جیـاکراونەوە، هەر بۆیەش خـوای کـاربەجـێ لەکـاتی تیشـك خسـتنە سەر ڕووداوەکانی جەنگی ئوحود دا، فەرموویـەتی: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ... ﴿١٧٩﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: ناگـونجێ خوا بەو حـاڵەتـەوە کـە ئێـوەی لەســەرن، واز لـە بـڕواداران بهـێنێو (تاقیتان نەکـاتەوە، بەڵـکـو حیکمەتی وا دەخـوازێ کـە بتـانخاتە ژێـر تاقیکردنەوەو ئەزموونەوە) هـەتـا پیـسو پـاك لـە یـەك جیـا دەکـاتەوە.

بەڵـێ وەك پێشـینان گوتوویـانە: (لە بوارێـدا لاقی ڕەشو سپیی دەناسرێن).

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ فـي (الأدب المفرد)، برقم: (٣٨٨)، وَابْنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٤٠٣٢) وَصَحَّحَهُ الألبـاني فـي (السلسلة الصحيحة)، برقم: (٩٣٩).

## تەوەری سێیەم:

### نەفسی تەزکیەکراوو هی تەزکیە نەکراو، جیاوازییان لە ڕاددەی پابەندیی دایە بە شەرعەوە:

چونکە لە باسەکانی ڕابردوودا گوتمان: کە بەرهەمی تەزکیەبوونی ئینسان ئەوەیە، کە ئیسلامو ئیمانەکەی چاکترو قووڵتر بێتو بچێتە پایەی ئیحسانەوە.

کەواتە: با هیچ کەس بەتەما نەبێ، بەلاف لێدانی ڕووتو ناو لەخۆنانی بێ نێوەرۆك، دەست بگەیەنێتە پلەو پایەی تەزکیە بوون.

بەڵکو کێ لەو هەقە، کە خوا بە پێغەمبەری خۆیدا (صلى الله عليه وسلم) ناردوویەتی، شارەزاتر بێتو پێیەوە پابەندترو بۆی گەردنکەچکەرتر بێت، ئەوە نیشانەی تەزکیەتر بوونیەتی، بە پێچەوانەشەوە، هەرکەسێك بەهەق نائاشناترو لێی دوورتربێت، ئەوە زیاتر شایەدیی ناتەزکیەبوون لەسەر خۆی دەدات، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعات.

واتە: ئنجا هەر کەسێك یاخیی بێتو، ژیانی دنیا هەڵبژێرێ (بەسەر دواڕۆژدا)، ئەوە جێگای دۆزەخە، بەڵام هەرکەسێك لە پلەو پایەی پەروەردگاری بترسێو، نەفسی لە ئارەزووەکانی قەدەغە بکات، ئەوە جێگای وی بەهەشتە.

وەك دەبینین خوای دادگەرو بەخشەر، چوونە دۆزەخی کردوە بە سزاو تۆڵەی کەسێك، کە لە سۆنگەی سەرکێشییو لە خوا یاخیبوونەوە، نەفسی فەرمان بەخراپەکار (أمارة بالسوء)ی بەرەو زەلکاوی دنیاپەرستیی پەلکێشی کردوە، نیشتەجێبوونی بەهەشتیشی، کردوە بەپاداشتی کەسێك، کە لە سۆنگەی ئیمانو

لەخواترسـانەوە، توانیویـەتی نەفسـی خـۆی کۆنتـرۆڵ بکـاتو، لـە پـاوانی ئـارەزووە ناشـەرعییەکان قەدەغـەی بکـات.

کـەواتـە:

باوەش بە ژیانی دنیاداکردنو، بـەدوای هـەواو ئارەزووەکـانی خۆکـەوتنو، شـکاندنی قەدەغەکانو، بەزاندنی سنوورەکانی شـەرع، دروشـمو نیشـانەی یـاخیی بـوونو لـەخوا نەترسـانەو، بـە پێچەوانەشـەوە، خـۆ کۆنتـرۆڵکردنو هـەڵبژاردنی دوارۆژو دنیـا بەکەمگرتنیش، نیشانەو بەڵگەی لەخواترسانو بۆ خوا صـوڵحانە.



تەوەری چوارەم:

## تاکە سەرچاوەی دینداریی و مسوڵمانەتیی، کە تەزکیەی نەفسیش لایەنێکیەتی، شەریعەتی خوایەو هیچی دیکە:

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

وەك چۆن خوای فەرمانڕەواو بەدیهێنەر، لە پەرستراوێتی (ألوهیة)یدا، هیچ هاوەڵو هاوبەشی نین، شەریعەتەکەیشی لە بەرنامەییتیدا، هیچ هاوتاو هاوبەشی نین، دیارە مەبەستیش لە شەریعەت قورئانو سوننەتە.

کەواتە:

ئەوەی کە هەندێك لە ئەهلی تەصەووف بەزاریانەوە گرتوە، کە ئێمە سێ شتمان هەن: شەریعەت، طریقەت، حەقیقەت!! مەگەر بە تەئویلو پینەکردنەوە، ئەگەرنا فڕی بەسەر ڕاستییەوە نیەو، نەك هەر قسەیەکی هەڵەو پووچە، بەڵکو جۆرێکیشە لە جۆرەکانی کوفرو شیرك.

ئاخر مادام خوای باڵادەستو بەدیهێنەر فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: دوایی تۆمان (ئەی موحەممەد!) خستە سەر بەرنامەیەك لە ئایینی (خۆمان)، دەجا شوێنی بکەوەو، دوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.

بەڵێ مادام وابێ، دیارە هەرشتێك جگە لە شەریعەت بە هەر ناوو نیشانەیەکەوە بێت، هەر دەکەوێتە جوغزی: ﴿أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾!!، ئاشکراشە، کە شوێن ئارەزووی نەزانان کەوتن، بە دەقی قورئان حەرام و قەدەغەیە لە پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم)و ئۆممەتەکەی.

تەئویــلو پینەکردنی قســەی نــاوبراویش ئەوەیــە، کە بگــوترێ:

(**شـەریعـەت**) ئەو ئـایینو بەرنامەیە، کە خوای بەخشندە بە دوایین پێغەمبــەری خــۆیدا ڕەوانــەی کردوەو، بە غەیری ئەوەش ڕازی نــابێ بکرێتــە بەرنامــەی ژیــان: ﴿ ... وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ...﴿٣﴾﴾ المائدة.

(**طـەریقـەت**)یش بریتیە لە ڕێبازو چۆنیەتییەکەی تایبــەت، بـۆ کارپــێکردنو جێبــەجێ کردنی ئەو بەرنامەو شەریعەتە، ئەو ڕێبــازەش ڕێبــازو ڕێــو شــوێن (طريقـة وسـنة)ی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليـه وسلم)، شـایانی باسـیشــە، کـە هــیچ کــام لـە پێشــەواو چاوساغانی عیــرفانو تەصەووف، جگە لە ڕێبازی پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليـه وسـلم) شـتێکی دیکـەیان پێشـــانی شـوێنکەوتووانی خۆیــان نــەداوە، کـە ڕێبازەکەشیان دوای خۆیان بە ناوی شــەخسیی خۆیانەوە ناسراوە، سووچی هەندێك لە شوێنــــکەوتووانی بیــــرتەسكو ناحــاڵـــییان بــووە، کــە وایانــــزانیوە مەبەســت لــە (طەریقەتی قادریی)و (طەریقەتی نەقشبەندیی)و (طەریقەتی ڕیفاعیی)و (طەریقــەتی کــوبرەویی)و (طــەریقــەتی نەبهـــانیی)...هتد. چــەند ئــەدەبو ڕێــو ڕەســــمێکی دینــدارییــە، کە هــەرکــام لە (عبدالقادر الجيلاني)و (بهـاء الـدين نقشـبند)و (سـيد أحمد الرفاعي)و ... هتـد دایــان هێنــاوە !!

بەڵام بێگــومان ئەو بۆچـــوونە وێـــڕای هەڵــەو نــاڕاستـــبوونی، گــەورەترین تۆمــەتی خراپیشــە، کە پاڵ دەدرێتە لای ئەو پێشــەواو خواناسانە - خوا لــێیــان خۆشــبێ - کە هەوڵــیــان داوە، بە موو لە شــەریعەتی خــواو[1] ڕێبــازی پێغەمبـــەری پێشـــەوا (صلى الله عليه وسلم) لانــەدەن[2].

---

(١) وریــابەو لێــت تێکــنەچێ وابزانی ڕێبازی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بە جیاواز لــە شــەریعەت داناوە، چونکە (سوننەت) پێکــهێنەری دووەمی شەریعەتەو، ڕێبازو چۆنیــەتیی پیــادەکردنیشــیەتی.

(٢) چ جــای شــتێکی دیکــەی تــازەو جیــا لە ئایینـدا دابهــێنــنو، ســەرەنجام خۆیــان بە داهێنــەر (مُبتـدِعْ) دەرێنــن!! لە جیــاتی ڕێڕوونیی (إرشـاد)کردن، سەر لە خەڵـکی بشـێوێنن!!.

(**حەقیقەت**)یش بەو شتانە دەگوترێ، کە ئینسانی مسولّمان لە ئەنجامو بەرەکەتی جێبەجێ کردنی شەریعەتەوە، بە شێوازێکی تایبەت پێیان دەگات، وەك: حەقیقەتی: ئیمانو ئیسلامو ئیحسانو تەقواو یەقینو... هتد.

کەواتە:

هەرکام لە طەریقەتو حەقیقەتیش هەر لەنێو بازنەی شەریعەتدانەو دووشتی جیا نین و، لە ڕاستییدا ئەو نەفامو نەزانانەی، کە طەریقەتو حەقیقەت بە جیا لە شەریعەت دادەنێن، حوکمی گومڕاییو لە ئایینی خوا دەرچوون بەسەرخۆیانو شێخو طەریقەتەکانیشیاندا دەدەن، ئەگەر لە قسەکەیان وردبنەوەو بزانن چی دەڵێن !.

کورتەی قسان:

دروست نیە ویڕای وشەی شەریعەتو لە پەناو لەڕیزیدا، وشەکانی طەریقەتو حەقیقەت باس بکرێن، مەگەر بەو ماناو چەمکەی کە گوتمان، کە طەریقەت دەبێتە ڕێبازو چۆنیەتی شەریعەتو، حەقیقەتیش دەبێتە بەرهەمو میوە (ثمرة)ی و، هەردووکیشیان هەر لەخۆینیو، لە خۆیەوە سەرچاوە دەگرن.



تەوەری پێنجەم:

با هەستیارییمان بە وشەی (تَصوّف)و هەڵەو پەڵەی نێو سەرچاوەکانی، وامان لێ نەکات لە خێرو بێرو چاکەکانی بێ بەش بین:

پێشتر پێناسەی وشەی (تَصوّف)مان کردو پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات، ئەمیش وەك گەلێك وشەو زاراوەی دیکە،(١) ڕاستەوخۆ لە قورئانو سوننەتدا نەهاتوەو دوایی سەریهەڵداوە، هیچ کاتێکیش زاناو پێشەوایان ئەو مەسەلەیان لە خۆیان نەکردۆتە گرفتو کێشەو گوتوویانە: (لا مُشاحَّة في الإصطلاح) لەسەر زاراوە مشتو مڕ ڕەوانیە، ئنجا کەلەپووری (تصوف)و هەر کەلەپوورێکی دیکەش، کە بەرهەمی عەقڵو ئەزموونی ئینسانە، کەمو زۆر هەڵەو کەمو کورتیی تێدا دەبێتو، هیچ جۆرێکی زانستیی لەو یاسایە ڕیزپەڕ نیە، هەر لە تەفسیرەکانی قورئانەوە بیگرە، هەتا شەرحەکانی سوننەتو، سەرچاوەکانی (فقه)و، (أصول الفقه)و، (علم الكلام)و، زانیارییە عەقڵییو ئەزموونییە ڕووتەکانیش، ئەوە هەر هیچ مشتو مڕ هەڵناگرێ، کە هەڵەو کەمو کوڕیی زۆرو زەوەندیان تێدایە.

کەواتە:

با ئەو کەسانەی بەهۆی هەستیاریی (حسّاسیّة)ی زیادیانەوە، بەرامبەر بەو وشەو زاراوەی (تصُّوف)و هەڵەو کەمو کووڕییەکانی، بە ڕەهایی موتالاّو سوود لێ وەرگرتنی سەرچاوەکانی ئەو زانیارییە لەخۆیان قەدەغە دەکەن، بزانن هەڵوێستەکانیان لەڕووی شەرعو عەقڵەوە هەڵەیە:

---

(١) بۆ وێنە: هەرکام لە زاراوەکانی (العقيدة، علم التوحيد، علم الكلام، الفقه الأكبر) بۆ ئیمانو مەسەلەکانیو، زاراوەکانی: (فقه، أصول الفقه) بۆ یاسا شەرعییەکانو چۆنیەتی هەڵهێنجانیان و، زاراوەکانی: (تفسير، علوم القرآن، تجويد) بۆ قورئانو لێ تێگەیشتنی و، زاراوەکانی: (السنة، علم الحديث، علم الجرح والتعديل)و... هتد، لەو بابەتەن.

أ- لەڕووی شەرعەوە هەڵەیە، چونكە خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر.

واتە: ئەو كەسانەی كە بۆ هەموو قسەیەك گوێ ڕادەدێرن و، شوێن باشترینی دەكەون، ئەوانە كەسانێكن، كە خوا هیدایەتی داون و، ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

ب- لەڕووی عەقڵیشەوە هەر هەڵەیە، چونكە شتێكی زۆر بێجێو ناماقووڵە، كەسێك خۆی لە میوەو بەرهەمی باغێكی گەورە بێبەش بكات، هەر لەبەرئەوەی چەند دانە میوەیەكی كرچو كاڵ یان ڕزیوو كرمێو خراپ، بە هەندێك لە درەختەكانیەوە هەن!! ئاخر ماقووڵە كەسێك خۆی لەو هەموو زانیارییو قسە وردو قووڵو نەستەقانەی نێو كتێبی (إحياء علوم الدِّين)ی ئیمام غەززالیی كە لەبارەی تەزكیەی نەفسدا كردوونی، بێبەش بكات، هەر لەبەرئەوەی، چەند بۆچوونێكی هەڵەو دزەكردوو لە فەلسەفەی یۆنانییو هیندییو بووذاییو، لە ڕەهبانیەتی نەصرانییەكانیەوەی، تێدان، یان لەبەرئەوەی هەندێك دەقی بەناو فەرموودە (حديث)ی لاوازو هەڵبەستراوی[1] تێدا هەن؟! ئایا كەسێك وابكات، دەتوانێ بڵێ بەگوێرەی ئایەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ... ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر، ڕەفتارم كردوە، یان دەبێ بڵێ: بەپێی پەندی: (شەلم كوێرم كەس نابوێرم) هەڵسوكەوتم كردوە؟!![2].

---

(١) ئاشكراشە كە هێنانەوەی بەناو فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو، بە بەڵگە لەلایەن زاناو پێشەوایەكی وەك غەززالییەوە، كەمو كورییە، بەڵام (العراقي) گیروگرفتەكەی بۆ حەل كردوەو (إحياء)یش كتێبی فەرموودە نیە، تاكو لەوێدا بۆ فەرموودان بگەڕێین، كەواتە با بەپێی یاسای (خُذْ ما صفا دَع ما كَدَر) ڕەفتاری لەگەڵ بكەینو، تەنیا قورئانو سوننەتیش لە هەڵە پارێزراون.

(٢) إبن تيمية لە كتێبی: (الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان)دا دەربارەی چۆنیەتی وشەی (صوفية) دواوە، كە پێشتر وشەی (القرّاء) بەكاردەهات بۆ كەسانێك كە دینداریی و تاعەتێكی تایبەتیان هەبووە، پاشان گوتوویەتی: {وقد تنازع الناس: أيّهما أفضل: مُسمَّى الصوفي أو مسمَّى الفقير؟! و يتنازعون أيضاً: أيُّهما أفضلُ: الغني الشاكر أم الفقير الصابر.؟! و الصواب في هذا كله ما قاله تبارك وتعالى: ﴿...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات، بڕوانە: (تفسير

## تەوەری شەشەم:

### خاوەنی تەزکیە بوون و، صۆفیی و دەروێش بوون، یان لەنێو طەریقەتدا بوون، دوو شتی پێکەوە پەیوەست (متلازم) نین:

زۆر لە ئەهلی طەریقەت گومانیان وایە، کە هەر کەسێك سەر بە یەکێك لە ڕێبازەکانی تەصەووف نەبێ، بگرە هەندێکیان دەڵێن: ئەگەر لەنێو ڕێبازەکانی ئەوان دانەبێ‌و هاومەسلەکیان نەبێ، مەگەر قیرِ سپیی بێ‌و، وشتر بە کونی دەرزییەوە بچێ، ئەگەرنا دەستی لە تەزکیەی نەفس گیر نابێ‌و، چاوی بەو (حاڵ)و (مەقام)انە ناکەوێ، کە بابای ڕێبوار (سالك)ی ڕێی بەرەو خواچوون پێیاندا ڕەت دەبێ!

بەڵام لەڕاستییدا ئەم بۆچوونو گومانەش هەڵەو پووچە، چونکە:

١/ هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی لەسەر نیەو، لاف لێدانێکی ڕووتە.

٢/ عەقڵ‌و واقیعیش بە درۆی دەخەنەوەو، هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەری خواو (صلى الله عليه وسلم) ناودارانی بنەماڵەی بەڕێزی‌و پێشەواو زانایانی وەك: (الحسن البصري و ابن سيرين و ابن الـمُسَيَّب و عمر بن عبد العزيز وأبو حنيفة ومالك وسفيان الثوري و الشافعي و أحمد و داود الظاهري و الطبري و...هتد) کە هیچ مسوڵمانێك گومانی لە ئیمان کامڵیی‌و تەزکیەبوونو صالح بوونیاندا نیە، چاکترینو بەهێزترین بەڵگەن لەوبارەوە، چونکە هیچ کامیان سەر بە هیچ ڕێبازێکی تەصەووف نەبوونو، جگە لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هۆگری شتێکی دیکە نەبوون.

لەلایەکی دیکەشەوە: مەرج نیە هەر کەسێك ناوی صۆفیی‌و دەروێش‌و دێوانەو موریدی لەسەر بوو، سەر بەیەکێك لە ڕێبازە ناسراوەکانی تەصەووف بوو، حەتمەن خاوەنی نەفسێکی پاك‌وچاك (مُزكّاة) بێت، بەڵکو هەیانە جگە لەناو، شتێکی چنگ نەکەوتوەو، یەکجار پۆخەڵ‌و پەککەوتووو دواکەوتوە !

---

القاسمي)، ج: (٩)، ص: (٥٦، ٥٧)، کەواتە: با ئێمەش لەو زاناو پێشەوایانەمانەوە زانیاریی‌و حیکمەت‌و ئەدەب فێربین‌و، قسەی سەرکێڵانە نەکەین.

## تەوەری حەوتەم:

## (وەلیی) كێ یەو (كەرامەت) چییە؟!

### ١- وشەی وەلیی (ولیّ):

وشەیەكی عەرەبییەو لە زمانی كوردییدا بە (دۆست) تەرجەمە كراوەو، وشەی (ولیّ)یش چەند واتەیەك دەبەخشێ، كە ڕەنگە وشەی (دۆست) بە كوردیی كۆیان بكاتەوە، وەك: (مُحِبّ، ناصر، قریب، محبوب...)، واتە: خۆشەویست، پیشتیوان، نزیك، خۆشویستراو، بۆ پێناسەی (ولیّ)یش، چونكە خوای پەروەردگار پێناسەی كردوە، پێویستمان بە قسەو پێناسەی هیچ كەس نیە، خوای پەروەردگار لە پێناسەی دۆستانی خۆیدا فەرموویەتی:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾ یونس.

واتە: ئاگاداربن ! بێگومان دۆستانی خوا نەترسیان لەسەرەو، نە خەفەتبار دەبن. ئەوانەی ئیمانیان هێناوە (بە هەرچی كە ئیمان پێهێنانی پێویستە) و پارێزكاریی دەكەن. لە ژیانی دنیاو لە دوارۆژیشدا مـوژدەو[1] دڵخۆشییان هەیە، گۆڕان بۆ بڕیارەكانی خوا نیە، ئەوەیە سەرفرازیی مەزن.

---

(١) ڕستەی ﴿... لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ...﴿٦٤﴾﴾ یونس، بە دوو جۆر تەفسیر كراوە: یەكەم: لە فەرموودەیەكدا كە (ترمذي وأحمد) لە (أبو الدرداء) گێڕاویانەتەوە هاتوە، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {هي الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ}، واتە: خەونی باشە كە ئینسان خۆی دەیبینێ، یان پێیەوە دەبینرێ، دووەم: (الزهري و عطاء وقتادة) گوتوویانە: (هي البشارة التي تبشر الملائكة المؤمن في الدنيا عند الموت) واتە: ئەو مزگێنییەیە كە فریشتەكان بە بڕواداری دەدەن لە دنیادا لەسەرە مەرگدا، بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج: (٤)، ص: (٢١٥).

وەك دەبینین خوای هیدایەتدەر، بەندە دۆستو خۆشەویستو نزیكەكانی خۆی بەم پێنج سیفەتە پێناسەكردون:

١) نەترسان: (مەبەست نەترسانە لەو شتانەی، كە خەڵكی ئاسایی لێیان دەترسن).

٢) غەمگین نەبوون: (مەبەست خەفەت نەخواردنو دڵتەنگ نەبوونە بەهۆی دنیاوە).

٣) ئیمان هەبوون.

٤) پارێزكاریی كردنە پیشە.

٥) موژدە پێبەخشران لە دنیاو دواڕۆژدا.

ئنجا هەرچەندە دۆستەكانی خوا، بە هەر كام لەم پێنج سیفەتانە پێناسەكراون، بەڵام ئیمانو تەقوا (الإيمان والتقوى) دوو سیفەتی ڕاستەوخۆی ناسێنەریانن.

كەواتە:

سەنگی مەحەكو تەرازووی هەڵسەنگاندنی دۆستەكانی خوا، بریتییە لە ئەندازەی بەهرەمەندبوونیان لە بڕواو پارێزكاریی، كە ئەمانیش ئەگەر بە جیا جیا باس بكرێن، هەر كامیان سەرجەم ئاینو بەرنامەی خوا بەڕواڵەتو پەنهانەوە دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر پێكەوە باسكران، (ئیمان) حاڵەتی ناسینو زانینو ملكەچییو قبووڵكردنی دەروونییو، (پارێزكاریی)یش پابەندییو جێبەجێ كردنو گەردن كەچیی ڕواڵەتییو ئاشكرا دەگەیەنن.

كەواتە:

هەر كەسێك ئیمانو تەقوای بەیەكەوە تێدا كۆنەبنەوە، ناگونجێ بەدۆستی خوا دابنرێ، بۆ وێنە: منداڵی گچكە، شێت، ئینسانی گوناحبار... مادام وابێ، ئەوەی كە هەندێك كەس لە خەڵكی عەوام بە ئەهلی طەریقەتیشەوە لەنێوانیاندا باوە، كە زۆرجار ئینسانی شێتو گێلو حۆل، كە تەنانەت عەقڵی پاكو خاوێنیشیان نیە، یان كەسێك، كە هیچ شارەزاییەكی لە شەریعەتو حەڵاڵو حەرامو چاكو خراپدا نیە، یان كەسێك، كە نوێژ، یان ڕۆژوو، یان هەر فەرزێكی دیكە دەچوێنێ، یان بە ئیسپات دەستی لە گوناحو خراپەدا هەیەو لەسەریشی بەردەوامە، یان كەسێك، كە

وابەستەو دابەستەی کۆمەڵو لایەنێکی کافرو دژ بە خواو ئیسلامە...هتد، بە وەلیىو دۆستی خوا دەزانن، ئەوە گومانو بۆچوونێکی هەڵەو ناشەرعییە، ئاخر کێ هەیە هێندەی خوا بە دۆستەکانی خۆی ئاشنا بێتو بیانناسێ! دەجا خوای زاناو پەنهان بین، بەو جۆرە، کە گوتمان دۆستو خۆشەویستەکانی خۆی پێناسە کردوەو، هیچ کەسیش بۆی نیە مادام ڕێز لە شەرعی خواو عەقڵی خۆی بگرێ، لە پێناسەو تەرازوو و پێوەری خوا لابدات.

شایانی باسیشە، کە مادام هەرکام لە ئیمانو تەقوا چەندان پلەیان هەن، دیارە دۆستانی خواش هەروانو، دۆستی خوا بوونیش گوێرەییو ڕێژەیی (نسْبي)یەوە، تەنیا پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دۆستانی ڕەهاو پلە یەکی خوانو، دوای ئەوانیش پلە پلەو پێ بە پێیە.

ئێستاش بۆ زیاتر بەرچاوڕوونیی، با چەند دەقێکی سوننەتو، چەند قسەیەکی زاناو پێشەوایانیشمان دەربارەی پێناسەی دۆستانی خوا بێنینەوە:

١- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ تَعَالى يَقُولُ: مَنْ عَادَى لِيَ وَلِيّاً، فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ...}(١).

واتە: خوای بەرز دەفەرموێ: هەرکەس دژایەتیی دۆستێکم بکات، ئەوە جاڕی جەنگم لە دژی داوە.

٢- هەروەها لە وەڵامی پیاوێکدا، کە لێی پرسی: {يَا رَسُولَ اللَّهِ مَن أَولِيَاءَ اللَّه ؟! قَالَ: (الَّذِينَ إِذَا رُؤُوا ذُكِرَ اللَّهُ)}(٢).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ! دۆستانی خوا کێن ؟!، فەرمووی: ئەوانەن کە کاتێك دەبینرێن، خوا دەکەوێتەوە یاد.

٣- هەروەها فەرموویەتی: {إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ عِبَاداً يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ قِيلَ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهَ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ؟ قَالَ: قَوْمٌ تَحَابُّوا فِي اللَّهِ مِنْ غَيْرِ

(١) رَوَاهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٦١٣٧)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٣٤٧)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.
(٢) رَوَاهُ البَزَّار، برقم: (٥٠٣٤)، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا.

أَمْوَالٍ، وَلاَ أَنْسَابٍ، وُجُوهُهُمْ مِنْ نُورٍ، عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ، لاَ يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ، وَلاَ يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢﴾}[1].

واتە: بێگومان خوا لەنێو بەندەکانیدا هەندێك بەندەی هەن، کە پێغەمبەرانو شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن! گوترا: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)؟! فەرمووی: کەسانێك، کە لەبەر خوا یەکدییان خۆشدەوێ، بەبێ ماڵو سامانو خزمایەتیی (لە نێواندا هەبوون)، ڕوویان درەوشاوەیەو لەسەر چەند دوانگەیەکی درەوشاوەن، کاتێك، کە خەڵکی دەترسن، ئەوان بێباکن، لەکاتی دڵتەنگییو پەژارەشیاندا، ئەوان بێ خەمن، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢﴾.

٤- (أبو عثمان النيسابوري) لەوبارەوە گوتوویەتی[2]: {(مَنْ أمّرَ السنّة على نَفْسِهِ، قولاً وفعلاً، نطق بالحكمة، ومَنْ أَمَّرَ الهَوى على نَفْسِهِ، قولاً وفعلاً، نطقَ بالبِدْعة، لِقولِهِ تعالى: ﴿... وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْ... ٥٤﴾ النور}.

واتە: هەرکەسێك لە قسەو کرداریدا سوننەت بەسەرخۆیەوە بکاتە حوکمڕان، حیکمەتی لێ دەبیسترێ و، هەر کەسێکیش لەقسەو کرداریدا بەقسەی ئارەزووەکانی بکات، بیدعەتی لێ دەبیسترێ، چونکە خوای بەرز فەرموویەتی: {ئەگەر فەرمانبەریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەن، ڕێی ڕاست دەگرن}.

(١) رَوَاهُ ابْنُ جَرِير، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٢٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٧٣)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

(٢) بڕوانە: (تفسير القاسمي)، ج: (٩)، ص: (٥٩).

٥- هەروەها (إبن تيمية) لەوبارەوە لە نامیلکەیەکیدا بەناوی (الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان)دا، شتی زۆر چاکی گوتوە، بۆ وێنە:

أ- { * دۆستانی خوا (بەگشتیی) دوو چینن: پێشکەوتووانو نزیکخراوان (سابقون و مقرَّبون) و میانەڕەوانی لای ڕاست (أصحاب يمين مقتصدون)، کە خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێکی کتێبی خۆیدا باسی کردوون، ئنجا هەرچی چاکەکارانی لای ڕاستن، ئەوانەن، کە تەنیا بە ئەنجامدانی فەرزەکانو خۆپاراستن لە قەدەغەکراوەکان، لە خوا نزیك دەکەونەوە، بەڵام ئەنجامدانی سوننەتەکانو وازهێنان لە زیادەی شتە موباحەکانو ئەوانەیان نیە، بەڵام پێشکەوتوە نزیکخراوەکان، شتە ناپەسەندەکان (مکروهات)یش دەست لێ هەڵدەگرن .

ب- * دۆستانی خوا بەهیچ دروشمو نیشانەیەکی ئاشکرا لە خەڵکی جیا ناکرێنەوە، وەك بەرگو پۆشاکی تایبەتییو، سەرتاشین یان کورتکردنەوەی یان هۆنینەوەی، مادام هەموویان موباح بن، بۆیە گوتراوە: (کم من صِدّيق في قباء، وكم من زنديق في عباء) واتە: زۆر بڕواپتەو لە پۆشاکی ئاسایی دان و، زۆر زەندیقیش عەبا لەبەرن.

ج- * دۆستانی خوا لە هەموو چینو توێژەکانی ئۆممەتی موحەممەددا (صلى الله عليه وسلم) هەن، مادام لە ئەهلی بیدعەتو گوناحە ئاشکرایەکان نەبن، لەنێو ئەهلی قورئانو، ئەهلی زانستو، ئەهلی جەنگو چەكو، لەنێو بازرگانو، خاوەن پیشەو جووتیارانو... هتددا دەبن... پێشینان (سلف) بە خەڵکی زۆر بەدینو شارەزایان دەگوت: قورئان خوێنەکان (القرّاء) کە زانایانو خواپەرستانیش دەگرێتەوە، پاشان ناوی صۆفییانو هەژاران (الصوفية و الفقراء) پەیدا کرا..

د- * بۆ دۆستی خوا (وليّ الله) بەمەرج نەگیراوە، کە لە هەڵە پارێزراو (معصوم) بێتو، تووشی هەڵەو خراپە نەبێت، بەڵکو دەگونجێ، کە بەشێك لە زانیاریی شەریعەتی لێ پەنهان بێت و، هەندێك شتی دینی لێ تێکەڵ

بێـت، هــەتا هەندێك شت، كە خوا فەرمانی پێی كردوە، وابزانێ خوا قەدەغەی كردوەو، دەگونجێ هەندێك شتی نائاسایی (خارق العادة) بــە كەرامــەت بزانــێ، بەڵام لەڕاستییدا لە شەیتانەوە بێت بۆ سەرلــێتێكدانیو، لەبەر كەمو كــورتییو پلەو پایەی دۆستایەتییەكەی، نەزانێ كە ئەوە لە شــەیطانەوەیە، هەرچەندە بەم شتانەش لە دۆســتایەتیی خوا ناشــۆرێ، چونكــە خــوا چــاوپۆشیی كــردوە لــە هەڵەو، لەبیــرچوونەوەو، تۆبــزیی لــێكــران (الخطأ والنسیان ومـا اسـتكرهوا علیـه).

هـ- * كەواتــە: دۆســتانی خــوا (أولیـاء الله) بە سیفەتو كردەوەو ڕەفتارەكانیان، كە قورئانو ســوننەت ڕوونیان كردوونەوەو، بە ڕووناكــیی ئیمانو قورئــانو بــە حەقــیقــەتە پەنهانــەكانی ئیمــانو بەرنامــەو دروشمــە ئاشــكراكانی ئیســلام، دەناســرێن.

و- * ... ئنجـا مـادام وابێ، ئەگــەر بـابایەك حەز بە پیسو پۆخڵـیو ڕەفتاری نـاقـۆڵا بكـات، كە شـەیطانەكـان حەزیـان لـێ دەكـەن، یـان كـەیفی بـەنێو گەرماوو ئاودەستو شوێنی پیس بێـت، كە شوێنی شەیطانەكانــە، یـان مــارو دووپشــكو زەردەواڵــەو گوێچكــەی ســەگـان بخـوات، كە شــتی پیســـن، یـان میــزو شــتی پــیس، بخـواتــەوە، یـان لــە غــەیری خـــوا وەپـــاڕێو هـــاواری دروســتكراوەكـان بكاتو ڕوویـان تــێ بكـات، یـان بـەرەوڕووی شــێخەكـــەی سەجدە ببـات... یـان بچـێتــە گۆرســتانەكانو تێیـانـدا بمێنـێتەوە... یان حەز بە بیســتنی قورئان نەكـاتو لــێی بســـڵەمێتەوەو، گــوێگرتن لــە گـــۆرانییو ئـــامرازی شـــەیطانیــی بەســـەردا هــەڵــبژێرێ.. ئـا ئەوانــە لــە نیشـــانەو دروشــمەكانی دۆســتانی شــەیطانن، نەك دۆســتانی خوای بەخشــندە[1] }.

---

(١) بڕوانە: (تفسیر القاسـمي)، ج: (٩) ص: (٥٣- ٥٩)، كـە لـە نامیلكــەی نـاوبراوی وەرگرتــوە، خـوا پاداشتی نووسەرو وەرگێڕ بداتەوەو، پلەو پایەیان بەرزتر بكاتەوە، هەروەهـا بڕوانە: (مجموعة الفتــاوی)، ج: (١١)، ص: (٩٠ - ١٦٩).

### ٢- كـەرامەت (الكرامة) چییە؟!

ئاشكرایە كەسێك كەسێكی خۆشبوێ، ڕێزو حورمەتی دەگرێ، خـوای بێوێنەو بەخشەریش، بێگومان ڕێزی دۆستو خۆشەویستانی خۆی دەگرێو، وشەی (كرامة)یش، كە بۆ دۆستانی خوا (أولیاء الله) بەكارهاتوە، هەر لەسەر ئەو بناغەیە، بەڵام وەك زۆر بابەتو مەسەلەی دیكە، ماناو چەمكە ئەسڵییەكەی گۆڕاوەو شتی دیكەی ڕەگەڵ خراوە، هەتا وای لێهاتوە، ئێستا لەبیرو زەینی زۆربەی خەڵكیدا، بە بیستنی وشەی كەرامەت، یەكسەر شتی یاسادڕ (خارق العادة)ی وەك فڕینو، بەسەر ئاودا ڕۆیشتنو، نیازی نێو دڵ زانینو، شتی سەرسوڕهێنەر ئەنجامدان، پەیدا دەبنو، پێیان وایە هەر كەسێك ئەو جۆرە شتانەی لێ بینران، یان بیسران، ئەوە ئەهلی كەرامەتەو لەلای خوا بەقەدرو حورمەتە، با دینداریی‌و پابەندییەكەشی بە شەرعەوە جێی گومانو مشتومڕ بێت !!

بەڵام هەركەسێك ئەو شتانەی پاڵ نەدرانە لا، هەرچەندە یەكجار صالحو پارێزكارو دیندارو چاكەكار بێت، ئەوە هیچ نیەو جارێ هەر لە ئاستی خەڵكی عەوامو ئاسایی دایەو، شتێكی شایانی باسی پێنیە !!

بەڵام بێگومان ئەو بیرو بۆچوونە عەوامانەیە، هەڵەیەو، هیچ بەڵگەیەكی شەرعیی لەسەر نیە، وەك زاناو پێشەوایانی هۆشیارو دڵ بێدار گوتوویانە: (الإِستقامة عَلَى الشريعَة أعْظم كَرَامَةً)، واتە: ڕاوەستاویی‌و دامەزراویی لەسەر جادەی شەریعەت، گەورەترین كەرامەتە، واتە: باشترین جۆری ڕێزو حورمەت گرتنی خوا، لە بەندەیەكی دۆستو نزیكی خۆی ئەوەیە، كە یارمەتیی بدات، هەمیشە لەسەر ڕێبازو جادەی شەریعەت بێتو لانەدات.

چونكە ئا ئەوەیە، كە بە دۆستانی خوا (أولیاء الله) نەبێ ئەنجام نادرێ، ئەگەرنا، شتی سەیرو عەجایب، وەك لە بەشی شەشەمدا باسی دەكەین، خەڵكی ئاسایی‌و بگرە خەڵكی بێ دینو كافریش دەتوانن، ئەنجامی بدەن !

ئەوەی گوتیشـمان دەقەکـانی قورئانو سـوننەت دەیگەیەنن‌و، ئەمەش بەڵـگـە:

أ/ خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿... إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ... ﴿١٣﴾﴾ الحجرات، واتە: بێگومـان بەڕێزترتـان لـەلای خوا پارێزکـارترتـانە.

کـەواتە:

پارێزکاریی (تَقْـوی)، کە بریتیە لـە پابەنـدیی ڕواڵـەتیی‌و دەروونیـی بـە وردو درشـتی ئیسـلامەوە، تەرازووو سـەنگی مەحەکـی لە خـوا نزیکـبوون‌و، لـەلای خـوا بەڕێـزو حورمـەتـبوونە، نەك شـتێکی دیکـە، مـادام وابـێ، بـۆ زانینـی ئەوە، کـە ئـایـا فـلانکەس ڕێزو حورمـەتی لـەلای خـوا هەیـە، یـان نـا ؟! بـە زاراوەی خەڵـکـی عـەوام: ئـایـا کەڕامەتـدارە، یـان نـا؟! ئـەوە دەبـێ سـەرنجی ڕاددەی پارێزکـاریی‌و پابەنـدیی بدەین، نەك شـتی دیکـەی لـێ بکەینـە نیشـانە، کە بـە یاسـادڕەکان(خـوارق) ناسـراون، چـونکە ئایەتەکـە فەرموویـەتی هۆکـارو نیشـانەی ڕێـزو حورمـەت‌و کەڕامەت هـەبوون، پارێزکـارییـە.

ب/ گـومانی تێدا نیـە، کە هەرکەسـێك دۆست (وَلـيّ)ی خوا بێت، لەلای خوا ڕێـزو پایـەو حورمەتی تایبەتی خۆی هەیە، واتە: هەموو (وەلـییەك خاوەن کەڕامەتـە)، دەجا خوای دادگەریش ڕایـگەیاندوە، کـە هەرکەسـێك پارێزکـار (مـتّقـي) بێـت، دۆسـتی خوایــە، وەك فەرموویــەتی: ﴿... وَمَا كَانُوٓاْ أَوْلِيَآءَهُۥٓۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾﴾ الأنفال.

واتـە: ئەوانـە (هاوبەشـدانەرەکان) دۆسـتی خـوا نـین، دۆسـتانی وی تەنیـا پارێزکـارانن، بـەڵام زۆربەیـان نـازانن.

کـەوابێ، ئەگـەر مەسـەلەکە وەك هـاوکـێشـەیەك دابڕێژین، ئـاوا دەردەچـێ:

هەموو پارێزکارێك دۆسـتی خوایـە، هـەموو دۆسـتێکی خـواش خـاوەن ڕێـزو کەڕامەتە، کەواتە: هەموو پارێزکارێك خاوەن کەڕامەتە.

ئنجا گومانیش لەوە دانیە، کە هەموو ئەوانەی پارێزکارن، شتی سەیرو عەجایبو یاسادڕ(خارق العادة)یان لێ نەبینراوە، کەواتە دەبێ هەر خودی ئەو پارێزکارییو ڕاوەستاوییە لەسەر شەریعەت (التقوى والإستقامة على الشريعة)ە، بریتی بێ لەو ڕێزو حورمەتو کەرامەتەی، کە خوای بەخشەر بە دۆستانی صالحو پارێزکاری خۆی بەخشیویەتی.

ج/ ئەم فەرموودەیەش هەمان شت دەگەیەنێ:

{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيَّ صَلىَّ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ أَنَّهُ سُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَكْرَمُ ؟ قَالَ: أَتْقَاهُمْ}[١].

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرا: ئایا کێ لە هەموو خەڵکی بەڕێزترە؟! فەرمووی: پارێزکارترینیان.

## ئاگاداریی:

نابێ هیچ کەسیش بە هەڵە لەم قسانەمدا وا حاڵیی بێت، کە گوایە من دەڵێم: دۆستانی خوا خاوەنی کەرامەت نین، بە چەمكو واتای عورفییو عەوامانەکەی !! نەخێر من مەبەستم ئەوە نیە، چونکە ئەوە ڕاستییەکی نکوولّیی لێنەکراوو سەلمێنراوەو، چەندان دەقی قورئانو سوننەتو ئەزموونی ڕوونو مشتومڕ هەڵنەگری دۆستانی خوا، بەڵگەینی، بەڵام من ویستوومە بڵێم: کەرامەتی دۆستانی خوا (کە مەبەست ڕێز لێگرتنی خوایە بۆیان، بە ماناو چەمکە قورئانییو سوننەتییە ڕاستەکەی) بەر لە هەموو شتێك بریتییە لە پارێزکارییو دینداریی و ڕاوەستاوییان لەسەر جادەی شەریعەت، کە بەبێ ئەوە (دۆستی خوا بوون) ئیسپات نابێ، ئەمەش بریتییە لەو ڕێزو حورمەت لێگیرانەی، سەرجەم دۆستانی خوا کەمو زۆر تێیدا بەشدارنو، هیچ کەس بەبێ ئەم جۆرە کەرامەتە - کە کەرامەتی ڕاستەقینە هەر ئەمەیە - بە دۆست (وَلِيّ)ی خوا دانانرێ، بەڵام شتی سەیرو سەرسوڕهێنەر بۆ خەڵکی عەوام،

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ برقم: (٤٤١٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٣١١)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٤٨).

کە بە یاسادڕەکان (خـوارق) ناسـراون، ئـەوە تێکـڕا بـە شـتێکی لاوەکـییو جوزئـیی دادەنرێن، کە مەرج نیە بە هەموو دۆستانی خوا بدرێنو، مەرجیش نیە ئەوانەی، کە ئـەو جۆرە شتانەیان لـێ ببینرێ، بەڕێزترو پایەبەرزتر بن — لـەلای خـوا - لەوانـەی دیکـە، کە لـێیان نابینرێن.

کۆتایی ئەم باسەش بەچەند قسـەیەکی زۆر بەنرخی یەکێـك لـە زانـاو پێشـەوایانی بواری عیـرفانو تەزکیەی نەفـس دێنم، کە ئەویش (أبو علي الجوزجاني)یـە:

گوتوویەتی: {(كَنْ طالِباً للإستقامة لا طالِباً للكرامة، فَسبيل الصّادق مطالبة النّفس بالإستقامة، فهي كل الكرامة، ثم إذا وقع فـي طريقهِ شيء خارقٌ، كـان كـأنْ لْـم يَقَـعْ ولا يُبالي، ولا يَنقُصُ بِذلك، وإنما ينقُصُ بالإِخْلالِ بواجبِ حق الإستقامَةِ).(١)

واتە: بەدوای ڕاوەستاویی لەسەر شەریعەت (الإستقامة)دا عـەودالْ بـە، نـەك بـەدوای کەڕامەتـدا، چونکە ڕێبازی خواپەرستیی ڕاست ئەوەیە، کە داوا لە نەفسی بکات لەسـەر جادەی شەرع دامەزراوو نەلـەخشـاو بێ، کـەڕامەت سەرتـاپا لەوە دایە، پاشان ئەگەر لە ڕێگـایـدا شـتێکی نائاسـایی (خـارق العـادة) دی، با هـەروا بزانێ، کە هـیچ نەبـووەو گوێـی پێ نـەدات، ئەگـەر وابکـات ئەو شـتە زیـانی لـێ نـادات، بەڵـکو بـەوە کـەم دەکات، کە ئەو ئەرکانەی مافی ڕاوەستـاوین لەسەر شەریعەت، کەمتەرخەمییـان تێـدا بکـات}.

لـەم قسـە بەهێزو پێزانەی ئـەو پێشـەوا خـواناسـەوە دەزانـین، کـە ئـەوەی لـەنێو خەڵـکـیدا باوەو ناوی کەڕامەتی بەسەردا بڕاوە، لـەلای پێشـەوایانی ڕەسـەن شـتێکی شـایانی بـاس نیـەو، بگـرە ئەگەر خـاوەنەکەی خۆی پێوە خەریك بکـات، زیـانیشـی پێ دەگـەیەنێ.

(١) بڕوانە: (مجموعة الفتاوى)، ج: (١١)، ص: (٣٢٠، ٣٢١)، شيخ الإسلام ابن تيمية.

## تەوەری هەشتەم:

## خورپەو خەون (الإلهام و الرؤيا)[١]و هەڵسەنگاندنیان:

مەسەلەیەکی دیکە، کە بۆتە جێگای کێشەو مشتومڕی زۆرو، تێدا بەهەڵەداچوونی گەلێك کەس، مەسەلەی خورپەو خەونو ئەو زانیاریی‌و شارەزاییانەیە، کە لەڕێی وانەوە ئینسان دەستگیری دەبن.

ئێمە خوا پشتیوان بێ لە سێ بڕگەدا، ئەو مەسەلەیە دەتوێژینەوە:

١/ پێناسە:

أ- مەبەست لە وشەی (إلهام)، کە من بە کوردیی وشەی (خورپە)م بۆ هەڵبژاردوە، بەو جۆرە زانیارییە دەگوترێ، کە ئینسان بەبێ بەڵگەهێنانەوەو بیرکردنەوە، دەخرێتە دڵییەوە، چونکە زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە:

{الإِلهام: في اللغة: التلقين (أَلْهَمَهُ اللهُ الخيرَ أي لَقَّنَهُ إيَاهُ).}[٢]، وفي مصطلح أهل التصوف: {هو النّفث في الرُّوْعِ والإيقاع في القلب من العلم الغير القائم على الإستدلال والنظر}[٣]. واتە: (الإلهام) لە زماندا: فێرکردنە، دەگوترێ: خوا ئیلهامی چاکەی بکات، واتە: چاکەی فێر بکات، لە زاراوەی ئەهلی تەصەووف دا: بریتییە لە زانیارییەکی، کە لەسەر بەڵگە هێنانەوەو ڕامان بنیات نەنراوە، بخرێتە نێو عەقڵ و دڵەوە —لەلایەن فریشتانەوە-.

---

(١) ئەم باسەم بە پوختەکراوی لە یەکێك لە دەرسەکانی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) وەرگرت، کە ئێستا ستایش بۆ خوا چاپ کراوە، بڕوانە: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...)، بەرگی دووەم.

(٢) بڕوانە: (القاموس المحيط).

(٣) بڕوانە: (معجم مصطلحات الصوفية)، ص: (٢٣).

چەند وشەیەكی دیكەش هەن كە هەمان واتا، یان واتایەكی زۆر نزیك لێیەوە دەگەیەنن، وەك (الكَشْف، الحَدْسْ، الذَّوق، البصيرة، العلم اللَّدُنِّي،...).

ب- مەبەست لە وشەی خەون (رؤيا) ئەوەیە، كە ئینسان لەكاتی خەوتندا دەیبینێ‌و، هەموومان دەزانین چییەو، دواتریش زیاتر تیشكی دەخەینە سەر.

**٢/ بەڵگەی ڕاستبوونی زانیاریی وەدەستهێنراو، لەڕێی خورپەو خەونەوە:**

زانایان سەرجەم لەسەر ئەوە، كە دەگونجێ لەڕێی هەركام لە خورپەو خەونەوە، ئینسان زانیاریی‌و شارەزایی دەستگیربێ، یەكدەنگن‌و، ئەم دەقانەش بە بەڵگە دێننەوە:

**یەك: خورپە:**

أ) ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر پارێزكاریی لە خوا بكەن، زانیارییەكی جیاكەرەوە(ی هەق‌و ناهەق)تان پێ دەبەخشێ.

ب) {لَقَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ}[1].

واتە: بەدڵنیایی لە ئۆممەتانی پێشووتان دا خورپە بۆكراو هەبوون، ئنجا ئەگەر لە ئۆممەتی من دا هیچ كەس هەبێ، عومەری كوڕی خەتتاب لەوانە.

ج) {اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ، فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللهِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَـٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾الحجر}[2].

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٣٥٧)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٩٣) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا.

(٢) أَخْرَجَهُ السيوطي فِي (الدر الْمنثور) والبُخَارِي فى التاريخ الكبير، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣١٢٧)، وَقَالَ: حَدِيث غريب، وَرَوَاهُ الطَّبَرِي وَغَيْرهُم عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وضَعَّفَهُ الألباني في (السلسلة الضعيفة) برقم: (١٨٢١).

واتە: لەبەر چاوڕوونیی‌و سەرناسیی بڕوادار پارێز بکەن، چونکە بە ڕووناکیی خوا دەڕوانێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (بێگومان لەوەدا نیشانە گەل هەن بۆ دلڕۆشنان).

**د/** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: مَا سَمِعْتُ عُمَرَ لِشَيْءٍ قَطُّ، يَقُولُ: إِنِّي لَأَظُنُّهُ كَذا، إِلاّ كَانَ كَمَا يَظُنُّ}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گوتوویەتی: هیچ کاتێك نەمبیستوە عومەر (بابم) بە شتێك بڵێ: پێم وایە ئاواو ئاوایە، حەتمەن هەر وابووە، کە پێی وابووە.

**هـ/** (أبو بكر الصديق) (خوا لێی ڕازی بێ)، هەواڵیدا، کە ئەو کۆرپەیەی نێو زگی خێزانی، کچۆڵەیە[2].

**و/** بانگ هێشتنی عومەر خوا لێی ڕازی بێ لە مەدینەوە بۆ (سارية بن زنيم الدئلي)، کە فەرماندەی سوپای مسوڵمانان بوو لە وڵاتی فارس‌و، ئەویش گوێبیستی بوو، کە گوتی: (يا سارية الجَبَلَ) ئەی ساریە ! بچۆ بۆ شاخەکە، ئەویش وایکردو قوتاری بوو[3].

**ز/** ڕەخنەگرتنی (عثمان بن عفان) خوا لێی ڕازی بێ لە پیاوێك، کە لێی وەژوورکەوت، کە بۆ ئافرەتی نامەحرەمی ڕوانیوە! کابراش گوتی: أَوحِيٌ بَعْدَ رَسُولِ الله ؟! قَالَ: (لاَ وَلَكِن فراسة صَادِقَة).

واتە: ئایا پاش پێغەمبەری خوا، وەحیی هاتوە؟!، گوتی: نەء، بەڵام دلڕۆشنییەکی ڕاستە[4].

---

(١) رَوَاهُ البُخَارِي، برقم: (٣٦٥٣)،.

(٢) بڕوانە: (مجموعة الفتاوى)، ج: (١١)، ص: (٣١٨).

(٣) بڕوانە: (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة)، ج: (٩)، ص: (١٢٧- ١٢٩)، (كرامات أولياء الله).

(٤) بڕوانە: (إحياء علوم الدّين)، ج: (٣)، ص: (٢٥).

دوو: خەون:

أ/ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ، جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ}[(١)].

واتە: خەونی چاك لە پیاوی صاڵحەوە، بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی: (یانی: جۆرێكە لە وەحیی).

ب/ هەروەها فەرموویەتی: {الرُّؤْيَا ثَلاثٌ: فَالرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ بُشْرَى مِن اللَّهِ، وَالرُّؤْيَا تَحْزِينٌ مِن الشَّيْطَانِ، وَالرُّؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ بِهِ الإِنْسَانُ نَفْسَهُ}.

واتە: خەون سێ جۆرە: خەونی باش لە خواوەیە، خەونێك، كە دڵتەنگكەرە لە شەیطانەوەیە، خەونێك، كە بریتییە لەو شتانەی مرۆڤ لە كاتی بێداریی دا بە دڵیدا دێن و، بیریان لێ دەكاتەوە[(٢)].

ج/ عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: {رُؤْيَا الأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ}[(٣)].

واتە: خەونی پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەحییە.

د/ (ابن قيم الجوزية)ش گوتوویەتی: (وَ رُؤيَا الأَنْبِيَاء وَحِيٌ، فإِنَّها مَعْصومَةَ مِن الشيطان باتفاق الأُمَّة)[(٤)].

هـ/ هەروەها ڕاست دەرچوونی خەونی هەركام لە (ملك)ی میصر و دوو هاوەڵە زیندانییەكە (صاحبي السِّجن)، كە لە سووڕەتی (يوسف)دا گێڕراونەوە، ئایەتەكانی: (٣٦-٤٩)، كە (يوسف) (سەلامی خوای لێبێ) بۆی لێكدانەوە،

(١) أَخْرَجَهُ مَالِك، برقم: (١٧١٣)، وَأَحْمَد، برقم: (١٢٢٩٤)، وَالبُخَارِي، برقم: (٦٥٨٢)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٣٨٩٣)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٦٠٤٣).

(٢) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ، برقم: (٨١٧٤)، وَالدَّارَمِيُّ، برقم: (٢١٤٣) وغيرهُ، واللَّفظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ حسين سليم أسد.

(٣) أَخْرَجَهُ الحَاكِم فِي (مستدركه)، برقم: (٨١٩٧)، بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) القرطبي: ج: (٨)، ص: (١٠٢).

(٤) بڕوانە: (مدارج السالكين شرح منازل السائرين)، ج: (١)، ص: (٥١).

بەڵگەیەکی دیکەی زۆر پتەوە، کە لەڕێی خەونەوە زانیاریی ڕاست وەدەست دێ، تەنانەت، ئەگەر خەونی بابای کافرو بێدینیش بێت !!

### ٣/ هەڵسەنگاندن (التقييم):

هەڵسەنگاندنی خۆمان بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو زانیارییانەی، لەڕێی هەرکام لە ئیلهامو خەونەوە دەستگیر دەبن، لەم چوار خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

**یەك:** هەم خورپەو، هەم خەونیش، شتی گشتیی نین، وەك وەحییو عەقڵو پێنج هەستەکان، بەڵکو تایبەتن بە هەندێك کەسو هەندێك حاڵەتەوە، بە سەرنجدانی دەقەکانی قورئانو سوننەتیش، کە لەوبارەوە هاتوون، ئەو مەسەلەیە بە ڕوونیی دەردەکەوێ، بۆ وێنە: خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ الكهف.

واتە: (مووسا و هاوەڵەکەی) بەندەیەکیان لە بەندەکانمان بینی، لەلایەن خۆمانەوە بەزەییەکی تایبەتمان پێدابوو و زانیارییەکی دانسقەمان پێبەخشیبوو.

وەك دەبینین: هەم سەرجەم ڕستەکەو، هەم وشەی (مِنْ)یش، کە بۆ بەشێك(تَبعيضْ)ە، بە ئاشکرا ئەوەی گوێمان دەیگەیەنن، هەروەها فەرموویەتی: (الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ)، کە دەبینین، هەم خەونەکە قەیدی (حسنة)و، هەم پیاوەکەش قەیدی (صالح) یان چۆتە سەری، کەواتە: نە هەموو کەسێك و نە هەموو خەونێکیش، جێی متمانەو ئیعتیبارن.

**دوو:** هیچ کەس بۆی نیە ئەو زانیارییەی، کە لە ڕێی خورپە، یان خەونەوە دەستگیری دەبێت، وەك شەرعو جیا لە شەرع سەیری بکات، بەڵکو دەبێ لەبەر ڕۆشنایی شەرعدا وەریبگرێ، (أبو سليمان الداراني) لەوبارەوە گوتوویەتی: (قدْ تَقَعُ في قلبي نُكْتَةٌ من نكت القومِ، فلا أقبلها إلاّ بشاهِدَيْ عَدْلٍ: الكتاب

والسـنة). واتە: جاری وایە مەسەلەیەك لە مەسەلەكانی ئەو كۆمەڵەم دەچێتە دڵەوە، بەڵام بە دوو شایەدی دادگەر نەبێ وەریناگرم: كتێب و سوننەت.

هـۆی ئەمەش ئەوەیـە، كـە هەر كام لە خورپەو خەون، سێ جۆرنو، مەگـەر چـۆن دەنـا ئینسـان دڵـنیا نابێ، كە ئایا ئەو خورپەیە، یان ئەو خەونە، لە كـام جۆرەیـە، پێشـتـر ئـەو فەرموودەیـەمان هێنایـەوە، كـە جۆرەكـانی خـەونی باسـكردن، بـۆ جۆرەكـانی خورپـەش، زانـایـان هـەمان ڕایـان هـەیـە: (ابـن حجـر العَسـقلاني) گـوتوویەتی: (... وبأن الخاطِرَ قد يكـون من الشـيطان وقـد يكـون مـن الـنفْسِ)[١].
واتە: خورپەش دەگونجێ لە شەیتانەوە بێ و، دەشگونجێ لە نەفسـەوە بـێ (هەڵبەتـە وێڕای فریشتەش).

ئنجا بـابەت (موضـوع)ی خـورپـەو خـەونیش، لە سـێ حـاڵان بـەدەر نیـە: یـان پێچـەوانەی شەرعە، كە دەبێ ڕەد بكرێتەوەو وەرنەگیـرێ، یـان گونجـاو (موافـق)ە، ئەوە وەردەگیـرێ، یان هیچ كام لەم دوو لایەی دیار نین، ئەوە وەك موبـاح دادەنـرێو دروستە كاری پێ بكرێ، (ابن الحجر) لەوبـارەوە گـوتوویەتی: {والذي عليـه الجمهـور أنه لايجوز العمل به (أي بالإلـهام)، إلاّ عند فَقْدِ الحُجَج كلِّها فـي بـاب الـمباح}[٢].
واتە: ئەو ڕایەی زۆربەی (زانایان) لەسەرنی ئەوەیە، كە دروست نیـە كـاری پێبكـرێ (یانی: بەخورپە) مەگەر لەبواری ڕەواداو، دوای نەبوونی هیچ بەڵگەیەكی دیكەش.

**سێ:** وێڕای ئەوە، كە نابێ بابـەتی خورپـە، یـان خەونەكـە ناشـەرعیی بێـت، ئەوجـار ئیعتـیبـاری پێ دەكـرێ، خـودی بـابـای خورپـە بـۆ هـاتوو، یـان خـەون دیتـوو، خۆیشی، نابێ لە ڕێـیەكی ناشەرعییـەوە هـەوڵی وەدەستـهـێنانی ئـەو زانیـاریی‌و شـارەزایـیـەی دابـێ، وەك: وازهێنـان لـە فەرزەكـان، زۆر خـۆ ئەزیەتـدان، دووركـەوتنەوە لە قورئـان، پەنـا بردنەبـەر چـەند جـۆرە عـیبادەتێكی داهێنـراو (بِدْعي)، گۆشەگیـریی یـەكجاریی لـە كۆمەڵگـا...هتد، كـە بەداخـەوە زۆرجـاران خەڵـكی مسـوڵمـان بەگشـتیی‌و ئەهلـی طـەریقەت بەتایبەت، گیـرۆدەی ئەو جۆرە

(١) بڕوانـە: (فتـح البـاري)، ج: (١٤)، ص: (٤١٧).
(٢) هەمان سـەرچاوەو بـەرگو لاپەڕە.

ڕەفتارانە بوو ون، بەهـۆی بێئاگایی لە قورئانو سـوننەتو ڕێـو شـوێنی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) و هـــاوەڵە بەڕێزەکـــانی (رضـي الله عـنهم)و شـوێنکـــەوتوە ڕەسـەنەکانیـانەوە، ئـنجـا هـۆی ئەوەش، کە: ئەگـەر بابای خاوەن خورپـەو خـەون، بەهۆی ئەو جۆرە ڕەفتارە ناشەرعییە داهێنراوانەوە، زانیـارییەکـی دەسـتـکـەوت، جێـی ئیعتیبار نیەو متمانەی پێ ناکرێ، ئەوەیە، کە هەر شتێك لە ڕێی شـەرعیی‌و ڕاستو دروسـتەوە نـەبێ، دڵنیـا نـابێ، کـە ڕاسـتەو زیـاتر گومـانی هەڵـەیی‌و ناتەواویی لـێدەکرێ، خـوای کاربـەجێ لەوبـارەوە فەرموویـەتی: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ...﴿٥٨﴾﴾ الأعراف.

واتە: زەوی پـاكو چـاك بە فەرمانی پەروەردگـاری ڕووەکەکەی دێتە دەرێ، بەڵام هـی بێ پیـتو پیس، مەگەر شتی بێ خێرو کەم، ئەگەرنا هـیـچ سـەوز ناکـات...

پێغـەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ}(١).

واتـە: هەر کەسـێك لـەم ئـایینەمـانـدا شـتێك پەیـدا بکـات، کـە لـەوی(٢) نەبێـت، ئـەوە ڕەد کـراوەیە.

بە کـورتیی:

زانیـاریی دەسـتـــکەوتنو، دڵو چـاو ڕۆشنــبوونەوە، لەڕێــی خورپـەو خەونـــەوە، جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕێزگرتنی خوا لە بەندەکەی (کەرامەت)، ئەمـەش مەگـەر بـۆ بابایەکی پابەند بە شەرعەوە، ئەگەرنا مەیسـەر نـابێـت.

**چوار:** ئنجا لەو حاڵـەتانەشـدا، کـە خورپـەو خـەون دروسـتە کاریـان پـێ بکـرێ، بـە پێچـەوانـەی حوکـمو زانیـاریی شـەرعیی، کە هـەموو کـەس دەگرێتـەوە، خورپـەو خەون جگە لە خاوەنەکـەیان بـۆ کەسـی دیکـە نابنـە بەڵـگـــە، چـونکە دوو شـتی

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ، برقم: (٤٥٨٩)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٢٦)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.
(٢) واتە: بنچینە گشـتییەکانی شەریعەت نەیگرنەوەو، لەگەڵ ڕووحی ئیسـلامـدا نەگـونجێ.

تـایبەتیی‌و پەنهـانن، جگـە لە خـاوەنەکـەیان خەڵکی دیکە پێیـان نازانـێ، ئنجـا دیـارە لە حاڵـەتێکـی ئاواشـــدا بـووە، کـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بـە (وابصـــة)ی فـــەرمووە: {اسْتَفْتِ قَلْبَكَ وَاسْتَفْتِ نَفْسَكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ}[1].

واتە: پرس بە دڵـت بکـــەو پرس بەخـۆت بکـــە، سـێ جـاران (فـەرمووی)، چـاکە ئەوەیە، کە دڵ ئارامیی پێبگـرێ‌و، گوناحیش ئەوەیە دڵت پێـی ئاسوودە نەبێ‌و، لە سـینەتـــدا قـــرت‌و فـــرت بکـــات، هەرچـــەندە خەڵـکـــیش فتـــوات بـــۆ بـدەن‌و فتواشـــیان بۆ داوی.




---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد، بـرقم: (١٨٠٣٠)، وَاللَّفْـظُ لَـهُ، وَالدَّارِمِـي، بـرقم: (٢٥٣٣). بڕوانـە: (مجمع الزوائـد)، ج: (١٠)، ص: (٢٩٤).

تەوەری نۆیەم:

## بەهەڵەداچوون لە چەمك و واتای ڕاستەقینەی چەند وشەیەكدا:

گەلێك كەس بەتایبەت لە لایەنگرانو شوێنكەوتووانی ڕێبازەكانی عیرفانو تەصەووف، لە چەمك (مفهوم)و مەبەستی هەندێك وشەدا بەهەڵەدا چوونو، پاشان لەسەر بناغەی ئەو بۆچوونە هەڵەو ناتەواوانەیان، دیواری چەند ڕەفتارو هەڵسوكەوتێكی هەڵەو ناشەرعییان هەڵچنیوە، بۆ نموونە:

١/ وشەی (زهد) كە لە زمانی عەرەبییدا بەمانای بەكەمگرتن دێ، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی (یوسف) علیه السلام فەرموویەتی: ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ يوسف.
واتە: بە نرخێكی كەم، چەند دانە درەمێك فرۆشتیان و بە كەمیان گرت !

ئنجا دیارە زوهد لە ژیانی دنیادا، سیفەتێكی بەرزو پەسەندی بەندە هەڵبژاردەكانی خوایە، چونكە ژیانی دنیا لەچاو هی دوارۆژو بەهەشت، كەمو گچكەیە، بەڵام زۆر كەس ماناو وشەی ناوبراویان لە (بەكەمگرتن)ەوە گۆڕیوە بۆ (نەویستن)و بەوجۆرە وشەی زوهد بە (نەویستن)و فڕێدانو وازلێهێنانی ژیانی دنیا تەفسیركراوەو، پاشان كە بیستوویانە گوتراوە: پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلامو زاناو پێشەوایانی پێشین زاهید بوون، وا حاڵیبوون، كە هیچ جۆرە ئەمیەتو بایەخێكیان بە ژیانی دنیا نەداوە، بگرە دژایەتییشیان كردوە !!

(علي بن أبي طالب)یش (خوا لێی ڕازی بێ)، پێناسەیەكی جوانی بۆ زوهد كردوە، كە گوتوویەتی: (لَيْسَ الزُّهْدُ أن لا تَمْلِكَ شيئاً، إنَّما الزهدُ أن لا يَمْلِكَكَ شيءٌ)، واتە: زوهد ئەوە نیە، تۆ هیچت نەبێ، بەڵكو زوهد ئەوەیە، هیچ شتێك تۆی نەبێ!!

٢/ وشەی (فقر)یش یەکی دیکە لەو وشانەو ئەمیش، کە لە کوردییدا هەژاریی لە بەرانبەرە، زۆر کەس پێیان وایە، چونکە خوا جل جلالە تێکڕای بەندەکانی خۆی پێ وەسف کردوە، دیارە حاڵەتو سیفەتێکی باشەو، دەبێ ئینسان هەوڵ بدات لەخۆیدا بیهێنێتە دی!! خوای باڵادەستو دەوڵەمەند فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ١٥﴾ فاطر.

واتە: ئەی خەڵکینە ! ئێوەن، کە هەژارنو پێویستییتان بە خوا هەیەو، هەر خواش بێ نیازو شایستەی ستاییشە.

بەڵام لەڕاستییدا ئەم بۆچوونە هەڵەیە، چونکە بێگومان لەبەرامبەر خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاردا، سەرجەم دروستکراوەکان - نەك تەنیا خەڵك — ئاتاجو هەژارن، بۆ دروستبوونیان، بۆ ژیانو بەرێوەچوونیان... هتد، بەڵام هەژاریی بەندەکان، بۆ یەکدی مانای چاو لەدەستییو منەتبارییان دەگەیەنێو، ئەوەش بەهیچ جۆرێك لە بەرنامەی خوادا، نەك هەر پەسەندو چاك نیە، بگرە بە ڕەواش دانەنراوە، بگرە هەژاریی بەندەکانو نەدارییو برسیەتییو قەرزدارییی، بە نەخۆشییو دەردو مەترسیی دانراون، کە ئینسانی مسوڵمان پەنایان لێ بە خوا بگرێ، کە ئەگەر گیرۆدەیان ببێ، لەکۆڵییان بکاتەوە، ئەگەرنا لێیانی بەدوور بگرێ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە دوعایەکانیدا فەرموویەتی:

* {أللّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ ...}(١).

واتە: ئەی خوایە ! پەنات دێنمە بەرێ لە گوناهبارییو قەرزدارییی...

* {أللّهُمَّ أنْتَ الأوَّلُ فَلا قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلا شَيْءَ بَعْدَكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ نَاصِيَتُهَا بِيَدِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الإثْمِ وَالْكَسَلِ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْغِنَى وَفِتْنَةِ الْفَقْرِ...}(١).

---

(١) رَوَاهُ البُخَارِيُّ، برقم: (٢٢٦٧)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٣٥٣)، وَأَبُو دَاوُدَ، برقم: (٨٨٠)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (قَالَ شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح)، وَابْنُ خُزَيْمة برقم: (٨٥٢)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

واته: ئەی خوایە ! تۆ یەکەمینی، هیچ شتێکت نەکەوتۆتە پێش و، تۆ دوامینیو، هیچ شتێکت ناکەوێتە دوا، پەنات دێنمەبەر لە خراپەو زیانی هەر ژیانداریێك، کە پێشە سەری بەدەست تۆوەیەو، پەنات پێ دێنم لە گوناحو تەمبەڵیی و، لە ئازاری گۆڕو، لە بەڵای دەوڵەمەندییو لە بەڵای هەژاریی...

* {... وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ}(٢).

واتە: هەروەها پەنات دێنمە بەر لە برسیەتیی، چونکە خراپترین هاودەمە...

کەواتە:

لە هیچ دەقێکی قورئانو سوننەتدا مەدحی هەژارییو نەداریی نەکراوە، بەڵکو هەژارییو برسیەتییو قەرزداریی، وەك بەڵاو دوژمنێك پەنای لێ بە خوا گیراوەو، دوعای لەکۆڵکرانەوەی لێکراوە(٣)، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە دەوڵەمەندییوماڵو سامانی حەڵاڵ، بە چاکەو نیعمەتی خوا دانراوە، با بۆ وێنە سەرنجی چەند فەرموودەیەك بدەین:

یەك: {أللّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى}(٤).

واتە: ئەی خوایە! ڕێنمایی و پارێزکاریی و پاکیی و بێنیازییت لێ دەخوازم.

دوو: {الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى}(٥).

---

(١) رَوَاهُ الحَاكِمُ فِي (مستدركه)، برقم: (٢٢١١)، وَصَحَّحَهُ وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي.

(٢) رَوَاهُ أَبو دَاوُدَ، برقم: (١٥٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ، برقم: (٥٤٦٨)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٣٣٥٤)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (١٠٢٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني.

(٣) سەرجەم ئەو دەقانەی لە مەدحی هەژارییدا هاتوون، یان لاواز یان هەڵبەستراون، بڕوانە: (العواصم والقواصم في الذبِّ عن سنة أبي القاسم)، ج: (٨)، ص: (١٩٤- ١٩٩)، ابن الوزير اليماني.

(٤) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٣٩٥٠)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٧٠٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ، برقم: (٣٤٨٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٣٨٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٩٠٠).

(٥) رَوَاهُ وَالبُخَارِيُّ، برقم: (١٣٦١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠٣٣)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٣٣٦١) وغيرهم.

واتە: دەستی بەرز (دەستی بەخشین) لەدەستی نزم باشترە (کە دەستی وەرگرتنە).

سێ: {لاَ حَسَدَ إِلاَّ في اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللّهُ مَالاً، فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ في الحَقّ...}(١).

واتە: خۆزگە پێخواستن تەنیا لە دوو شتاندا ڕەوایە: پیاوێك خوا سامانی پێدابێ و سەرکەوتووشی کردبێ لە بەخشینیدا لەڕێی هەق و ڕاستەوە.

کەواتە ماڵو سامان یەکێکە لەو دوو نیعمەتو بەهرە خواییانەی کە جێی خۆیەتی خەڵکی بە چاوی بایەخ پێدانەوە بۆیان بڕوانن، بگرە پێشبڕکە (منافسه)شیان لەسەر بکەن، بەڵام پێشبڕکەی ناشەریفانە نا !!

٣/ وشەی (توكُّل)یش بەهەمان شێوە، کە لە ئەسڵدا بەمانای پشت بەخوابەستنو دڵ پێوە پەیوەستبوونیەتی، وێڕای هەوڵدان بۆ دابینکردنی هۆیەکان (الأسباب)، کەچی خەڵکێکی زۆر پێیان وایە، پشت بەخوا بەستن (توكّل)، بەدیلی هۆیەکانو هەوڵدانەو، هەر کە گلەییان لێکرا، بۆچی هۆکارەکانی ئەنجامدانی فلانە ئیشە دابین ناکەن؟ دەڵێن: ئاخر ئێمە بەتەمای خوا لێی گەڕاوینو پشتمان بەوی قایمە !

ئنجا هەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەریشدا (صلی الله علیه وسلم) ئەو جۆرە بیرکردنەوەو لێحاڵیبوونە چەوتە هەبووە، ئەوەتا عەرەبێکی خێڵەکیی کاتێك دەچێتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حوشترەکەی لە دەرەوە بەرهەڵدا دەکاتو، دەڵێ: ئایا حوشترەکەم بەرهەڵدا بکەمو پشت بە خوا ببەستم ؟ یان بیبەستمەوەو پشت بە خوا ببەستم ؟!

ئەویش پێی دەفەرموێ : {إِعْقَلْهَا وَتَوَكَّلْ}(٢)، واتە: بیبەستەوەو پشتیش بە خوا ببەستە.

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (٣٦٥١)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (١٣٤٣)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٩٣٣)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤٢٠٨)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٩٠) عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.
(٢) رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ، برقم: (٢٥١٧). وَحَسَّنَهُ الألبَانِي.

بەڵێ (بەستنەوە)و (پشت بەخوا بەستن) دژو پێچەوانەی یەکدی نین، بگرە تەواوکەری یەکدینو، بەستنەوە (کە مەبەست گرتنی هۆیەکانە) پەیوەندیی بەدەستو بەجەستەوە هەیەو، پشت بە خوا بەستن (توکّل)یش، پەیوەستە بە دڵو دەروونەوە.

خوای پەروەردگاریش کاتێك، کە لەڕووی مەدحکردنەوە باسی (ذو القرنين)ی کردوە، لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ الكهف.

واتە: ئێمە دەستەڵاتمان پێدابوو لە زەوییدا و، بۆ هەر شتێکیش هۆکاری (ئەنجامدانی)مان بۆ ڕەخساندبوو. ئنجا ئەو هۆکارەی گرتەبەر (بەرەو مەبەست).

٤/ وشەی (صَبْر)یش دیسان یەکێکە لەو وشانەی، کە لە ماناو چەمکی ئەسڵی خۆیان ترازێنراون، چونکە (صَبْر) یانی خۆڕاگریی‌و پشوو درێژیی لەسەر ئەنجامدانی کارێکی خێر، ئنجا ئەو کارە خێرە، چ جێبەجێ کردنی فەرز، یان سوننەتێك بێت، چ خۆپاراستن لە شتێکی حەرام بێت، یان ناپەسەند، چ نەشڵەژانو نەلەخشان بێت، لە ئاقار بەڵاو گرفتاریی‌و پێشهاتێکی ناخۆشدا.

کەچی زۆر کەس وا لە صەبر حاڵیبوون، کە بریتیە لە موتڵەقی خۆڕاگریی‌و نەجووڵانو خۆ نەبزاوتن، تەنانەت کەسانی وا هەن، پێیان وایە ڕاپەرین لە ئەهلی کوفرو ستەمو فەسادو، قبووڵنەکردنی خراپەو تاوانەکانیشیان، پێچەوانەی ئەو خۆڕاگریی‌و پشوو درێژییەیە، کە خوا فەرمانی پێکردوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ ﴿٢٠٠﴾﴾ آل عمران، بەڵام ڕاستییەکەی ئەو جۆرە خۆڕاگرییە، ئەوە نیە کە خوا مەدحی کردوەو فەرمانی پێکردوە، بەڵکو: ﴿... وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ ...﴿١٧٧﴾﴾ البقرة.

واتە: خۆڕاگران لە دەستکورتییو نەخۆشییو لە گەرمەی جەنگدا، بەڵێ ئەمانە شایستەی مەدحو ستایشن.

هەر بۆیەش خوای پەروەردگار لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿... أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ البقرة.

واتە: ئەوانە کەسانێکن ڕاستیان کردوەو، ئەوانەن پارێزکاران.

٥/ یەکی دیکە لەو وشانە بریتیە لە (الرِّضاء بالقَدَر)، کە مانا شەرعییەکەی ئەوەیە ئینسان هەر بەڵاو گرفتارییەکی بەسەرهات، دڵنیابێ، کە بەپێی نەخشەو بڕیارو ویستی خوای پەروەردگار بووەو، لەو ڕووەوە، کە خوا بەسەری هێناوە، نابێ گلەییو ڕەخنەی هەبێ، بەڵکو دەبێ ڕازییش بێت، بەڵام خودی بەڵاو گرفتارییەکە، دەبێ هەوڵی لابردنو نەهێشتنی بدات.

کەچی خەڵکێکی زۆر وا لەم مەسەلەیەش حاڵیی بوون، کە ئیمان بەقەدەرو ڕازیبوون پێی، پاساو (مُبَرِّر)ی هەڵخزانو نەجووڵانو هەوڵنەدان بێتو، پاساوی لانەبردنی خراپەو ستەمو بەرەنگار نەبوونەوەی بێت، بێخەبەر لەوە، کە هەر وەك چۆن بەڵاو گرفتارییەکان، بەقەدەری خوا ڕوو دەدەن، ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاربوونەوەشیانو، هەوڵدان بۆ چارەسەرو لابردنیشیان، هەر بەقەدەری خوایەو، قەدەری خوا وەك ئاسمان وایە، کە هەموو شتێك، چ خێر بێ، چ شەڕ، دەخاتە ژێر سایەی خۆیەوەو، هەرچی بکرێو نەکرێ، هەر بەپێی نەخشەو ئەندازەگیریی خوای بالادەستە.

کەواتە:

بۆچی دەبێ ئینسان بە نەخۆشیی ڕازی بێتو، هەوڵی چاکبوونەوە نەداتو، بە هەژارییو قەرزداریی ڕازی بێو، هەوڵی بێنیازیی نەداتو، بە شکستو ژێردەستەیی ڕازی بێتو، هەوڵی سەرکەوتنو سەربەرزیی نەداتو ...هتد؟!.

لەڕاستییدا شەرعییانەو ڕاستو دروست تێگەیشتن لە قەزاو قەدەر، چاکترین دینەمۆی جووڵێنەری ئینسانە بۆ ئەنجامدانی هەر کارو چالاکییەك، کە بەختەوەریی دنیاو قیامەتی تاكو کۆمەڵگای تێدا بێت.

جیاوازییەکی بنەڕەتیی پێشینی چاکمان – بەتایبەت هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و خوا لێیان ڕازی بێ - وەچەکانی دوایی ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە، کە ئەوان - خوا لێیان ڕازی بێ – بە شێوەیەکی ڕاستو دروست لە وشەو زاراوەکانی ئیسلامەتیی حاڵیی بووبوون، توانیشیان، کە بە شێوەیەکی ڕاستو دروست دینداریی بکەن، خەڵکی دیکەش، کە بەهەڵە حاڵیی بووبێ، بێگومان هەر دیواری ڕەفتارو هەڵسوکەوتێکی خواریش، لەسەر ئەو بناغەی بەهەڵە تێگەیشتنە بنیات دەنێن، هەر بۆیەش گۆڕانکاریی (تغییر) دەبێ لە گۆڕانو ڕاستبوونەوەو چاکبوونی عەقڵو دڵو دەروونەوە دەست پێ بکات: ﴿ ... إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ... ﴿١١﴾ ﴾ الرعد. واتە: خوا واقیعو حاڵو باڵی هیچ گەلێك ناگۆڕێ، هەتا ئەوان گۆڕان بەسەر خۆیاندا نەهێنن..

## تەوەری دەیەم:

## حەوت ڕەخنەو تێبینیی لەسەر ئەهلی تەصەووف:

لە باس‌و بابەتەکانی ڕابردوودا ڕوون بۆوە، کە مەسەلەی تەزکیەی نەفس، خاڵێکی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانە، مەگەر کەسێکی نەشارەزاو بێخەبەر، ئەگەرنا، هیچ کەس لەوبارەوە مشتومڕو لامو جیمیی ناکات.

بەڵام بێگومان تەزکیەی نەفس‌و تەصەووف، وەك ڕێبازەکانی‌و داموو دەزگاکانی، شتێکی دیکەیەو جیایە.

ئنجا ئێمە خوا یاربێ لە چەند بڕگەیەکی کورتدا، حەوت ڕەخنەو تێبینیی لەسەر ئەهلی تەصەووف بەگشتیی‌و، ئەهلی تەصەووفی کوردستان‌و ڕێبازەکانی بەتایبەت، دەخەینە ڕوو، بە هیوای ئەوەی، بەگشتیی بۆ مسوڵمانان، بەرچاوڕوونیی‌و بەتایبەتیش بۆ مسوڵمانانی صۆفیی‌و دەروێش‌و دێوانەو موریدو بۆ پیرو شێخەکانیشیان، بیرخستنەوەو بێدارکردنەوەو ئامۆژگاریی دڵسۆزانەو، ڕەخنەو ڕاستکردنەوەی دۆستانەو بەپەرۆشانە بێت، دیارە نە هیچ کەسیش لەوە گچکەترە، کە قسەی خێرو دڵسۆزی خۆی پێشانی براو خوشکانی مسوڵمانی بداتو، نە هیچکەسیش لەوە گەورەترە، کە ڕەخنەی لێ بگیرێ‌و ئامۆژگاریی بکرێ.

ئەمەش حەوت ڕەخنەو تێبینییەکانم بەکورتیی:

**یەك: زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی بناغەی مسوڵمانەتییە:**

خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خۆی (صلى الله عليه وسلم) فەرمووە: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ يوسف.

واتە: بڵێ: ئا ئەمەیە ڕێبازی من: لەبەر ڕۆشناییدا بانگەواز بۆلای خوا دەکەم خۆمو شوێنکەوتووانم و، پاکیی بۆ خواو، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

بەڵێ بناغەی بەندایەتیی بۆ خوا کردن ئەوەیە، کە ئینسان خوا بناسێو خۆی بناسێو، ئەرکی سەرشانی خۆیشی بەرامبەر بە خوا بزانێ، بەبێ ئەمە ناتوانێ یەك هەنگاوی دروست بنێو، هەرچی لەسەر بناغەی نەزانیی (جهل)یش بنیاتی بنێ، هەر لەسەری قەرزدار دەبێتەوە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ... ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: بەدوای شتێك مەکەوە، کە نایزانیو نایناسی...

مادام وابێ:

ئەوە کە زۆربەی شوێنکەوتووانی ڕێبازەکانی تەصەووف، بە شێخەکانیشیانەوە، لەجیاتی ئەوەی ئەهلی عیلم بن، ئەهلی جەهلن، زۆر جێی داخو خەفەتە، چونکە خوا بە جەهل نا پەرستریو، دیواری دینداریی و پارێزکارییش، لەسەر بناغەی نەزانیی بنیات نانرێ.

بەڕاستیی نازانم بۆچی وەزع وای لێهاتوە ! ئایا ئەگەر صۆفیی و دەروێشەکانیش نەزانن، نەدەبوو شێخەکان بزانن، کە یەکەمین هەنگاوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە پەروەردەکردنی هاوەڵانیدا، بریتی بووە لە قوڕئان فێرکردنیانو شارەزا کردنیان ؟!

ئایا نازانن، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ}[١].

واتە: هەرکەسێك خوا بیەوێ خێری بهێنێتە ڕێ، لە ئاییندا شارەزای دەکات؟!!

**دوو: دینداریی و پارێزکاریی، شتی زاتیین و بەمیرات ناگیرێن:**

یەکی دیکە لە هەڵەو کەمو کوڕییەکانی شوێنکەوتووانی ڕێبازەکانی تەصەووف، ئەوەیە، کە لە زۆربەی جێیان دابو دەستوورێکی هەڵەو ناشەرعییان داهێناوە، لە بواری دیارییکردنی پیرو شێخو ئوستادیاندا، ئەویش ئەوەیە، کە یەکسەر پاش مردنی شێخو پیرەکە، یان کوڕی گەورەی، یان یەکێك لە کوڕەکانی لە شوێنی بابی دادەنێن، بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکەن، کە ئایا ئەو کوڕە شێخە، هەلومەرجو شێخایەتیی‌و ئیرشادو ئوستادێتیی، تێدا ساز بووە، یان نا؟!

دیارە ئەوەش ڕەفتارێکی هەڵەیەو، کاریگەریی زۆر سەلبییشی هەبووەو هەیە لەسەر بەدناوکردنی ڕێبازەکانی تەصەووفو، خەڵك لێ دڕدۆنگ بوونیان، چونکە ئەگەر شێخی پێشوو بەهۆی دینداریی‌و پارێزکاریی خۆیەوەو بە کردەوە، بۆتە مامۆستاو چاوساغ، ئەوە بێگومان کوڕەکەی لەگەڵ میرات لێ گرتنیدا، ئەو سیفەتە زاتییانەشی لێ بەمیرات نەگرتوونو، مەگەر ئەویش خۆی لەخۆیدا پەیدایان بکات، ئەگەرنا بەناوی بێ نێوەڕۆك، هیچ بەهیچ ناکات[٢]!!

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (١٦٩٢٤)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٧١)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٤٣٦)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٨٩) عَنْ مُعَاوِيَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

(٢) بێگومان سەرجەم ئەو شێخە ڕەسەنانەی، کە پابەندبوون بە شەرعەوە، دژی ئەو جۆرە دابو نەریتە هەڵەو پووچە بوونو، لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون، کە پلەو پایەی شێخایەتیی‌و ئیرشاد حاڵەتێکە، دەبێ ئینسان بە هەوڵو کۆششی خۆی بیگاتێو، کەلوپەلو پارەو سامان نیە بەمیرات بگیرێ، بۆ وێنە: جەنابی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ علاء الدين بیارەیی خوا لێیان خۆش بێ، کە لە ساڵی (١٩٩٦ز)دا لە شاری ئەستەمبوڵی تورکیا کۆچی دوایی کرد، لە چەند قسەیەکیدا کە (عبدالله مصطفى صالح) ناسراو بە

پێشینانیش گوتوویانە: ئەگەر خۆت کۆسەی ڕیشی بابت بەتۆچی! هەروەها گوتوویانە: هیچ کەس بەمەلەی بابی ناپەڕێتەوە.

**سێ: ئینسانی نەشارەزاو نازانیار بەدین، دروست نیە ببێتە پێشەواو چاوساغ:**

دەردێکی دیکەی زۆر بێڕەزا، کە ڕێبازەکانی تەصەووف لەمێژە بەتایبەت لە کوردستاندا پێیەوە گیرۆدە بوون، ئەوەیە کە - وەك لە بڕگەی دووەمیشدا ئاماژەم پێکرد – کەسانێك، کە لە قورئانو سوننەتو زانیارییە شەرعییەکاندا زۆر نەزانو کۆڵەوارن، دەیانکەنە شێخو ئوستادو چاوساغی خۆیان، کە بە حیساب فێری دینداریيو پارێزکارییان بکەنو تەزکیەیان بکەن!!

بەڵام شتێکی ڕوونو بەڵگەنەویستە، کە کەسێك شارەزای ڕێیەك نەبێ، ناتوانێ تێیدا ببێتە دەلیلو ڕێنیشاندەر، چونکە وەك گوتراوە: (فاقد الشيء لا يُعطيهِ)

---

(فەنایی) لە پێشەکی دیوانەکەی شێخداو لەسەر وەصیەتی خۆی نووسیەتی، گوتوویەتی:{... من هەرچی لە سەروەتو ماڵی دنیا خەرجو سەرفی بکەم بە خەیاڵما نایەتو، خەفەت بە سامانی دونیاییەوە ناخۆم، ئەوەی کە زۆر جێگای خەمو ئەسەفی منە، ئەوەیە کە لە ئەولادی ئەو بنەماڵەی ئێمەدا، کەسێکی وایان تێدا نیە خەریکی سەیرو سلووك بێو، بتوانێ بۆ پاشەڕۆژ نەهێڵێ خێرو ئیحسانی بوزورگانی ئەم خانەدانە ببڕێتەوە، بەڕاستیی ئەوە زۆر جێگای ئەسەفە، کە هیچ کام لە ئەندامانی ئەم خانەدانە، لەسەر ڕێبازی باوكو باپیرانی خۆیان نارۆن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبیستین چەند کەسێك لەم بنامالەیە ئیستیفادەیان لە دڵ پاکیی مریدو مەنسووبی ئەم خانەدانە کردوە، بەبێ ئەوەی تەنانەت واجباتی دینیش بەتەواویی بەجێبهێنن، یان بەچاکیی ئاگایان لە ئەحکامی زاهیری شەرع بێت، بە هەموو جۆرێك خەریکی عەوام فریبییو بەتەمای تەکیەو خانەقان، بەڵام بێخەبەرن لەوەی هەر کەسێ لە هەر ڕێگایەکەوە بێو بە هەر ناوێکەوە بێ، هەرچی لە خەڵکی وەربگرێ، بێگومان لێی حەرامە، مادام شەرتو مەرجەکانی ئیرشادی تێدا نەهاتبێتە جێ، کە ئەوانە بەچاکیی ئەزانن، نەك هەر هیچ پلەو پایەیەکیان لە تەریقەت نەبڕیوە، بەڵکو هەر بۆنی تەریقەتیشیان نەکردوە، جا من لەوە ئەترسم خەڵکی دڵپاكو سادە، هەر تەنیا لەبەرئەوەی، کە ئەمانە لە ئەفرادی بنەماڵەی ئێمەن، دەوریان بدەنو بەناوی شێخاتییەوە خزمەتیان بکەن، کە بۆ هەردوو لایان زیانی هەیەو حەرامە...}، بڕوانە: (دیوانی حەزرەتی شێخ محمد عوثمان سراج الدین نەقشبەندیی)، ل: (٨، ٩)، بەرگی: (٢)، چاپی ئەستەمبوڵ ساڵی (١٩٩٥) زایینی.

کەسێك شتێك شك نەبات پێی نابەخشرێ، ئێستاش باگوێ لە یەکێك لە پێشەوایانی عیرفانو تەصەووف بگرین، داخۆ لەوبارەوە چی دەڵێ: (إبن البَنا السّرقُسْطي) لە شیعرە ناودارەکانی خۆیدا کە لەبارەی (تصوف)ەوە گوتوونی، بەناوی (المباحث الأصلية) و (ابن عجيبة) لە کتێبی (الفتوحات الإلهية)دا شەرحی کردوون، دەربارەی شێخی تەریقەتو مەرجەکانی گوتوویەتی[١]:

واِنما القوم مُسافرون — لحضرةِ الحق و ظاعِنون
فافتقروا فيه الى دَليلِ — ذي بَصَرٍ بالسَّير والمقيل
قد سلك الطريق ثم عاد — لِيخبِرَ القومَ بما استفاد

واتە:

١- بێگومان ئەو کۆمەڵە ڕێبوارن بەرەو لای خواو، دەیانەوێ لە هەواری ناسینیو بەندایەتیی بۆکردنیدا، بارگەو بنە بخەن.

٢- بۆیە پێویستییان بە ڕێرووننیکارێك هەیە، کە شارەزاو بەرچاوڕوون بێت، چۆن چۆنی بڕۆنو ڕێ بکەنو، لەکوێ بخەنو ئیسراحەت بکەن؟

٣- کەسێك بێت ڕێگایەکی بڕیبێو گەڕابێتەوەش، تاوەکو هەواڵ بەو خەڵکە بدات بەوەی، لەو سەفەرەیدا دەستی کەوتوەو لێی سوودمەند بووە.

لە شوێنێکی دیکەی شیعرەکانیدا، باسی مەرجەکانی شێخی طەریقەتو ئەو زانیارییانەی، پێویستە بیانزانێو تێیاندا کارامە بێ، دەکاتو، دەڵێ[٢]:

عارٌ لِمَنْ لَمْ يرض العلوما — ويعلم الموجود والمعدوما
ولم يكن في بدْءِهِ فقيهاً — وسائر الأحكام ما يدريها
والحّد والأصول واللّسانا — والذكرَ والحَديثَ و البرهانا

(١) بڕوانە: پەڕاوێزی (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)، ص: (١٤٢).
(٢) بڕوانە: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم) پەڕاوێزەکەی، ص: (٤٤٦).

ولم يكـن أحكـم علم الحـــال ولادرى مقاصــدَ الرِّجـــــالِ
ولـم يُنـزِّه صــفة الـمعبـــود ولادرى مراتـبَ الوجــــود
والنفـس والعقــل والـروحـــا ويدْري مِنْه صدرَه الـمشروحـــا
وعلـم سر النّسخِ والـمنْسوخِ أن يتعـاطــى رُتْبــةَ الشــيــوخِ

واتــە:

١/ شــوورەییــیە بــۆ کەسـێك، کـە لـە زانیارییــەکـــاندا کـــارامە نــەبێ و، دەربــارەی بەدیهێنــەر، کە بوونی پێویســـتەو دروســتکراوەکان، کــە لــە ئەســڵدا نــەبوو بــوون، زانیــاریی نەبێ.

٢/ هــەروەها لــە ســــەرەتایەوە شــەرعـــزان نــەبووبێ‌و، لــە یاســاکانی دیکــەی ئیســلامەتییشــدا شــارەزا نەبــێ.

٣/ هەروەهـــا شــارەزایی زانیــاریی (منطـق)[1] و (أصـول الفقـه)و زمــانی عــەڕەبیی‌و تەفســیری قورئان‌و ســوننەت‌و زانیــاریی عەقیــدە (علم الكـلام) نەبــێ.

٤/ دیســان ئەگەر بێــت‌و تەواو شــارەزای چۆنیەتی تەزکیــەبوونی نەفس نەبــێ، نەزانــێ مەبەســتەکانی پیــاوانی تەصــەووف چــی‌و چــین؟

٥/ هێنــدەش لە عەقیــدەدا ســەرڕاســـت نــەبێ، کــە صــیفەتەکانی خــوای پەرســتــراو بەپــاك بگــرێ لەوێچــواندن و، شارەزای پلەکانی بوون (وجـود) نەبــێ.

٦/ دیسان کەســێك نەزانێ نەفــس‌و عەقــڵ‌و ڕووح چین‌و چۆنن و، نــەزانێ گوشـــادبوونی ســینەی چــۆن چۆنیــیە !.

(١) لە ڕاســتییدا (منطـق) نە زانیارییەکی ئیسلامییەو، نە پەیوەندییشــی بــە تەزکیــەوە هەیــە، بــەڵکو لــە ئەسڵدا زانیارییەکی یۆنانییەو، هەر کەسێکیش عەقڵی ســاغی خــۆی بــاش بــەکاربهێنێ، پــەکی لەســەر مەنتیق نەکەوتوەو ناشڵێم: خراپ و بێ سوودە.

٧/ هەروەهــا لەبــارەی نهــێنیی (ناسخ)و (مَنْسـوخ)ەوە زانیــاریی نــەبێ، بابــایەکی وا نــابێ‌و نەنگ‌و شــوورەیــیە، کە بە ناهــەق پلـــەو پایــەی ئیــرشـــادو شــێخـــایەتیی وەربگـــرێ.

**چـوار: دروسـت نیە تەکیـەو خانەقایەکـان بکرێنـە بەدیلی مزگـەوت:**

هەڵەیەکی دیکەی شوێنـــکەوتووانی ڕێبازەکــانی تەصــەووف ئەوەیــە، کــە تەکیــەو خانەقایەکانیان، کە لە ئەصڵدا بۆ تێدا پــەروەردەکردنی موریــدان‌و دەرس‌و دەورو زیکــرو فیکرو حەوانەوەو خەوتن‌و ئیســڕاحەت تێداکردنیان بنیــاتــنراون، کردوویــانن، بە بەدیلــی مزگــەوت‌و مــاڵــی خــوا !!

ئنجا بێگومان ئەو ڕەفتارە شتێکی هــەڵەو پووچەو، شەرعــییــبوونی دروســتـــکرانی ئەو تەکیــەو خــانەقــایانە دەخاتە ژێرپرســیارەوە.

بەڵــێ لەڕاستییدا تەکیەو خانەقایەکان، هەر هێندە شەرعیەتییبوونیان دەپــارێزن، کــە وەك حوجرەی فەقێــیان‌و قوتابخانەو پەیمانگەو زانکۆی قوتــابیــیان، تەماشا بکرێن، واتــە: وەك چۆن حوجــرەو قوتــابخانەو پەیمانگــەو زانکــۆ، بەدیلی مزگەوت نــین‌و، شــوێنی دەرس خوێنـــدن‌و زانســـــت فێربـــوونن، دەبـــێ خــانەقـــاو تەکــیەکـــانیش، شـــوێنی تێـــدا تەزکیــەبوون‌و پەروەردە وەرگرتن بن.

بەڵێ، تاقە شوێنێك، کە بتوانێ تێکڕای مســوڵمانان پێکــەوە کۆبکاتــەوەو، جێگـــای وردو درشــت‌و سەرجەم چین‌و توێژەکــانیان بکاتەوەو، هەمووشیان بەهی خۆیــانی بــزانن‌و، هــیچ کەســی مســـــوڵمان، هەســتیـــاریی (حسَّاسیة)ی پێــی نەبــێ، مـــاڵی خـــوای پەروەردگــارە.

دیارە خــانەقــاو تەکیەکــانیش، کە دەبێ مەڵبەندی تەزکیــەو پــەروەردە بــن، دەبـــێ ئەهــلــی طەریقەت وریا بن، نەبنە تەنبەڵــخانە، یان خەڵــکی ســیخوڕو خــراپ تێیـــان بخــزێ، یــان...یــان...هتــد.

**پێنج: حەیفە ئەهلی دڵ، ببنە ژێردەست و وابەستەو دابەستەی ئەهلی گڵ:**

ئەهلی تەصەووف خۆیان بە (ئەهلی دڵ) ناودەبەن، جا بەڕاستی شتێکی زۆر ناقۆڵاو بێجێیە، کە ئەهلی تەصەووف ئاگایانە، یان بێ ئاگایانە، خەڵکی فێڵبازو ئەهلی دنیا بەهرەی خراپ لێوەرگرتوو (إسْتِغلال)یان بکەن‌و بیانکەنە ژێردەستی خۆیان‌و، بەهۆی چاو تێبڕینیان لەدنیاو تەماعی دەستی ئەو فێڵبازو دنیاپەرستانە، سیفەتی وابەستەیی‌و دابەستەییان لێ ببێتە مۆرو بە نێوچاوانیانەوە بنرێ.

پێویستە سەرجەم ئەهلی تەصەووف، ئەم شیعرەی، کە یەکێک[1] لە خاوەن دڵانی بێدارو هۆشیار، گوتوویەتی: لەبەر چاویان بێت‌و لە گوێیاندا بزرینگێتەوە:

فَلَيْتَكَ تَحْلو والحياة مَريرةٌ وَلَيْتَكَ تَرْضى والأنامُ غِضابُ
ولَيْتَ الذي بيني وبَيْنَكَ عامرٌ وبيني وبَيْنَ العالمين خَرابُ
إذا صَحّ مِنْكَ الوُدُّ فالكُلّ هَيِّنُ وكل ما فوق التُرابِ تُرابُ

واتە:

١/ خۆزگە (ئەی خوایە!) تۆم لە دڵ دا شیرین دەبوو، سەرجەم ژیان‌و گوزەرانم با تاڵ بێت و، بریا تۆم لێ ڕازییای، ئنجا با تێکڕای خەڵکی قەڵس بن.

٢/ خۆزگەش نێوانم لەگەڵ تۆدا خۆشبووایە، ئنجا با نێوانم لەگەڵ هەموو خەڵکی دنیادا تێکبچێ.

٣/ ئەگەر خۆشەویستیی تۆم بۆ ساغ ببێتەوە، هەموو شتێکی دیکەم پێ ئاساییە، بێگومان هەرچی لەسەر گڵیشە هەر گڵە.

(١) (سيد قطب) خوا لێی خۆشبێ گوتوویەتی: ئەم شیعرە هی (رابعة العدوية)یە، بڕوانە: (في ظلال القرآن)، ج: (٢)، ص: (٩١٨).

**شەش: بەرگریی لێکردن و تەئویل و پینەکردنی قسەی هەللەق و مەللەق (شطحات)و ناشەرعییانەی هەندێك لە ناودارانی تەصەووف، سەرجەم تەصەووف تۆمەتبار دەکات:**

بەڵێ بەڕاستیی ئەم مەسەلەیەش دەورێکی زۆری بینیوەو دەبینێ، لە بەدناوکردنو تۆمەتبارکردنی تەصەووفدا.

بۆ وێنە: ئەو قسانەی، کە لە (أبو يزيد البَسْطامي)و (حلاّج)ەوە گێڕراونەوە، وەك: (سُبْحاني ما أعظم شأني) یان (ما في الجبَّةِ إلاّ الله)، یان (أنا مَنْ أهوى ومَن أهوى أنا، نحن رُوحانِ حَلَلْنا بَدَنا)، هەروەها سەرجەم ئەو قسانەی، کە (ابن عربي) لە کتێبی (فصوص الحِكَم)داو زۆر قسەی بێسەرو پێو، پڕ لە کوفرو شیركو زەندەقە، کە لە کتێبی: (الفتوحات المكية)دا کردوونی، هەروەها هەندێك لە شیعرەکانی (ابن الفارض)و گەلێك قسەی (ابن سبعين)و غەیری ئەمانیش، کە هیچ کەس، کە بە ئەلیفو بێی ئیسلام شارەزا بێ، گومانو دوو دڵیی نیە، لەوەدا، کە کوفرو شیركو زەندەقەیان لێ دەچۆڕێ، هیچ پێویست ناکات ئەهلی تەصەووف بە پینەو پەڕۆو تەئویلی ساردو سڕ، هەوڵ بدەن، پەردەی شەرعییبوونیان بەسەردا بدەن ! هەرچەندە من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم، کە بێ سێو دوو ئەو جۆرە کەسانەی کە ئەو قسانەیان پاڵ دەدرێنەلا، بە کافر دابنێین، چونکە شتێکی ڕوونە، کە بۆ بە کافردانان (تكفير)، هاتنە دی مەرجەکانو لاچوونی پەرچەکان (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) پێویستە، ڕێشی تێدەچێ، کە ئەو جۆرە قسانە بۆ ئەو جۆرە کەسانە، یان بەلای کەمەوە بۆ هەندێکیان، هەڵبەسترابن.

بەڵام دیسان ڕەواش نیە لە حوکمی شەرعیی قسەکان بێ دەنگ بین، بۆیە پێم وایە هەڵوێستی ڕاستو دادگەرانە ئەوەیە، کە بڵێین: فلانە قسەیە کوفرە، یان شیرکە، بەڵام ئایا خاوەنەکەیشی کافرو (مُشْرِك)ە، یان نا ! ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیەو، پێویستیی بە لێکۆڵینەوەو هەڵوێستەکردنو دڵنیا بوونو بەرچاوڕوونیی دەکات.

**حەوت: ئیمان و عەقیدە بۆ دینداریی و مسوڵمانەتیی، وەك بژێوو ئاوو هەوا وان بۆ جەستە، بەڵام تەزكیە و تەصەووف، وەك میوەو شیرینی وان:**

ئەمەش یەكی دیكەیە لە ڕەخنەو تێبینییەكانم لەسەر زۆربەی ئەهلی تەصەووف، كە بەداخەوە ئەو گرنگیی و بایەخەی بەلایەنی تەزكیەی نەفس و مەسەلەو بابەتەكانی دەدەن، نیوەی ئەوەش گرنگیی و ئەمیەت بە ئیمان و عەقیدەو مەسەلەكانی نادەن، بەڵام بێگومان بەهەڵەداچوون، چونكە:

ئینسان بەبێ ئیمان ڕێی چوونە بەهەشتی نیە، بەڵام بۆچوونە بەهەشت لەسەر تەزكیەو تەصەووف پەك ناخرێ، كەواتە: ئیمان بەدیلی تەزكیەیە، بەڵام تەزكیە بەدیلی ئیمان نیە، بەڕاستی وەك مامۆستا مەلا سەعیدی كوردیی ناسراو بە (بديع الزمان)و بە (نۆرسیی) خوا لێی خۆشبێ گوتوویەتی: ئەم ڕۆژگارە ڕۆژگاری بەرگریی لێكردن و ڕزگاركردنی ئیمان و عەقیدەیە، بەر لە هەر لایەنێكی دیكەی ئیسلام[1].

هەرچەندە من پێموایە دەبووایە مامۆستا مەلا سەعید، بەند (قەید)ێكی خستبایە سەر قسەكەی و گوتبای: (بۆ خەڵكی بەگشتیی)، چونكە بەڕاستیی مەسەلەی تەزكیەی نەفس بۆ خەڵكی تایبەتی، وەك: بانگەوازكەران و بەرپرسان، حوكمێكی دیكەی جیای هەیە، لە هی خەڵكی گشتیی و عەوام، چونكە خەڵكە تایبەتییەكە، ئەركیان قورسەو بەبێ ساغ و چاك و پاكبوونەوەیەكی باش، بۆیان جێبەجێ ناكرێ، ئەگەر دەستیشی بدەنێ، پێموایە زۆرجاران لەجیاتی بەرهەم و پاداشت، لەدنیاو قیامەتیشدا، لەسەری قەرزدار دەبنەوە.

لێرەشدا كۆتایی بە حەوت ڕەخنەو تێبینیی و پێشنیارەكانی خۆم لەبارەی ئەهلی تەصەووفەوە دێنم، هیوام وایە لانیكەم بەگومانی چاكەوە لێم وەربگرن، بەبێ غەرەز تێیان بفكرن، هەرچی قەناعەتیان پێی هات وەریبگرن.

---

(١) بڕوانە: كليات رسائل النور، (المكتوبات)، ص: (٧٩).

خوێنــەرە بەڕێــزو خۆشــەویســتەکــانم !

خوا پشــتیوان بێ هەوڵ دەدەم لەم بەشی شەشەمەدا بە کــورتیی‌و پــوختیی، دواییــن سەرنج‌و بۆچوونەکــانی خۆم لەبــارەی تەزکیەی نەفســەوە، لە حەوت تەوەردا بخەمــە ڕوو، هیـــوادارم ببنـــە مایـــەی چـاکـتـــرو زیـــاتر بەرچاوڕوونـــکردنەوەتان‌و، پاشـــان تەزکیــەبوونتان‌و بەرەو خــواچوونتــان، ئەوەندەش بــزانن، کــە زانیــاریی‌و زانســـت بــەبێ جووڵان‌و کارکردن، هیچی لــێ هەڵــناوەرێ‌و، پێشــینان گوتەنی: (بە حەڵــوا حــەڵـــوا دەم شــیــرین نابێ)، بۆیە داوای برایانەو دڵســۆزانەم ئەوەیە، کە هەمیشــە لــە هــەوڵی ئــەوە دابــن، زانینتان بۆ توانین‌و، حاڵیبوونتــان بۆ لەخــۆدا کردنە حاڵ بێ، ئەمان سەد ئــەمان وریا بن! خۆتــان نەکەنــە (هەمبــــانەی مەعلـــوومات)[1]، چــونکە گرنگیــی‌و بایــەخیی زانیاریی‌و شارەزایی لە کــارپێــکــردن‌و لــێ بەهرەمەندبوونی دایەو، زانیاریی بێ کــردارو ڕەفــتار، وەك درەختی زڕو بێ بەر وایە، ئەمیش مەگــەر بــۆ جوانیـــی، یــان بــۆ ســێبەر بهــێــڵــدرێتــەوە، ئەگــەرنــا دەکرێتــە ســووتەمەنیی!!

ئەوەش بزانن، کە زاناو پێشــەوایانی پێشــین، کە کەمتــر وابووە باس‌و مەســەلەکــانی ئیمــان‌و تەقــواو تەزکــیەی نەفــس بنووســـن، لەبـــەرئەوە بـــووە، کــە گوتوویـــانە: ئــەو مەســەلانە، خەڵــکی بەقســەو نووسین فێریان نابــن، چونکە لــە زاتــی خۆیــانــدا، شــتی کردەوەیی‌و ڕەفتاریی (سلــوکي)ین‌و، بە کــردەوەو ڕەفتــاریـــش نەبـــێ، ئینســـان چـــاك لــێیــان حــاڵــیی نابێ و فــێــریــان نــابــێ.

ئیدی خــوا بە کـــەرەمی خــۆی ڕەفتـــارو کـــردەوەی شەرعییانەمـــان بــەو زانســـتە بەکەڵــکــەی، کە وەریــدەگـــرین، تێـــدا بێنێتــە دی‌و، بــەر لــە خەڵــکـــی خۆمـــان لــە زانیــاریی‌و شــارەزاییەکــەمان بەهــرەمەند بیــن.

---

(١) یەکێك لە قســە بەنرخەکانی زانــای پایە بەرز (کاك ئەحمەدی موفتی زادە)یە، کە خەڵــکی کوردســتانی ئێــران بوو، خــوا لــێــی خــۆش بێت.

## تەوەری یەکەم:

### تەزکیەی نەفس بۆ بانگەواز کەران و مشوورخۆران و بەرپرسانی نێو جموجۆڵ و کارو چالاکی ئیسلامیی، پێویستییەکی حەتمییە:

بەڵێ خوێنەرە سەنگینو شیرینەکانم !

بەڕاستیی ڕۆژ بۆ ڕۆژێ، هەتا زیاتر بە ئەزموونگەل (تجارب)ی کارو چالاکیی ئیسلامییدا ڕەت دەبمو، لەو مەیدانە موبارەكو پڕ ئێشو ژانو کەندو لەندو بەمەترسییەدا، ئەسپ تاو دەدەم، زیاترو چاکتر لەو قەناعەتەمدا دڵنیا دەبم، کە ئەو لایەنە گرنگە مەعنەوییەی لە قورئانیدا تەزکیەو، لە سوننەتدا ئیحسانو، لە کەلەپووری ئیسلامیماندا، تەصەووفی پێ دەگوترێ، مەرجێکی بنەڕەتییو بنەمایەکی حەتمییو ژیانیی(حیاتي) دینداریيو موسوڵمانەتییە، بۆ تێکڕای موسوڵمانان، ئەگەر بیانەوێ خواپەرستییو ئیسلامەتییەکەیان، ڕەسەنو قووڵو دامەزراوو نەلەخشاو بێت، بەتایبەت بۆ ئەوانەی دەوری مشوورخۆرو چاوساغو بەرپرس دەبینن.

دیارە هەر بۆیەشە، کە خوای کاربەجێو زانا لە پەروەردەکردنو پێگەیاندنی کۆمەڵی ئیسلامیی یەکەمدا، لەسەر دەستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هێندە جەختو داکۆکیی لەسەر بەهێزو پتەوکردنی ئەو لایەنە مەعنەوییە کردوەو، بەشی زۆری ڕووبەری سوورەتە مەککەییەکانی بەشێوەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، بۆ تەرخان کردوە، هەڵبەتە ئەوەش جێی خۆی بووە، چونکە ئەو وەچە (جیل)یەی، کە بۆ وەچەو پشتەکانی دیکە دەبنە بەردی بناغەو پێشەنگی کاروانو مامۆستاو چاوساغ، ئەگەر زۆر پتەوو ساغو قاڵبووەوەو لە كڵ دەرهاتوو نەبن، ئەستەمە بتوانن

تەحەممولـی ئەو هەموو فشـارو قورسایـیـە بکەن، کە دوایی دەکەوێتە سەر شـانیان، بـا سـەرنجی ئەم ئایـەتـانە بدەیـن، تاکو لەوبارەوە بەرچاومـان ڕۆشنتـر بێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ
ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ
لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا
هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ ﴾ المزمل.

واتـە: ئـەی خـۆ لـە نوێنـەوە پێچـەر! کـەمێك لـە شـەوێ نـەبێ هەڵسـەوە (بـۆ خواپەرستیی)، نیوەی (هەڵـمەستەوە)، یان هەندێکیشـی لـێ کەمبکەوە، یـان لـێشـی (واتە لـەو نیوەیـەی کـە تێیـدا هـەڵـنـاسـتیەوەو ئیسـڕاحەت دەکـەی) زیـاد بکـەو، بەکـاوەخـۆو هێـدیی هێـدیی قورئان بخوێنـە. چونکە ئێمە لەمەودوا فەرمانێکی قورست بەسەردا دەدەین. ئنجا خـواپەرسـتییەك، کە بە شەوێ ئەنجام دەدرێ، کاریگەریی لەسەر دڵو دەروون زیاترەو، زمانیش باشتـری بۆ دەگـوترێ. بێگـومان تـۆ بـە ڕۆژێ دەرفـەتی هاتنو چوونێکی زۆرت هەیـەو، نـاوی پەروەردگـارت بهـێنـەو، بەتـەواویی خـۆت بـۆ پەرسـتنی تەرخـان بکـە. پەروەردگـاری ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوایـەو، جگـە لـەوی، چ پەرستـراوی (بە هەق) نین، دەجا کاری خۆت هەر بەو بسـپێرەو، لـە ئاقـار ئـەوەدا، کـە (هـاوبەشـدانەرەکانو ناحەزەکـانت) دەیڵێن، خـۆڕاگـربەو، بە شێوەیەکی جوان خۆتیـان لـێ دوور بگـرە.

ئنجـا بێگومان هەرچەندە دوێنراو (مُخاطَب)ی یەکەمی ئەم ئایەتە بەهێزو پێزو بەرزو پیـرۆزانە، پێغەمبـەری کۆتـایی (صلى الله عليه وسلم) بـووە، بـەڵام ئـەو یـارو هاوەڵـە بەڕێزانەشی گرتوونەوە، کە لە دەوری بوون، چونکە ئایەتەکـان بۆیە نێرراونە خـوار، کـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) پاش خۆی بۆ خەڵـكو دەوروپشـتی بیـانـخوێنێـتەوەو پێشـیانیان پـەروەردەیان بکـات: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ ... ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة، هـەر بۆیـەش لـە ئایـەتی کۆتـایی سـوورەتی

(الـمزَّمِّل)دا کە باسی چۆنیەتی شەو هەڵسانەوەو شەونوێژی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەکات، کە بە صیغەی کۆ (صیغة الجمع) دەدوێ‌و، بە ڕاشکاوییش وێڕای پێغەمبەری خوا هاوەڵە بەڕێزەکانیشی دەدوێنێ:

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ ۙ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾ ﴾ الـمزمل.

واتە: بێگومان پەروەردگارت دەزانێ، کە تۆو کۆمەڵێك لەوانەی، کە لەگەڵتن کەمتر لە دوو سێیەکی شەو نیوەی‌و سێیەکی هەڵدەستنەوە (بۆ خواپەرستیی‌و شەو بێداریی). ئنجا خوا ئەندازەگیریی شەوو ڕۆژان دەکات، زانی کە کاتی هەڵسانەوەکەتان بۆ کۆنترۆڵ (ضَبْط) ناکرێ، بۆیە لێتان خۆش بوو (لەوەی کە پێشتر لەسەری پێویست کردبوون)، لەمەودواش ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لە قورئانێ (لە شەونوێژیدا) بیخوێنن، (خوا) زانی، کە لەمەودوا نە خۆشتان دەبن و، کەسانێکی دیکە بەزەویدا دەگەڕێن (بۆ بازرگانیی)و بەخششی خوا (کە ماڵ‌و سامانی حەڵاڵە) پەیدا دەکەن و، کەسانێکی دیکەش لەپێناوی خوادا دەجەنگن، (بۆیە فەرزی شەونوێژی لەسەر لابردن).[1] ئنجا مادام وایە ئەوەندەی بۆتان هەڵدەسوورێ (شەونوێژ بکەن)[2] قورئانێ بخوێنن و، نوێژێ بەرپا بکەن‌و، زەکاتێ بدەن‌و، قەرزی

(١) ئەمە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە، نزیك بەیەکدەنگیی، بڕوانە: (مختصر تفسیر ابن كثير)، ج: (٣)، ص: (٥٩٣).

(٢) واتە: شەونوێژی سوننەت.

باش لەگەڵ خوادا بکەن[١]، هەر شتێکیش لە خێرو چاکە بۆ خۆتانی پێش بخەن، ئەوە بێگومان لەلای خوا بەچاکتر لە خۆی‌و، پاداشتی گەورەتر دەیبیننەوە، داوای لێبوردن لە خوا بکەن، بەتەئکید خوا لێبوردەو بەخشندەیە.

بەڵێ مسوڵمانە بەڕێزو خۆشەویستەکان !

هیچ کارێکی گەورەو گرنگ بەبێ خۆ ئامادەکردن‌و زەمینەسازیی بۆکردن ئەنجام نادرێ‌و، ئەگەر گریمان بەرواڵەتیش بکرێ، ئەوە حەتمەن سەرو بەر ناگرێ‌و، نارێك‌و نیوەچڵ دەردەچێ.

دیارە گرنگترین لایەنی ئامادەکاریی‌و، زەمینەسازییش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، لایەنی مەعنەوییە، چونکە بێگومان ڕووح ئەسڵی ئینسانەو، جەستە زیاتر دەوری توێکڵ‌و دیکۆرو سێبەر دەبینێ.

دووبارەی دەکەمەوە، کە تەزکیەی نەفس‌و بەهێزو پێزبوونی لایەنی مەعنەویی بۆ سەرجەم مسوڵمانان، شتێکی گرنگ‌و پێویستەو، خاڵێکی هاوبەشیانەو بە مانای فراوانی - کە لە چەمك‌و واتا عورفی‌و زاراوەییەکەی زۆر فراوانترە — تاقە هۆی ڕزگاریی‌و بەختەوەریی‌و سەرفرازییانە: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ الشمس.

واتە: سوێند بەنەفس‌و بەو کەسەی، کە ڕێکیخستوەو، گوناحکردن‌و پارێزکردنی فێرکردوە. بێگومان کەسێك پاك‌و چاکی کردوە، سەرفرازەو، کەسێك کە (لەژێر چڵکی گوناح‌و تاواندا) پەنهانی کردوە، پەشێمان‌و ماڵ وێرانە.

بەڵام بەتەئکید تەزکیەی نەفس‌و هێزی لایەنی مەعنەویی بۆ کەسانێك، کە ئەرکیان قورسترەو، سەرگەرمی مشوورخواردن‌و کاروبار هەڵسووڕاندنن، پێویستترو چارەنووسسازترە، چونکە کەسانی وا، هەمیشەو دایم دەکەونە ژێر

---

(١) مەبەست خێرو چاکەو ماڵ بەخشینە بە خەڵك، بەڵام چونکە لەبەر خوایە، وەك بە خوا سبحانە وتعالی بەخشرابێ وایە !!.

فشارو تەئسیری جۆراوجۆری کۆمەڵگاو دەوروبەرو، ئەگەر لە زاتو دەروونی خۆیانداو، لە پەیوەندییان لەگەڵ خوادا، زۆر قایمو توندو پتەوو دامەزراو نەبن، لەخشتە دەچنو دەخلیسکێن، ئنجا بۆیە کەسانی وا هەم بۆ:

أ/ پارێزران لە هەڵەو لادانو خلیسکان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ...وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ ﴾ آل عمران.

ب/ هەم بۆ کار بۆ ئاسان بوون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ...وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق.

ج/ بەرچاوڕوونیی زیاتر، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال.

زیاتر ئاتاجی ئەوەن، کە نەفسو دەروونیان پاكو چاکتر بێتو، پەیوەندییان لەگەڵ خوای بەخشندەو بە بەزەییدا بەهێزترو پتەوتر بێت، سەرنج بدە! خوای کاربەجێ چۆن لە سوڕەتی (العلق)دا، کە یەکەمین ئایەتەکانی خوای بۆ پێغەمەر (صلى الله عليه وسلم) تێدا هاتوونە خوار، ڕێڕوونییو ئامۆژگاریی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دەکات، کە لە ئاقار هەڕەشەو گوڕەشەو فشارو ناڕەحەتییو گرفتارییەك دا، کە دوژمنو ناحەزە سەرسەختو بەدبەختەکانی وەك (أبو جهل) بۆیان ساز دەکردو ئاڕاستەیان دەکرد، بەهۆی نوێژو طاعەتو سەجدە بردنی زیاترەوە، چاکتر لەخوا نزیك بێتەوە، بۆئەوەی بتوانێ بەرهەڵستیی (مقاومة) بکاتو چۆك بە دوژمن دابدات:

﴿ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ﴿٩﴾ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ﴿١٦﴾ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴿١٩﴾ ﴾ العلق.

واتـە: ئـایـا ئەوكەسـە نابیـنی، كە بەندەیـەك قەدەغە دەكات لـە نوێـژكردن! پێـم بڵـێ، ئەگـەر ئەو بەندەیە (كـە موحەممەدە -صـلى الله علیـه وسلم)، ئەگـەر لەسـەر ڕێـی ڕاست بێت، یان فەرمان بە پارێزكاریی بكات: (ئایا ئەی ئەبووجەهـــل! ڕەوایـە ڕێگریـی لـێ بكـەی؟!). ئایا ئەگەر ئەو (وێڕای ڕێـگرتنـی) خۆیشـی بێبڕواو پشـت هەڵـكردوو بێت، ئایا نازانێ، كە خوا دەبینـێ؟! نەخێر ئەگەر دەست هەڵـنەگرێ، بێگومان بەتوندیی بە پێشـەسـەری ڕای دەكێشـین (بـەرەو دۆزەخ)، (خـاوەنی) پێشـە سـەرێكی درۆزنـی گونـاحكـار. ئنجـا با ئەو، كۆڕو مەجلیسـی خۆی بانگ بكات (كە لەسەری بكـەنەوە)، ئێمەش دۆزخەوانەكان بانگدەكـەین. نـەخێر (گـوێ مـەدە فشـارو هەڕەشـەو بەربەست دروسـتـكردنیو) بەقسـەی مەكەو، سەجدە (بۆ خـوا) ببـەو لـێی نزیـك بكـەوەوە.

**تەوەری دووەم:**

**تەزكیەی نەفس، بەشێكی ئیسلام و لایەنێكی مسوڵمانەتییەو، ئیسلامیش جگە لە قورئان و سوننەت و، مسوڵمانەتییش بێجگە لە پابەندیی پێیانەوە، شتێكی دیكە نین:**

بەڵێ خوێنەرە خۆشەویستەكانم !

كە دێینە سەرباسی تەزكیەو تەصەووف، زۆر پێویستە ئەم سێ ڕاستییە گەورەو گرنگە لەبەرچاو بگرین :-

١/ تەزكیەی نەفس بەشێكە لە ئیسلامو، لایەنێكە لە دینداریی‌و مسوڵمانەتییدا.

٢/ ئیسلام تەنیا قورئانو سوننەتە.

٣/ مسوڵمانەتیی، بەبێ پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوە نایەتە دی.

١) لەڕاستیی یەكەمەوە ئەوەمان دەستگیر دەبێ، كە هەم بۆچوونی زۆر لە نەیارانی تەصەووفو، هەم بۆچوونی زۆرێكیش لە لایەنگرە دەمارگیر (متعصب)ەكانی تەصەووفیش، هەڵەو ناتەواون، كە یەكەمیان تەصەووف بە لادانو ناشەرعیی‌و، دووەمیشیان بەسەرتاپای ئیسلامی دادەنێن !!

هەقیش ئەوەیە، كە تەصەووف، نە لە ئیسلام جیایەو، نە هەموو ئیسلامەتییشی تێدایە، مسوڵمانەتیی‌و دینداریی ڕاستو ساغ، بەبێ تەزكیە نایەتە دی، بەڵام لە تەزكیەشدا كورت هەڵنەهاتووە.

٢) لەڕاستیی دووەمیشەوە، كە جگە لە ڕستەی زۆرجار لە قورئانێدا دووبارەبووەوەی: ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ﴿٥٩﴾﴾النساء، چەندان بەڵگەی بێ

پێچ‌و پەنای دیکەش پشتگیرنی، ئەوە وەردەگیرێ، کە هەر کەسێك بیەوێ، نەك هەر بە مسوڵمانی پاك‌و چاك‌و خاوەن تەزکیە دابنرێ، بگرە هەر لەبازنەو جوغزی ئیسلامیش وەدەرنەنرێ، بە هیچ بیانووو پاساوێکەوە، هیچ سەرچاوەیەکی دیکە (وەك قسەو کەرامەتی شێخ‌و خەون‌و کەشف‌و ئیلهام) نەخاتە پاڵ قورئان‌و سوننەت‌و، بەکورتیی هیچ شتێك لە شەرعی[1] خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) زیاد نەکات.

٣) لەڕاستیی سێیەمیشەوە، ئەو ئەنجامگیرییە وەدەستدێ، کە مسوڵمانەتیی‌و دینداریکردن، تەنیا یەك ڕێگاو چۆنیەتیی هەیە، ئەویش بریتیە لە پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوەو، جێبەجێکردنی فەرمانی: ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ﴿٥٩﴾﴾ النساء، بۆیەش بەدڵنیایی: پابەندیی بە هەر کتێب‌و ڕێبازو (طريقة)و مەزهەب‌و بیرو ڕاو قسەیەکەوە، هی هەر کەسێك بێت، مادام لە چوارچێوەی قورئان‌و سوننەتدا (بەیاساو بنچینە لێ هەڵهێنجراوەکانیشەوە) نەبێ، نەك هەر قەرەبوو (تعويض)ی شوێنکەوتنی قورئان‌و سوننەت ناکاتەوە ! بگرە هەر دروستیش نیەو، هەر کەسێکیش غەیری قورئان‌و سوننەت‌و یاساو دەستوورەکانیان، بە ئایین بزانێ، ئەوە بەو بیروڕایەی شایەدیی کوفرو لە ئایین دەرچوون، لەسەر خۆی دەدات، مەگەر لەبەر نەهاتنەدی مەرجەکان‌و لانەچوونی پەرچەکانی (عدم ثبوت الشروط وعدم انتفاء الموانع) بە شێوەیەکی کاتیی (مؤقت) دەرباز ببێ.

بەرچاوڕوونیی مسوڵمانانیش، بەگشتیی‌و تایبەت، شوێنکەوتوانی ڕێبازەکانی تەصەووف، سەبارەت بەم سێ ڕاستییە گەورەو گرنگەو، هەڵسوکەوت کردنیان بەگوێرەی وان، لە چەندان هەڵەی کوشندەو بێڕەزا دەیانپارێزی.

(١) وشەی شەرع لێرەدا مەبەستمان پێی ئایین‌و بەرنامەی خوایە، نەك مانا زاراوەییەکەی کە (فقه)ە، واتە مەبەستمان لە شەرع، شەریعەتی خوایە.

## تەوەری سێیەم:

## خوا بەیەکگرتن (توحيد الله) و شوێن پێی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) هەڵگرتن (إتباع رسول الله)، کاکڵ و جەوهەری مسوڵمانەتیی و تەزکیەی نەفسن:

بەڵێ دیندارە سەنگینو شیرینەکان !

خوا بەیەکگرتن (توحید) کە بریتیە[1] لە بەیەکگرتنی خوا لە پەروەردگارێتییو، لەناوو سیفەتەکانیو، لە پەرستراوێتییدا (توحيد الله في ربوبِّيتە، وأسمائە وصفاتە، وألوهيتە) و، شوێنکەوتن (إتباع)ی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کە مەبەست پێی شوێن پێ هەڵگرتنی موو بە مووی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، لە چۆنیەتیی مسوڵمانەتییو دینداریيکردنیو بەندایەتیی بۆ خواکردنیدا، لە وردو درشتی ڕەوشتو ئەدەبو هەڵسوکەوتەکانی ژیانو گوزەرانیدا، ئەم دووانە: (التوحيد والإتباع) ئەسڵو بناغەو جەوهەری بەندایەتیی بۆ خوا کردنو، تەزکیەی نەفسو دەروونن، چونکە مسوڵمانەتییو بەندایەتیی بۆ خواکردن، بە دوو شتان پێکدێ:

أ- تەنیا خوا بپەرستریو بەندایەتیی بۆ بکری.

ب- بەس بەو شێوەو چۆنیەتییە بپەرستری، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دیاریيکردوە.

ئنجا شایانی باسە، کە سەرجەم پێشەوایانی ئیسلام بە پێشینو پاشین (سلف وخلف)ەوە، زۆر جەختیان لەسەر هەرکام لەو دوو مەسەلەیە کردوە، کە دەقەکانی قورئانو سوننەت، گرنگییو بایەخێکی بەرچاویان بە ڕوونکردنەوەو داکۆکیی لەسەرکردنییان داوە، بەڵام بەداخەوە لەمێژەو، ئێستاش لەپێشوو خراپتر، کە هەرکام لەو دوو مەسەلە

(١) سوپاس بۆ خوا دوازدە (١٢) دەرس لە زنجیرەی: (دەرسەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)مان بۆ ڕوونکردنەوەی خوا بە یەکگرتن (توحید) تەرخان کردوون.

گەورەو گرنگە، لەنێو زۆر لە شوێنکەوتووو لایەنگرانی سادەو ئاست نزمی ڕێبازەکانی تەصەووفدا، زۆر کاڵبوونەتەوەو بگرە خراپتر لەوەش، بەهۆی زێدەڕۆیی (مبالغة) کردنو ڕۆچوون (غُلُوّ) لە ڕێزلێگرتنی پیرو شێخەکانو قسەو ئاڕاستەکانیاندا، کە زۆرجاریش گۆڕراونو کەمو زیادکراون، یان هەر ئەسڵەن پیرو شێخەکان شەرعیەتیی شێخایەتییان نەبووەو، ناوی بێ نێوەڕۆك بوون، لەجێی خوا بەیەکگرتن (توحید الله) بە گەورەو پیرۆز گرتن (تعظیم وتقدیس)ی شێخو پیرەکانو، لەجێی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (إتباع رسول الله)، شوێنکەوتنی کوێرانە (التقلید الأعمی)ی قسەو ئاڕاستە هەڵەو ناشەرعییەکانی پیرو شێخەکان، بوونەتە ڕێبازو ڕێوشوێنی دینداریی‌و تەصەووف !!

ئنجا لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، کە دوو ڕێبازی باوو پەیڕەوی لێکراویی تەصەووف لە کوردستاندا - بە هەموو پارچەو بەشەکانییەوە - بریتین لە:

١- ڕێبازی (شێخ عبدالقادری) گەیلانیی (الطریقة القادریة)[١].

٢- ڕێبازی (شێخ بهاء الدین) نەقشبەند (الطریقة النقشبندیة)[٢].

شوێنکەوتووو لایەنگرانی هەرکام لە دوو ڕێبازەکەش، کەمو زۆر، گیرۆدەی چەندان جۆرە هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)ی گەورەو گچکەو، داهێنان (بدعة) بوون ! هەرچەندە ئەوەندەی (شێخ عبدالقادر الجیلاني)و (الإمام الربّاني) - کە دوو پێشەوای هەرە بەرجەستەو ناوداری ڕێبازی قادریی‌و نەقشبەندیین - جەختیان لەسەر هەردووك مەسەلەی خوا بەیەکگرتنو، شوێن پێغەمبەر کەوتن کردوە، کەم کەس هێندە پێی لەسەر ئەو دوو مەسەلەیە داگرتوە، هەروەها هەردووکیان زۆر بە تۆخیی تەئکیدیان لەسەر دژایەتییکردنو بنبڕکردنی پێچەوانەکانیان، کە هاوبەش بۆ خوادانان (الإشراك بالله)و شت لە ئایندا داهێنان (الإبتداع في الدین)ن، کردۆتەوە، ئەمەش چەند نموونەیەك لە قسەو ڕێڕوونیی ئەو دوو کەڵە پێشەواو مامۆستایە لەوبارەوە:

---

(١) لە کوردستاندا شوێنکەوتوانی ڕێبازی قادریی (دەروێش)یان پێدەگوترێ.

(٢) شوێنکەوتوانی ڕێبازی نەقشبەندییش (صۆفیی)یان پێدەگوترێ.

(شێخ عبدالقادری گەیلانیی)، کە بەزۆریی داکۆکیی لەسەر خوا بەیەکگرتن‌و بۆ خوا ساغ‌و یەکلابوونەوە کردوە، لە یەکێك لە کۆڕەکانیدا گوتوویەتی[1]: (خەڵك دەستەوستانن‌و زیان‌و قازانجت پێ ناگەیەنن، بەڵکو ئەوە تەنیا خوایە، کە ئەو شتانەیان لەسەر دەست دەرِەخسێنێ، کردەوەی خوایە کە کار لە تۆو لەوانیشدا دەکات، قەڵەمی زانیاریی خوای بەرزو مەزن، هەموو شتێکی خێرو شەڕی لەبارەی تۆوە تۆمار کردوە.

خوا بەیەکگرە صاڵحەکان، بەڵگەی خوان بەسەر خەڵکییەوە، هەیانە بەڕواڵەت‌و دەروون خۆی لەدنیا داماڵیوە، هەشیانە دنیای تەنیا لە دڵ‌و دەروونی خۆی داماڵیوە، بەجۆرێك، کە خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە هیچیان لەدڵدا نابینێ، ئا ئەوانە دڵی بێگەردو سافن، هەر کەسێك ئەمە بتوانێ، ئەوە لەلایەن خواوە بالادەستیی پێ بەخشراوە، ئەو کەسە ئازاو پاڵەوانە، ئازا کەسێکە، کە دڵی خۆی لە غەیری خوای بەرزو پایەدار پاك کردبێتەوەو، بە شمشێری خوا بەیەکگرتن (سيف التوحيد)و شیری شەرعەوە، لەسەر دەروازەی دڵی وەستاوەو، ڕێ نادات هیچ دروستکراوێك بچێتە ژوورێ‌و، دڵی لەسەر هەڵگێڕەرەوەی دڵان (مقلِّب القلوب) کۆکردۆتەوە، شەرع ڕواڵەت‌و پاك‌و پوخت دەکات، بەڵام خوا بەیەکگرتن‌و عیرفان، نێوەوە پاك دەکاتەوە).

لە کۆڕێکی دیکەیدا لەو کۆڕو مەجلیسانەی، کە بۆ خەڵکی بەغدای سازداون، هەر لەبارەی خوا بەیەکگرتنەوە گوتوویەتی[2]:

(تۆ پشتت بەخۆت بەستوەو بە خەڵك‌و بە زێڕو زیوەکەت، بە کڕین‌و فرۆشتنەکەت، بەدەسەڵاتداری وڵاتەکەت، ئنجا هەر شتێك، کە پشتت پێی قایمە، ئەوە پەرستراوتە، هەر کەسێك لێی بترسێی‌و هیوات پێی هەبێ، ئەوە پەرستراو (إلـه)تە. هەر کەسێك زیان‌و قازانجێکی لێ بزانی، بێ ئەوەی ئاگات لێبێ، کە خوای بالادەست‌و بەرز ئەو شتەی لەسەر دەست ئەنجام دەدات، ئەوە پەرستراوتە).

---

(١) بڕوانە: (الفتح الربّاني) للشيخ عبد القادر الجيلاني، المجلس الثالث عشر، ص: (٥٤، ٥٥).

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص: (٦٢، ٦٣).

(سيّد أحمد السرهندي)یش، کە بە (الإمام الربّاني) ناسراوە، لە نامەو نووسـراوەکانیدا زۆر داکۆکیی لەسەر پەیڕەوکردن لە سوننەتو شوێن پـێ هـەڵگرتنی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم)و، دووریی لە بیدعەت کردوەو، لەوبارەوە زۆر شتی گرنگـی گوتـوەو ئەوەندەی بەسە، کە زۆر بە ڕاشـکاویی‌و بوێـرانە ڕایگـەیاندوە، کە وێـڕای دەقەکـانی سوننەت لەڕێـی ئیلـهـامو کەشـفیشـەوە، بۆی دەرکەوتوەو دڵـنیابووە، کە دابەشـکردنی بیدعەت بۆ پێنج یان دوو جۆر (البدعة الحسنة والبدعـة السَّـيئة) هـەڵـەیەو، بیدعـەت چـاکـی تێدا نیـەو، هـەمووی هـەر خراپە (كلّ بِدعةٍ ضلالة)[1]!!

بەڵێ ئەمەیە ڕاو هەڵوێستی ئەو کەڵە پێشـەواو ئوسـتادانە، کـە حـەیفێ ئێسـتا لـە کوردستانو غـەیری کوردستانیش دا، گەلێك بەناو شێخو خەلیفـەو صـۆفیی‌و دەروێشـی، گیرۆدە بە شـیرك‌و بیدعـەت‌و ئەفسـانەوە، لافـی شـوێن کـەوتن‌و پـەیڕەویی لـێکردنی ڕێبازەکانیان لـێ دەدەن!!.



(١) بڕوانە: (مكتوبات الإمام الرّبّاني) للإمام الشيخ أحمد بن الشيخ عبدالأحَد السرهندي، ج: (١)، ص: (١٥٩)، الطبعة الثانية، کە گوتوویەتی: (قال بعض الناسِ إنَّ البدعة على نوعين: حسنة و سيئة... وهذا الفقيرُ لا يُشاهِدُ في شيءٍ من البدعة شيئاً من الحُسْنِ والنورانية، ولا يَحُسُّ فيها شيئاً سوى الظُّلْمَةِ والكُدورةِ...).

## تەوەری چوارەم:

### هەرچەندە قورئان و سوننەت بەسن بۆ هەر جۆرە هیدایەت و ڕێڕوونییەك، بەڵام مەگەر بە دەگمەن، دەنا بەبێ مامۆستاو چاوساغ، كاری تەزكیە وەك پێویست سەرو بەر ناگرێ:

ئەوەی سەرەوە سەرجەم زاناو پێشەواو پسپۆڕانی بواری تەزكیەو تەصەووف لەسەری یەكدەنگن‌و، بەندەش، كە لەوبارەوە شتێكی لێ حاڵیی بووبم، هەروای تێ دەگەم.

ئنجا لێرەدا ڕەنگە یەكێك بپرسێ:

باشە مادام قورئان‌و سوننەت بەسن بۆ هیدایەتی كامڵ‌و تەواو، ئەدی بۆچی، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا بەبێ مامۆستاو ڕابەرو ڕێ نیشاندەر، پرۆسەی تەزكیەی نەفس سەرو بەر ناگرێ.؟!

وەڵامەكەشی هەر ئەوەیە، كە ئاخر هەموو كەسێك ناتوانێ بۆخۆی سەربەخۆ وەك پێویست لە قورئان‌و سوننەت تێبگات، بەتایبەت لەولایەنە مەعنەوییەوە، كە قووڵترین‌و فراوانترین لایەنی قورئان‌و سوننەتە.

ئنجا دەڵێین:

ئایا شارەزایی لە كتێبەكانی پزیشكی گەریی (علم الطب)و موتاڵای كتێب‌و سەرچاوەكانی ئەندازیاریی، بەتەنیاو بەبێ مامۆستاو فێركەر، بەسن بۆ ئەوەی ئینسان ببێتە پزیشك‌و ئەندازیار؟! بێگومان نەخێر.

بۆیە نابێ ئەوەی، لەزۆر لە ئەهلی تەصەووفەوە گێڕراوەتەوە، (مَنْ لم يكُنْ لَهُ شيخٌ فَشَيْخُهُ الشيطان) بە شتێكی سەیرو نامەقووڵ دابنێین، بەمەرجێك بەڕاست‌و دروستی چەمك‌و واتای (شێخ) بزانین، كە لە بەشی پێنجەمدا تۆزێك تیشكمان خستۆتە سەری.

ئنجا کە گوتووشمانە: (مەگەر بەدەگمەن) لەبەرئەوەیە، کە هەموو یاسایەك ڕێزپەڕی هەن (لکلِّ قاعدة شواذ)و هەندێك کەس، خوای بەخشەر بە شێوەیەکی تایبەتیی هیدایەتی دەداتو، پەکی لەسەر کەس ناخاتو بۆخۆی مشور دەخواتو کاری ئاسان دەکات، وەك خوای زاناو پەنهان بین دەربارەی ئەو بەندە صاڵحەی، کە مووسا علیه السلام دەنێرێتە لای، زانیاریی لێوە فێر بێت، فەرموویەتی: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ الکهف.

واتە: ئنجا (مووساو غوڵامەکەی) بەندەیەکیان لە بەندەکانمان بینی، کە لەلایەن خۆمانەوە بەزەییمان پێ بەخشیبوو، لەلای خۆمانەوە زانیارییەکمان فێرکردبوو..

## تەوەری پێنجەم:

### تەزکیەی نەفس خەسڵەتێکی بنەڕەتیی پێشینەی چاکمان بووەو، هیچ زاناو پێشەوایەکی ڕۆچووی پاشینیش نکووڵیی و لام و جیمیی لێی نەبووە:

بەڵێ، بە سەرنجدانو تێوەڕامانی ژیانو بەسەرهاتو ئاکارو ڕەفتاری پێشینی چاکمان، زۆر بەڕوونیی دەبینین، کە هەر کامێکیان لە ڕووی مەعنەویی و ئەخلاقییەوە، لە لووتکەدا بوونو، سەرجەم سیفەتە بەرزو پەسەندەکانی وەك: (إيمان، يقين، صبر، شكر، توكل، عبادة، تقوى، زهد، تواضع، شجاعة، سخاء، إخلاص، تجرد، طهارة،....الخ) بە ئاسمانی ژیانو گوزەرانیانەوە، وەك ئەستێرەی پرشنگدار دەدرەوشێنەوە.

ئنجا شوێنکەوتووانیشیان لە زانایانی پاشین، بەهەمان شێوە بەشو پشکێکی چاکیان لەو تەزکیەی نەفسو سیفەتو ئاکارە بەرزو پەسندانەدا هەبووە، کە دەقەکانی قورئانو سوننەت کردوویانن بە دروشمو، نیشانەی بڕوادارانی پارێزکارو چاکەکار.

ئنجا لێرەدا پێویست ناکات ئاماژە بە کەسانێکی وەك:

(جُنيد البغدادي و معروف الكرخي و سَهْل التسْتري وأبو حامد الغزالي و النَّووي و العزِّ بن عبد السلام والسيوطي وابن حجر العسقلاني وابن حجر الهيتمي و....هتد) بکەم، کە یان صۆفیی (بە مانای ڕاستەقینەو ڕەسەنی) بوون، یان مەشرەب صۆفیی، بەڵکو لە ڕابردووەکان، باسی سێیان دەکەم، لە هاوچەرخەکانیش باسی سێیان، کە هیچ کامیان بە ئەهلی تەصەووف نەناسراون، بەڵام هەڵوێستی زۆر ئیجابییان لەبارەی تەزکیەو تەصەووفەوە هەبووە:

ئنجا سێیــە پێشــووەکــان: (ابـن تیمیــة)و (شـاه ولـي الله الدهلـوي)و (ابـن قیـم الجوزیـة)ن، هەرچی (ابن تیمیـة)یـە خـوا لـێـی خـۆشـبێ، کـە گـەلـێك کـەس بـە نەزانیی‌و بێئـاگـایی هەم، لە لایەنگرانی تەصەووف‌و هەم لە نەیارەکانی، بـە دوژمنـی سەرسـەختی تەصـەووفی دەزانـن !! بەڵـێ (ابـن تیمیــة) نزیکـەی (٨٠٠) لاپـەرەی دەربـارەی تەصـەووف نووسیوە، کە لە بەرگی (١١)و (١٢)ی (مجموعة الفتاوی)کـەیدا کـۆکراونەتەوە، بـەرگی (١١) بەنـاوونیشـانی: (علـم السـلوك)و، بـەرگی (١٢) بەنـاوونیشـانی: (کتاب التصـوف)ە.

هەروەها (ابن تیمیـة)، هەمیشـە وەك هـەر زانایـەکی قـووڵ‌و ڕۆچـووو دامـەزراو، جیـاوازیی خسـتۆتە نێـوان تەصـەووفی ڕەسـەن‌و پـابەند بـە قورئـان‌و سـوننەت‌و، تەصـەووفی هـەڵـەو ناشـەرعیی‌و پووچ‌و زیـانبـەخش.

(شـاە ولي الله الدهلـوي)یش خـوا لـێی خۆشبێ، کـە یەکـی دیکـەیە لـە زانـاو پێشـەوا بەرجەسـتەکـان، بەتـایبەت لە بـواری تەفسـیرو حەدیس‌و شەرع (فقـه)دا، لـە کـتێبـە نـایابەکـەی خـۆیدا (حجـة الله البـالغـة) لـەژێر نـاوونیشـانی: (مِنْ أبـواب الإحسان)دا ئەندازەی (٦٥) لاپەڕەی بۆ ڕوونکـردنەوەی مەسـەلەی تەزکـیەو ئیحسـان تەرخان کردوەو، شتی یەکجار وردو قووڵـی لەوبـارەوە هێنـاوە، کە ڕەنگـە لـە شـوێنی دیکەدا چنگ نەکەوێ[1].

(إبن قيم الجوزيـة)ش خوا لێی خۆشبێ، هەرچەندە نزیکتـرین‌و لەپێشـترین قوتـابی (ابن تیمیة)یە، بەڵام لە بواری تەزکـیەو عیـرفاندا شارەزایی‌و پسـپۆڕییەکـی تـایبەتی هـەیەو، جگـە لـە (أبـو حامـد الغزالـي) ڕەحمـەتی خـوای لـێـبێ، هیـچ زانـاو شـەرعـزانێـکم نەدیوە، هێندەی (إبن القیِّم) بە مەسـەلەی تەزکـیەو ئەخلاقـدا قـووڵ بووبێتەوەو، کتێبـەکانی (إبـن القیِّـم) زۆربـەیان کـەم‌و زۆر، بـاس‌و خواسـی تەزکـیەو عیـرفان‌و ئەخـلاقـیان تێـدایەو، هەندێکـیشـیان تەنیـا بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراون، وەك (مـدارج السّالکـین)، کـە شـەرحی کتێبـی (مَنـازل السـائرین)ی (شـیخ إسماعیـل الـهروي)یـەو سـێ بـەرگی گەورەیـەو، (إغاثـة اللَّهـفان مِـن مصـاید الشـیطان)، کـە

(١) بڕوانە: (حجـه الله البـالغة)، ج: (٢)، لە لاپەڕە: (١١٧- ١٨٢).

کتێبێکی قەبارە زلی (٧٠٠) لاپەڕەییەو، زیاتر دەربارەی فێڵو پیلانەکانی ئیبلیسی نەگریسە، لە هەموو بوارەکانی ئیمانو عەقیدەو عیبادەتەکانو ڕەوشتو خوو مامەڵەو بازرگانییو، سەرجەم هەڵسوکەوتەکان (معاملات)و ..هتددا و، کتێبی: (طريق الهجرتين وباب السَّعادتين)، کە نزیکەی (٥٠٠) لاپەڕەیەو کتێبی: (حادي الأرواح إلى بلاد الأفراح) و (الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي) و (مفتاح دار السَّعادة) و (كتاب الروح)...هتد.

**سێ زاناو پێشەوا هاوچەرخەکانیش – کە بێگومان چ ڕابردووەکان، چ هاوچەرخەکانیشمان، تەنیا وەك نموونە هێناونەتەوە – بریتین لە:**

(حسن البنّا) ڕەحمەتی خوای لێبێو، (بديع الزمان: مەلا سەعیدی نوڕسیی) خوا لێی خۆشبێو، (سيد قطب إبراهيم) خوا لێی خۆشبێ.

هەرچی یەکەمیانە، کە دامەزرێنەری یەکەمینو گەورەترین کۆمەڵی ئیسلامییە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا: (الإخوان المسلمون)، دەربارەی پەیامو بانگەوازی کۆمەڵەکەیو بەرنامەو پەیڕەوی بەرێوەچوونیو دروشمو شیعارەکانی، چەند شتێکی گوتوە، لە یەکێك لە بڕگەکانیدا: (وحقيقة صوفية) هاتوە، واتە: لایەنێك لە بەرنامەو بانگەوازەکەمان تەزکیەو تەصەووفێکی ڕاستەقینەیە[1].

دووەمیشیان، کە زاناو پێشەوایەکی هەڵکەوتووی کوردستانی تورکیا بووەو سەرجەم نووسراوو بەرهەمەکانی، کە بەزۆری لەحاڵەتی دوورخراوەییو حەپسکراوییدا (منفيّاً ومسجوناً) نووسیونی، سەدو سی (١٣٠) نامیلکەن، ئێستا لە دە (١٠) بەرگی گەورەدا چاپکراون، بە ناوونیشانی (كلّيات رسائل النور)، هەم سەرتاپای ژیانیو هەم تێکڕای بەرهەمەکانی – بەتایبەت هی دوای قۆناغی دووەمی ژیانی کە خۆی ناوی ناوە: سەعیدی تازە (السَّعيد الجديد) – تەرخانکردوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئیمانو عەقیدەو

(١) ئەم مەسەلەیە لە گەلێك کتێبو سەرچاوەی کۆمەڵی ناوبراودا هاتوە، بۆ وێنە بڕوانە: (تربيتنا الروحية)ی سعيد حوّى.

لایەنی تەزکیەو ئەخلاق، هەرچەندە زۆر بەڕاشکاوییش ڕایگەیاندوە، کە مەسلەکی صۆفیایەتیی نەگرتوەو شێخی طەریقەتیش نیە، لەگەڵ پێشاندانی ڕێزو حورمەتی زۆری بۆ ڕێبازەکانی تەصەووفو پێشەوا بەرجەستەکانی بەتایبەت (عبدالقادر)ی گەیلانییو (سید أحمد)ی سەرهەندیی[(١)].

سێیەمیشیان (سید قطب) ، کە ئەدیبو نووسەرێکی زەبر دەستو ناوازەو، توێژەرەوەیەکی لێهاتووی قورئانو تێکۆشەرو، پاڵەوانێکی کەم وێنەو فیداکاری[(٢)] ئیسلام بووەو، گەلێك کەسی ناحاڵییو فەقیرحاڵ بە دژی تەصەووفی دەزانن !! لە گەلێك شوێنی (فـي ظلال)ەکەیدا شتی زۆر قووڵو وردی لە بواری ئیحسانو تەقواو تەزکیەدا گوتوە، کە لە ئەنجامی لەگەڵ خودا خەریك بوون (مجاهدة النفس)و بەرەو خواچوونو پێهەڵچوونی زۆرەوە نەبێ، مەحاڵە ئینسان تامیان بکاتو فامیان بکات !

بۆ وێنە: سەرنجی بدە چۆن چۆنی تەفسیری ئەو ڕستە بە بڕستەی قورئان دەکات: ﴿ ....فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥ ... ﴿٥٤﴾ ﴾ المائدة، نووسیویەتی:

{﴿ ....فَسَوْفَ يَأْتِي ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥ ... ﴿٥٤﴾ ﴾ المائدة، یەکدی خۆشویستنو لە یەکدی ڕازیبوون، بناغەی پەیوەندیی نێوان ئەوانو پەروەردگاریانە، خۆشەویستیی...

---

(١) بڕوانە: (کلیات رسائل النور)، ج: (٢) (مکتوبات)، ص: (٧٩)، شایانی باسیشە، کە سەعیدی نۆرسیی زیاتر لە سی (٣٠) ساڵی تەمەنی خۆی بە دوورخراوەیی‌و سجنکراویی بەڕێ کردوە، لەلایەن ڕژێمە ڕەگەزپەرستو سیکۆلاریستە یەك لەدوای یەکەکانی تورکیاوە، تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا پۆلیس چاوەڕێی کردوەو بەدەورییەوە بوونو، دوای مردنو نێژرانیشی گۆڕەکەی شوێنە ونکراوە !! بڕوانە: (کلیات رسائل النور)، ج: (٩) (سیرة ذاتیة)، خوا بە لوتفی خۆی پلەوپایەی مامۆستا مەلا سەعید بەرز بکاتەوەو بەچاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

(٢) هەرکام لە (حسن البنّا) و (سید قطب) بە دەسیسەو دەست لەپشتدانی زلهێزانو، بەدەستی ڕژێمە کافرو دەغەڵە خۆماڵییەکانی میسر، یەکەمیان بە فیشەك لە (١٩٤٩)و دووەمیشیان بە سێدارە (١٩٦٦) کوژران، خوا بە شەهیدی وەرگرتبنو پلەو پایەیان بەرزو بەرزتر بکاتەوەو، بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

ئەو ڕووحە نەرمو هێمنو گەشو جوانو درەوشاوەیە... ئەوەیە، کە ئەو کۆمەڵە بە پەروەردگاری دۆستیانەوە گرێ دەدات.

ئنجا بێگومان خۆشەویستیی خوا بۆ یەکێك لە بەندەکانی، شتێکە، کە هیچ کەس ناتوانێ نرخو پایەی بناسێ، مەگەر کەسێك کە خوا - پاکیی بۆوی - بەو جۆرە دەناسێو بەو سیفەتانەوە کە خۆی پێیان وەسف کردوەو، مەگەر کەسێك، کە بە هەموو کەسایەتییو دەروونو هەستو نەستییەوە تەفاعولی لەگەڵ ئەو سیفەتانەدا کردبێت... بەڵێ هیچ کەس حەقیقەتی ئەو بەخششە نازانێ، مەگەر کەسێك، کە حەقیقەتی ئەو بەخشەرە بناسێ... کەسێك، کە دەزانێ خوا کێیە... کێ بنیاتنەری ئەو بوونەوەرە زەبەلاحەیە، بەدیهێنەری ئەو ئینسانەیە، کە بەو گچکەییەی بوونەوەری لەخۆیدا کورتو پوخت کردۆتەوە... کێیە بەو هەموو مەزنییو دەستەڵاتو تاکییو خاوەنداریێتییە؟ ئەو زاتە کێیەو ئەو بەندەیە کێیە، کە خوا لە خۆشویستنی خۆی بەشی دەدات... لە حاڵێکدا، کە بەندەکەش هەر دەستکردی خۆیەتی – پاکیی بۆوی - و ئەویش پایە بەرزی مەزنو زیندووی هەمیشەو هەربووی هەرماوو یەکەمینو دوایینو ئاشکراو پەنهانە.

هەروەها خۆشویستنی بەندەش بۆ پەروەردگاری، نیعمەتێکی ئەو تۆیە بۆ بەندەکەی، کە مەگەر ئەوەی چێژتبی ئەگەرنا تێی ناگات! ئنجا هەر وەك چۆن خۆشویستنی خوا بۆ بەندەیەك لە بەندەکانی، شتێکی بەرزو مەزنەو بەخششێکی داپۆشەرو بێ هاوتایە، چاکە لەگەڵ کردنی خوا بۆ بەندەکەی، کە هیدایەتی داوە، خۆشی بوێو ئەو لەززەتە جوانو بێوێنەیەی پێ ناساندوە، کە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی، تاموچێژی خۆشەویستیی پێی ناچێو هاوتای نیە، ئەمیش دیسان چاکە لەگەڵ کردنو بەخششێکی بەرزو بالایە.

ئنجا ئەگەر خۆشویستنی خوا بۆ بەندەیەك لە بەندەکانی شتێکە لە سەرووی ئەوەوەیە، کە بتوانێ وەسفی بکات، ئەوە خۆشویستنی بەندە بۆ پەروەردگاری جاروبارێك، وەك بۆ هەڵکەوتنێکی کەم لە هەندێك وتەی خوا خۆشەویستاندا وێنەی کێشراوە، ئەمەش ئەو بوارەیە، کە پیاوانی پێگەیشتووو ڕاستو ساغی

تەصـــەووف تێیدا پێشـــکەوتوون، هەرچەندە ئەوانە کەمێکن لەنێو ئەو هەمـوو ئـاپۆرایـیە زۆرەدا، کە خۆیان بە تەصەووفەوە هـەڵـواسـیوە...

ئێستاش لەگەڵ بـێ ئـەو چـەند دێـڕە شـیعرەی (رابعـة العدويـة) تـامو چێـژی ئـەو خۆشـەویسـتییە ڕاسـتەقینەیەم تێ دەگەیەنن، کە گوتوویەتی:

فلـيتـك تَحْلـــو والحيــاة مريــرةٌ     وليتــك ترضـى والأنــام غِضـــابُ
ولــيت الّـذي بيني وبينك عامِرٌ     وبيني وبَيْـن العـالمـين خـــرابُ
إذا صـحّ منك الـوُدُّ فالكـل هَيِّنٌ     و كــل مـا فـــوق التـراب تُرابُ

ئنجا ئەو خۆشـەویشـتییەش لە خوای پایە بەرزەوە بـۆ بەندەیـەك لـە بەندەكـانی و، خۆشـویسـتنی خـوا لە بەندەوە بۆ خـوای چاکەکاری بەخشـەر، لـە سـەرتاپای بـوونو تێکڕای بوونـەوەری پـانو پـۆڕدا هەیـەو، لـە هـەمـوو زینـدووێكو هـەمـوو شـتێكـدا چەسـپاوەو، وەك هـەواو سـێبەرێك تێکـڕای ئـەو بوونـەی وەبـەرخۆ داوەو، هـەمـوو مرۆڤایـەتیی داپۆشـیوە، کـە لـەو بەنـدە خۆشـەویسـتو خۆشـویسـتـراوەدا خـۆی دەنوێنـێ}[1].

بەڵـێ، ئەمەیە هەڵوێسـتی پێشـەواو زانایانی پێشینو پاشینو هاوچـەرخ، دەربـارەی تەزکـیەو تەصـەووف !.



(١) بڕوانـە: (فـي ظلال القرآن)، ج: (٢)، ص: (٩١٨).

### تەوەری شەشەم:

### پێشەوایانی تەزکیەو تەصەووف، جگە لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێچکەیەکی دیکەیان دانەهێناوە:

بەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی مسوڵمان بەگشتییو، بەتایبەت شوێنکەوتووو لایەنگرانی ڕێبازەکانی تەصەووف بە شێخو ڕیش سپییەکانیشیانەوە، پێیان وایە، کە هەرکام لە شێخو پێشەواو سەرقافڵەکانی ڕێبازەکانی تەصەووف، ئەو ڕێو شوێنو جۆرە دینداریی‌کردنەی، کە لەسەری ڕۆیشتوونو، خەڵكو شوێنکەوتووانی خۆیانیان لەسەری پێگەیاندوەو کۆکردۆتەوە، شتێك بووە خۆیان دایانهێناوەو، ڕچەیەك بووە خۆیان شکاندوویانە!

بەڵام لەڕاستییدا وانیەو ئەو جۆرە بۆچوونە، جگە لەوەی فڕی بەسەر هەقو ڕاستییەوە نیە، تۆمەتو بوختانێکی زلیشە، کە ئاڕاستەی ئەو پێشەواو مامۆستاو صاڵحو پایەبەرزانە دەکرێ !

چونکە بێگومان هەموو هەوڵو کۆششی پێشەوایانی وەك: (شێخ جُنید البغدادي وأبو سلیمان الداراني وإبراهیم بن أدهم و... پاشان أبو حامد الغزالي و عبدالقادر الگیلاني وبهاءالدین نقشبند و...هتد) بۆ ئەوە بووە، کە خۆیان بە وردییو موو بە موو بە ڕێبازی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بڕۆنو، هیچ کام لەو پێشەواو سەرقافڵەو پایەبەرزانە، بە هیچ کەسێکیان نەگوتوە: شوێن (جنید) یان (أبو سلیمان) یان (إبراهیم بن أدهم) یان (غزالي) یان (گەیلانیی) یان (بهاء الدین) بکەون، بەڵکو گوتوویانە: شوێن ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەون.

ئنجا هۆی ئەوەش، کە لەپاش خۆیانو ڕچەو ڕێوڕەسمەکانیان وەك ڕێباز (طرقة) بەناوی خۆیانەوە ناونراونو گوتراوە: ڕێبازی گەیلانیی، ڕێبازی سوهرەوەردیی، ڕێبازی نەقشبەندیی...هتد، ئەوە بووە، کە شوێنکەوتووەکانیان نەیانتوانیوە ئەو ڕێبازەی ئەوان

- کە خودی سوننەتو ڕێو شوێنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە - ببەنەوە بنەوانو لەبەرتیشکی دەقەکانی قورئانو سوننەتدا پێیەوە پابەندبنو، وەك شوێنکەوتووی لاساییکەرەوە (مُقَلِّد)ی مەزهەبە فیقهییەکان، هەروا لە ڕەش ڕاکەوتوونە دوایانو دواییش، کە بە تێپەڕبوونی کاتو ڕۆژگار، کەمو زیادییان تێدا کراوەو گۆڕراوونو شێوێنراون، خەڵکەکەش لەبەر بێ ئاگایيو نەشارەزایی، وردە وردە ئەسڵو بنەڕەتو حەقیقەتی ڕێڕوونیيو ڕێو ڕەسمی ئەو شێخو پێشەوایانەیان فەرامۆش کردوەو، دەقیان بە بارە ناشەرعییو هەڵەو ناڕاستەکەیانەوە گرتوەو پێشیان وابووە، کە هەرچی بەناوی (عبدالقادر الجیلاني)و (بهاء الدين نقشبند)ەوە ئەنجام دەدرێو مومارەسە دەکرێ، ئەوە خودی (عبدالقادر)و (بهاء الدين) قَدَّسَ اللهُ روحَيْهما دایانهێناوە !!

بەڵام لەڕاستییدا وەك چۆن پێشەوا سەر مەزەبەکانی وەك (الحسن البصري و سفيان الثوري و ابن الـمُسَيَّب و أبو حنيفة و جعفر الصادق و مالك و الشافعي و الطّبري و أحمد و داود) ڕەحمەتی خوایان لێبێ، ئەوەی کە بەناوی ئەوانەوەیە، تەفسیرو شەرحی ئایەتو فەرموودەو، ئەوپەڕەکەی تێگەیشتنو بۆچوونی ئەوانە لەو مەسەلانەدا، کە زیاتر لە ڕاوبۆچوونو تێگەیشتنێك هەڵدەگرن، ڕێبازەکانی تەصەووفیش بەهەمان شێوەنو بگرە زیاتریش، چونکە ئەگەر بیروڕاو ئیجتیهادە فیقهییەکان زۆر جۆراوجۆرن، ڕێو شوێنو چۆنیەتی خواپەرستییو تەزکیەی نەفسو لە خوا نزیکبوونەوە، ئەو هەموو بوارو فراوانییەی تێدا نییە.

گرنگ ئەوەیە، کە ئێمە دڵنیابین، هیچ کام لە پێشەواو چاوساغانی صاڵحو ڕێ پیشاندەرو خەڵك بەرەو خوا بەر، هیچ کاتێك بەخۆیانیان ڕەوا نەبینیوە، کە شتێك لە ئیسلامدا زیاد بکەنو دابێنن، چ جای ڕێباز (طريقة)ێك !! کە دوایی بکرێتە بەدیلی ڕێبازو (سنة)ی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە ئێمە کاتێك بەرگریی لە ڕێبازەکانی تەصەووف دەکەینو، دەڵێین لە بنەڕەتدا خاوەنەکانیان وەك ڕێبازو ڕێو ڕەسمێکی جیاو تایبەت دایاننەهێناون، مەبەستمان لەو ڕێبازانەیە، کە خاوەنەکانیان زاناو پێشەوای ناودارو ناسراون وەك: (أبو حامد الغزالي، عبدالقادر الجيلاني، وسيّد أحمد السرهندي و، مولانا

خالـد الكـردي)، نـەك هـــەر كـــۆلكە شـێخێك چـوار صـۆفيیو دەروێشـــی لـەخۆی کۆکردبێتەوە، بتوانین ئەو تۆباڵـــەی بـۆ بکـێشـــین، یـان هـەر کەسـێك لـەژێر پـەردەی تەصەووفـدا، هەر شـتێکی گوتبـێو کردبێ هـەرچـۆن بێ، هەر هەوڵ بدەین بـۆی پینـە بکـەینو بـۆی ڕەشـــەرع بخـەین !! کـە دیـارە کەســـانی وەك: ابـن عربـي وابـن سـبعین وحـلاّجو...هتد، بەنـاوی تەصەووفو عیـرفانو زوهـدو تـەقواوە، چـەندە شـتی بێتـامو هەڵەو پەڵەیان گوتـوە (یـان بـەناوەوە گـوتراوە)و چـەند ڕەفتـارو هەڵوێســـتی خــراپو ناشەرعییان لـێ پشـکوتۆتەوە (یان پاڵ دراوەتەلا)، کە بێگومـان هـیچ خـــاوەن دیـــنو عەقڵـێـك، ڕێگـا بەخـۆی نـادات تەئویـــلو پینـەیان بکـات.

پێشـم وایە چاکتـرین شت بۆ لەبێژنگـدانو لەمەحەکـــدانی ڕێبازەکـانی تەصـەووفو کەلەپوورەکانیان، پاش هەڵسـەنگاندنیان بە تـەرازووی قورئـانو ســـوننەت، ئەوەیـە کـە قســەو ڕەفتاری – لەڕێـی متمانە پێـکراوەوە گەیشـتووی – ئەو پێشـەواو چاوســاغانە بکرێنـە پێـوەر، بۆ وێنـە:

با کـتێبەکـانی (فتوح الغيب)و (الفتح الرباني والفيض الرحماني)و (الغُنْيـة لطالبـي طريقة الحق)ی (عبدالقادر الگيلاني) بۆ ڕێبـازی قـادریی، بکرێنـــە پێـــوەرو تـەرازوو و، کتێبی (مكتوبات الامام الربّاني) بکرێنە تەرازووو پێوەری ڕێبازی نەقشـــبەندیی، ئنجـا ئەوکاتـە تـێ دەگـەین، کـە قسـەو بیـــروڕای ئـەو پێشـــەوایانە دەربـارەی تەزکیـــەو تەصـەووفو ڕێبازەکـانی، چـیو چــۆن بـوون، ئێســـتاش چـییان لـــێ بەسەرهـــاتوەو، خەڵـکی بەگشـتییو لایەنگرو شوێنـکەوتووانیان بەتایبـەت، چەندە پێیـانەوە پابەنـــدو، چـەندەش لـێیـان وەدوور کـەوتوە !!

## تەوەری حەوتەم:

## کێشەو مشت و مڕی نێوان سەلەفییەکان و صۆفییەکان لەسەر ئەسڵی سەلەفییەت و تەصەووف، بەرهەم و زادەی حاڵیی نەبوون و کرچ و کاڵ بوونە:

بەرلەوەی بچینە نێو توێژینەوەی ئەم مەسەلەیەوە، سەرنجی خوێنەرە خۆشەویستەکان بۆ ئەوە ڕادەکێشم، کە بە بەلاش نەمگوتوە: (... لەسەر ئەسڵی سەلەفییەتو تەصەووف) بەڵکو دەمەوێ هەر لە بەراییەوە ڕێ لەو قسەیە بگرم، کە دەڵێ: چۆن تێکگیرانی سەلەفییەکانو صۆفییەکان بەرهەمو زادەی حاڵیی نەبوونو کرچوکاڵ بوونە؟! ئایا لە کاتێکدا بابای صۆفیی، گیرۆدەی شیرك (وەك هاوارکردنە شێخ)، یان بیدعەت (وەك داهێنانی ناشەرعیی) بووەو، بابایەکی سەلەفیی لەگەڵی تێکدەگیرێ، لەسەر حاڵیی نەبوونو کرچو کاڵ بوونە، یان بە پێچەوانەوەوە ؟!

بەڵێ، من دەڵێم، تێکگیرانو شەڕە دەندووکەی ئەو دوو کۆمەڵە، ئەگەر لەسەر ئەصڵی (سەلەفییەت)و (تەصەووف) بێ، ئەوە شتێکی هەڵەیەو زادەو بەرهەمی حاڵیی نەبوون، یان کرچو کاڵ بوونی لایەکیان، یان هەردوو لایانە، بەڵام تێکگیرانو مشتومڕی سەلەفییو صۆفیی، یان هەردوو مسوڵمانێکی دیکە، لەسەر شیركو بیدعەتو... هتد، ئەوە شتێکی، نەك هەر ئاساییو ڕەوا، بگرە پەسەندو پێویستیشە.

ئنجا ئێستا با بگەڕێینەوە سەر ئیسپاتکردنو ڕوونکردنەوەی ناونیشانی باسەکەمان:

ئایا (کێشەو تێکگیرانی سەلەفییو صۆفییەکان لەسەر ئەسڵی سەلەفییەتو تەصەووف)، زادەو بەرهەمی ناحاڵیبوونو کرچوکاڵ بوون نیە؟!

ئایا مادام (سەلەفییەت) بریتی بێ لە تێگەیشتن و حاڵیبوون لە قورئان و سوننەت، بەپێی تێگەیشتنی پێشینی چاکمان (سَلَفُنا الصّالح) و بەڕێوەبردنی ئیسلام و، پیادەکردنی شەریعەتی خوا لەبەر ڕۆشنایی چۆنیەتی بەڕێوەبردن و پیادەکردنی پێشینی چاکماندا و، مادام تەزکیەی نەفس و تەصەووف، بریتی بێ لە پاکبوونەوەو بژارکردنی نەفس لە سیفەتە نزم و پەستەکان و، چاککردن و ڕازاندنەوەو گەشەپێدانی بەهۆی زیادکردن و بەهێزکردنی سیفەتە بەرزو پەسندەکان (الفضائِل)، ئاشکراشە، کە پیسترین و خراپترین سیفەت و (رذیلة) هاوبەش بۆ خوادانان (الإشراك بالله) و، چاکترین و، بەرزترین سیفەت و (فضیلة)ش خوا بەیەکگرتن (توحید الله)ە، بەڵێ مادام سەلەفییەت ئەوە بێ، کە گوتراو، تەزکیەو تەصەووفیش ئەوە پێناسەی بێت، بێگومان، نەك هەر هیچ جۆرە دژایەتیی و ناکۆکییەکیان لەنێواندا نیەو، پێکەوە تەباو ڕێکن، بگرە زۆریش پێکەوە پەیوەستن و گەلێکیش بۆ یەکدی پێویستن و، لە ڕاستییدا - وەك پێشتریش گوتمان - تەزکیەی نەفس، یەکێکە لە خەسڵەت و دروشمەکانی پێشینی چاکمان، کەواتە:

لە لایەکەوە تەزکیەی نەفس، بەشێکە لە سەلەفییەت و، لەلایەکی دیکەشەوە پەیڕەوییکردن و شوێنکەوتنی سەلەفی صالحمان، بەبێ نەفس تەزکیەبوون مسۆگەر نابێ.

بە واتایەکی دیکە:

ئەگەر بتەوێ شوێنکەوتووی سەلەفی صالح بی، دەبێ خاوەنی تەزکیەبی، ئەگەر بشتەوێ تەزکیەی نەفست دەست بکەوێ، پێویستە ڕێبازی سەلەفی صالح بگری و، بە موو لێی لانەدەی، هەتا بە مرادو مەنزڵ دەگەی.

بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە بەکارهێنانی هەرکام لە ناوونیشانەکانی صۆفیی‌و سەلەفیی[١] وەك یەك‌و بە ئەندازەی یەك (بیدعەت)[٢]ن!

چونکە خوا بە دەقی قورئان ناوی لێناوین بڕواداران (مؤمنین)و مسوڵمانان (مسلمین) وەك فەرموویەتی: ﴿ ... فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾ آل عمران، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ .. هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا .. ﴿٧٨﴾ ﴾ الحج.

کەواتە:

ناوونیشانی ئەندامانی ئۆمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەکاتی ئاساییدا بریتییە لە:

بڕوادار (مؤمن)، مسوڵمان (مسلم).

بەڵام لە حاڵەتی نائاسایی‌و لە بەرامبەر ئەهلی بیدعەتدا، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە هەرکام لە وشەی (سنة)و (جماعة) لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوون، پێشینەی چاکمان نازناوی (أهل السنة والجماعة)یان بۆ پێناسەی شوێنکەوتووە ڕەسەن‌و ڕاستەکانی ڕێبازی پێغەمبەرو (صلى الله عليه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەکانی هەڵبژاردوە، لە بەرانبەریشدا، دەستەو تاقمە جیاجیاو پەرتەوازەو سەرگەردانەکانی، وەك (خوارج، مرجئة، رافضة، ناصبة، معتزلة، جبرية، قدرية)شیان بە شۆرەتی: (أهل الفرقة والبدعة) ناوزەد کردوون[٣].

---

(١) وشەی (سەلەفیی) ماناو چەمکێکی دیکەی هەڵەی هاوچەرخیشی هەیە، کە کەسانێك لە شێوەی چەند تاکێکی پرش‌و بلاو، یان کۆڕو کۆمەڵو ڕێکخراوێکدا، بۆ خۆیانیان کردۆتە ناوونیشان‌و، لەبەرئەوەی جۆرو شێوەی زۆریان هەن، ناگونجێ پێناسەیەکی تایبەتیان بۆ دیاریی بکەین.

(٢) مەبەست لە وشەی بیدعەت لێرەدا، بیدعەتی زمانەوانیی‌و عورفییە، نەك شەرعیی.

(٣) لە (ابن عباس)ەوە گێڕراوەتەوە کە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ... ﴿١٠٦﴾ ﴾ کە ڕستەیەکە لە ئایەتی ژمارە (١٠٦)ی (آل عمران) گوتوویەتی (تبيضُّ وجوه أهل السنّة والجماعة وتسودّ وجوهُ أهل البدعة والفرقة...) بڕوانە: تفسير القرطبي، ج: (٢)، ص: (١٢٩، ١٣٠).

کەواتە:

دیارییکردنو هەڵبژاردنی هەر شۆرەتو ناوونیشانێکی دیکە، بۆ دیارییکردنی مسولّمانانی ڕێكو ڕاست، بەجۆرێك لە بیدعەت دادەنرێو، کە ناوێك پەیدا کرا، زیاتریش دەبێ، مەرجیش نیە هەر کەسێك ناوێکی لەخۆی نا، نێوەڕۆکەکەشی هەبێ: بەڵکو زۆرجار بەپێچەوانەوەیە، مادام وابێ، کێ دەیەوێ مسولّمانی چاکتر بێتو، باشتر بەدوای سەلەفی صالّح بکەوێو، زیاتر تەزکیەی نەفسی دەست بکەوێ، با هەوڵ بدات بە پەیداکردنی نێوەڕۆکی ئەو شتانە بە ئامانج بگات، نەك بە ناوی باش لەخۆنانو، پاشان شەڕو هەرای لابەلاکردن لەسەر ئەو ناوەشو، دەمارگیریی (تعصب) بۆ پەیداکردنیو، دۆستایەتییو دوژمنایەتیی لەسەرکردنیو، تۆمەتبارکردنی هەرکەسێك کە ئەو ناوە تازەو پەیداکراوو داهێنراوەی لەخۆی نەنابێ، هەرچەندە زۆریش لە نێوەڕۆکی ئەو شتانە بەهرەمەند بێ، کە ئەو بەناوو دروشمی ڕووتیان قەناعەتی کردوە!!

هیواداریشم هیچ کەس بە ناهەق لەو قسەیەم، کە دەڵێم: ناوی سەلەفییو صۆفیی لەخۆنان، هەردووکیان هەڵەنو داهێنراون - بەو چەمکەی، کە پێشتر ڕوونم کردەوە — ئەوە نەفامێتەوەو هەڵنەهێنجێ، کە من دەڵێم: با هیچ کەس ڕێڕەو (إتّجاه)ی سەلەفییەت نەگرێو، تەزکیەو تەصەووفی تێدا نەبێ !!

چونکە ڕێبازی سەلەفی صالّح گرتن شتێکەو، ناوی سەلەفیی لەخۆنان شتێکی دیکەیە، وەك چۆن نوێژکردن شتێکەو، شۆرەت (لقب)ی نوێژکەر فلان، بۆ خۆ هەڵبژاردن، شتێکی دیکەیە !

من دەڵێم سەلەفییەت بە ماناو چەمکی ڕاستو دروستو پێشینیی - نەك بە واتاو چەمکی باوو عورفی هاوچەرخ - کە بریتیە لە گرتنی ڕێبازی پێشینی

---

ئێستاش {٢٠٢٠/٩/٣٠ز- ١٤٤٢/٢/١٣ك} دەڵێم: لە کتێبی دووەمی {مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع دا}دا، بە ناوونیشانی: {هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسولّمانان}دا، باسمان کردوە، کە جگە لەناوی: (مسولّمانان) هیچ ناوونیشانێکی دیکە بۆ کۆکردنەوەی مسولّمانان، ڕەوا نیە، ئەو شوێنەوارەی لە (ابن عباس)یشەوە لەو بارەوە هاتوە، لەڕووی سەنەدەوە ڕاست نیەو، بۆ ئەو ناوونیشانە: (أهل السنة..) کە زانایان دایانناوە، بە بەڵگە ناشێ.

صاڵحمان، لە هەموو بوارو لایەنەکانی دینداریی کردنداو، بە لەبەرچاوگرتنی هەلو مەرجەکانی کۆمەڵگاو دەوروبەرمانو گۆڕانی دنیاو ڕۆژگار، خاڵێکی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانەو، کالایەك نیە تەنیا بەبالای هەندێك کەس بڕا بێت، شتێکیش نیە، کە ئینسان بتوانێ بە ناو لەخۆنانی ڕووت، وەدەستی بهێنێ، هەر کەسێکیش ئەو ناوە لەخۆی نەنێ، بەشی ببڕێو پشکی نەمێنێ !!

بەڵێ سەلەفییەت ڕێرەوێکە، کە دەبێ ئینسان بە کردەوە بیگرێتەبەر، نەك تەنیا ناوو شۆرەتێك بێتو، لە بازاڕی وشەکاندا موزایەدەی بەسەر خەڵکییەوە پێوە بکات[1]!!

دیسان ناوی صۆفی فلان لەخۆ نەنانیش، ئەگەر ئینسان بە کردەوە پشكو بەشی لە تەزکیەو تەصەووفدا هەبێ، لەبەر بێ نازناویی، تەزکیەو تەصەووفەکەی لەدەست ناچێ ! وەك چۆن ئەگەر نێوەڕۆکی تەزکیەو تەصەووفی نەبێت، بە نازناوو شۆڕەتی، نەك صۆفییو دەروێشو دێوانە، بگرە خەلیفەو شێخیش، هیچی بۆ بەهیچ ناکرێو، بەناوی ڕووت قەرەبووی بێ نێوەڕۆکیی بۆ ناکرێتەوە.

---

(١) جارێکیان لە وتارێکی ڕۆژی جومعەداو لە باسی ئیمانو عەقیدەو پێکهێنەرەکانی ئیمانو هەڵوەشێنەرەکانیدا، باسی ئەوەم کرد، کە بابای نوێژنەکەری تەنبەڵ، زانایانی ئیسلام لەوەدا، کە ئایا بەهۆی نوێژ نەکردنەکەیەوە لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەردەچێ، یان نا؟! ڕا جیاییان هەیەو پاشان من ئەو ڕایەم لە ڕووی بەڵگەوە بە بەهێزتر دانا، کە دەڵێ بابای نوێژنەکەر پاش هاتنە دی مەرجەکانو لاچوونی پەرچەکان (بعد ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) حوکمی کوفری بەسەردا دەدرێ، پاشان بیستمەوە، کە هەندێك مسوڵمانی (سەلەفیی ناو) گوتبوویان ڕایەکەی فلانکەس پێچەوانەی ڕای سەلەفی صالحەو هەڵەیە !! منیش زۆرم پێ سەیر بوو، چونکە ئەو ڕایەی هەڵمبژاردوە، هی زۆربەی هەرەزۆری زانایانی پێشین (سلف)ە، وەك لە بەرگی دووەمی (خواپەرستیی ئیسلامی)دا، ڕوونم کردۆتەوە، بەلام وادیارە ئەو جۆرە کەسانە پێیانوایە، خۆیان چونکە ناوی (سەلەفیی)یان لەسەرە، ئەگەر نەك هەر لەسەر ڕاو ڕێبازی سەلەف نەبن، بگرە مەزهەبییەکی ئیشكو (شەخسیی)یش بن !! ئەوە ڕایەکەیان هەر بە پێی ڕێبازی سەلەفی صالحەو، ئێمەومانانیش هەر لەبەرئەوەی لەبەر ڕێزگرتنمان لە بیرو ڕای سەلەف !! ئامادە نەبووین نازناوێك هەڵگرین، کە ئەوان هەڵیانەگرتوە، ئەوە هەرچەندە قسەو ڕایەکانمان بەڵگەدار بنو، بەپێی بەرنامە (منهج)و ڕێبازی سەلەفی صالح بن، چونکە ناومان (سەلەفیی) نیە، هەر نابینە سەلەفیی! هەڵبەتە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەش زۆر چەوتو هەڵەیەو، لەگەڵ ڕێڕەوی سەلەفییەت دژو پێچەوانەیە.

کـەواتـە:

با چی دیکـە مسـوڵمانانی (سـەلەفیی نـاو)و (صـۆفیی نـاو) لەسـەر شـتێك، کـە ناهـێـنێ، کێشـەو مشـتومڕ نەکەن و پێشـیان وانەبێ، کە سەلەفییەت و تەصەووف - بە مانـای ئەسـڵیی و ڕاسـت و دروسـتیان - دوو شـتی پێکـەوە دژو پێچـەوانەن، مەگـەر کەسـانی وەك: (إبن تيمية)و (عبدالقادر الجيلانـي) هەر کام لـە سەلـەفییەت و تەزکیـەو تەصەووفیان، زۆر بە درەوشاوەیی تێدا نەبووە؟!!.

خوێنــەری بەڕێـزو شـیـرین !

ئـەوەی لەو چـەند لاپەڕەیەدا دەیخوێنینەوە، شیلەو گوشراوو بەرهەمو زادەی ئـەزموون (تجربـة)ی کردەیی تایبەتی بەندەیە، لـە مـاوەی چارەگە سـەدەیەکـدا، هـەر لـە سـاڵی (١٩٧٦)ەوە هەتا ئەمسـاڵ (٢٠٠٠)، واتە لەو سـاڵـەوە کە لە پۆلـی دووەمی نێوەندیی پەیمانگای ئیسـلامیی بووم لـە سـلێمانی، کـە تەمـەنم (١٥ - ١٩) سـاڵ بـوو هـەتا ئێسـتا، کە گەیشتوومە دەوری چل (٤٠) ساڵ، شـایانی باسیشـە، کـە مـن لـەم چـەند لاپەڕەیەدا بەسەرهـاتو سەرگوزشتەی ئەو سـەفەرو گەشـتە بیسـتو پێـنج سـاڵـییەی بەرەوخواچوونم نانووسم، چونکـە نووسـینێکی ئـەوتۆ کـاتو شـوێنیکی تـەرخانکراوی پێویسـتەو، لەقەرەی ئەم چەند لاپەڕەیەدا نیـە، بەڵکو ئەوەی لـێرەدا لە دە(١٠) تەوەری کورتـدا دەینووسـم، تـەنیا بریتیـە لـەو ئەنجامگیـریی (إستنتاج)و پەنـدو دەرسو بەرهەمانەی، کە لەو ماوەو، میانەی ئەو سـەفەرو گەشتانەمـدا، پێیـان گەیشـتوومو وەدەسـتم خسـتوون، لە بواری ژیانی مەعنەوییو لایەنی تەزکیەی نەفسـدا، دیارە تـەنیا ئەو شتانەشم نووسیون، کە لێیان دڵـنیابوومو، دەشگونجێ بگوترێن، هەندێك شتیش، کـە جارێ لـەلام پێنەگەیشـتوون، یاخـود هـەر ناشـێ بگـوترێنو بنووسـرێن، ئـەوە یـان هەرلـێیان دەگـەڕێم، یـان هەڵـیانـدەگرم بـۆ هـەلو دەرفەتێکـی دیکـەی گونجـاوو ڕەخسـاو، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

بەو هیوایەی ئەم بەشە - ئەزموونی تـایبەتی خۆم لـە بـواری تەزکیـەی نەفسـدا - مایـەی سـوودو کەڵـك بـێ، لـەو بـوارەدا بۆ بـراو خوشکانی مسـوڵمانم.

پەناش بەخوا دەگرینو، هانای وەبەر دەبەین، لە چەنگ شەڕو زیانی نەفسـمانو کـارو کـردەوەی بـەدو خراپـمان.

### تەوەری یەكەم:

### هاوەڵی چاك و ژینگە (بیئة)ی پاك، گەورەترین كاریگەرییان هەیە لە تەزكیەبوونی نەفسدا:

بەڵێ ساڵی (١٩٧٦) كە یەكەم ساڵی خوێندنم بوو لە پەیمانگای ئیسلامیی لە شاری سلێمانی، لەسۆنگەی ئەوەوە، كە هەم جەوی[1] پەیمانگاو، هەم بارودۆخی[2] فەرهەنگیی و ئەخلاقیی و مەعنەویی شارەكە بەگشتیی، گوشاری زۆری لەسەر ڕووح و دەروونم هەبوو، منیش كەم تەمەن بووم و سادەو بێ ئەزموون و نەشارەزاش بووم، بۆیە كەوتبوومە قەیران (أزمة)ێكی ئیمانیی و ڕووحیی بێڕەزاوەو، زۆر گرفتارو بەئازاربووم، بەڵام دەستگیربوونم لە چەند هاوەڵ (رفیق)ێكی مسوڵمان و دڵسۆز لەلایەكەوەو، ئاشنایەتیی پەیداكردنم لەگەڵ خەڵكێكی صۆفیی و بەشدارییكردنم لە كۆڕەكانی زیكرو فیكریاندا، هێزو وزەیەكی زۆری بۆ ڕەخساندبووم و، هاوكارێكی چاكم بوو، بۆ خۆڕاگریی و بەرهەڵستیی (مقاومة) چاكترو زیاتر، لەبەردەم گێژەڵووكەو ڕەشەبای ئەو وەزعە نالەبارەی ئەوسادا.

هەربۆیەش ئەهلی تەصەووف ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ التوبة.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! پارێزكاریی لە خوا بكەن و لەگەڵ ڕاستان دابن، كردۆتە دروشم و شیعاری خۆیان.

---

١) ئەوكاتە پەیمانگای ئیسلامیی، كە بە حیساب كانگای پێگەیاندنی كادیرانی ئیسلامیی بوو! كۆمەڵێك كادیری شیوعیی و ماركسیی تێخزێنرابوون، زۆرچالاكانە كاریان دەكردو، خەڵكێكی سادەی زۆریان خستبۆ ژێر ڕكێفی كاریگەریی خۆیانەوە، منیش بە سەختیی لەگەڵیاندا تێكگیرابووم.

(٢) چونكە بەدەگمەن نەبێ، گەنج و خوێندەواری لە ئیسلام تێگەیشتووی تێدانەبوو و... هتد!

هەروەها هەربۆیەش خواناسانی خەڵك پەروەردەكەرو بەرەو خواهێنەر، هەمیشە ڕێرووینیی و ئامۆژگاریی خەڵكیان كردوە، كە شوێن و ژینگەی خراپ و پیس بەجێ بهێڵن و، هەوڵی گەیشتن و كۆچ كردن بەرەو شوێن و دەوروبەری چاك و پاك بدەن، وەك لەو فەرموودەیەدا دەردەكەوێ، كە (بخاري و مسلم) لە (أبي سعيد الخدري) خوای لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی ئەو كابرایەی تێدا دەكات، كە نەوەدو نۆ (٩٩) كەسی بەناهەق كوشتوەو، ویستوویەتی تۆبە بكات و، چۆتە لای گۆشەگیرێك (راهب)ێك و، ئەویش پێی گوتوە، كە ڕێی تۆبەی نیە ! كابراش باباى گۆشەگیری كوشتوەو، كوژراوەكانی بوونەتە سەد (١٠٠)، ئنجا چۆتە لای زانایەك و، ئەویش پێی ڕاگەیاندوە، كە بەڵێ ڕێی تۆبەی هەیەو، دوایش پێی گوتوە: {انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا فَإِنَّ بِهَا أُنَاسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ فَاعْبُدِ اللَّهَ مَعَهُمْ وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ...}[1].

واتە: بچۆ بۆ فلانە ناوچەیەی ئاواو ئاوا، خەڵكێكی لێیە خوای بەرز دەپەرستن، تۆش لەگەڵ ئەواندا خوا بپەرستە، مەگەڕێرەوە شوێنی خۆت، چونكە ناوچەیەكی خراپە.



(١) مُتّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١١١٧٠)، البُخَارِيُّ برقم: (٣٢٨٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧١٨٤).

تەوەری دووەم:

### تەمەن بەزایەنەدان و کۆنترۆڵکردنی ئەندامەکان، بۆ بەکارهێنانیان لە چاکەو پاراستنیان لە خراپە، بەهێزترین دەستەبەرکەر (ضامن)ی نەفس تەزکیە بوون و بەرەو خواچوونە:

بەڵێ هەرکەسێك نەتوانێ خولیاو خەیاڵەکانی دڵو مێشکیو، نیگاو سەرنجەکانی چاویو، وشەو دەربڕینەکانی زمانیو، بیستەنییەکانی (مسموعات)یو، پاروەکانیو، هەنگاوەکانی خۆی، کۆنترۆڵ (ضبط) بکاتو بەکورتیی: نەفسی خۆی بەپەتی شەرع جڵەو بکات، هەرگیز ناتوانێ لەبواری تەزکیەی نەفسیدا هیچ بە هیچ بکات !

هەر بۆ پەندو عبرەت لێوەرگیران دەڵێم: ماوەی ئەو پێنج ساڵە { ٧٥ - ٧٦ تاکو ٧٩ - ٨٠ } کە لە سلێمانی خوێندوومە، واتە لە دووی نێوەندیی، هەتا کۆتایی شەشەمی ئامادەیی، کە لە تافی لاوێتییدا بووم، لە خوا بەزیاد بێت زۆر سەرگەرمی طاعەتو عیبادەت بووم، دەمویست هەموو ساتەکانی ژیانم بە خواپەرستیی بەسەربەرمو، زۆر خۆم لە گوناهان دەپاراستو، سوپاس بۆ خوا لەوبارەوە سەرکەوتووش بووم !

ئەوکات، کە زۆر موتالای کتێبی: (إحياء علوم الدين)ی ئیمام غەززالییم دەکرد، ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت، زۆرسەرگەرمی خۆ مەرزەم کردنو کۆنترۆڵی ئەندامەکانم بوومو، لەسەر گچکەترین وشەو تەعبیری نارێك، یان ڕەفتارو هەڵسوکەوتێکی خراپ، بە وردییو توندیی خۆمم سەرکۆنە دەکردو، چاودێرییو لێپرسینەوەیەکی سەختم خستبووە سەر خۆم، ڕەنگە زۆرجاریش زیادەڕۆییو ڕۆچوون(غلوّ)م هەبووبێ، چونکە کتێبی: (إحياء علوم الدين)یش لەوبارەوە، هەڵەو زیادەڕۆیی تێدایەو، منیش عادەتم وابوو هەرچی فێربووبام، هەوڵی جێبەجێکردن (تطبيق)یم دەدا !

مەگەر چــۆن، دەنــا نەمــدەهێشــت کەلــێنو بۆشـایی (فـراغ) لــە کـاتەکـانمــدا هــەبێو، هەمیشـــەو بــەردەوام ســەرگەرمی زیکـرو موتـالاو پاڕانــەوەو بیـــرکردنەوەو، ســەردانی دۆســتو ئاشــنا تــایبەتییەکـانم بــووم .

بۆیــە جگــە لــە ســالّی یەکــەم، نەمتوانی لە بەشی نێوخـۆیی (قســم داخـلي) بــمو، چــوار ســالّەکەی دیکــە لە حوجرەی مزگــەوتــەکــانــدا شوێنم پەیدا دەکردو، بەتەنیا، یان لەگەلّ یەك دوو ڕەفیق دەمگوزەراندو، بۆ کات بەفیــڕۆ نــەدان چـاییشــم نــەدەخواردەوە، هەروا بە نانێکی سادەش قەنەعــاتم دەکــرد، ئنجــا لـــەبەرئەوەش، کــە ئامــادە نــەبووم دینارێك لە هیچ کەس وەربگرمو، مالّەوەشــمان نەدارو دەستــکـــورت بـــوون، بــۆ کڕینــی کــتێبو کەلو پەلــیــش ئاتــاجی پـــارە دەبـــووم، بەیـــن بەیـــن ڕۆژانــی پێــنج شـــەممەو جومعە یــان بــەس ڕۆژانی جومعـــە، کرێکــارییم دەکــردو، بــەوجۆرە پــارەی مەســرەفو کــتێب کــڕینو... هتــدم دابین دەکــردو، ئێستاش هەندێك لە کتێبەکــانی ئەو ڕۆژگـــارە ســەختــەم هــەر ماون.

دیارە زۆرجاریش لەگەلّ ڕەخنەو گــلەییو توانجو پلاری هەنــدێك لــە ڕەفیقــەکــانمــدا ڕووبــەڕوو دەبوومــەوە ! بەلاّم من کەمتــر حەزم بە قســەو بــاسو مشـــتومڕ دەکـــردو، زیاتر حەزم لە تەنیــاییو کەم تێکەلّیی دەکردو، زۆریــش لــەززەتم لـــەو جـــۆرە ژیـــانەم دەکــرد !

## تەوەری سێیەم:

### بیرکردنەوەو ڕامان و چوونە ئیعتیکافەوە، چەند مەرجێکی بنەڕەتیی سەرگرتن و بەرگرتنی پرۆسەی تەزکیەی نەفسن:

پێم وانیە هیچ کەس بتوانێت بەبێ جاروبار خۆ تەنیاکردنەوە، ڕامانو وردبوونەوەو بیرکردنەوە، لە بواری کار لەخۆکردنو خۆگۆڕینو خۆچاککردندا، هیچ بە هیچ بکات.

هەر بۆیەش خوای کاربەجێ لەگەڵ (ذکر)دا باسی (فکر)و، وێڕای طەواف کردنو سەجدەو ڕکووع بردن، باسی (إعتکاف)ی کردوە ! فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ ... ﴿١٩١﴾ ﴾ آل عمران، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ...وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقرة.

من بۆم دەرکەوتوە، کە هەرچەندە تێکەڵیی لەگەڵ خەڵكو دەوروبەرداو، هەڵسوکەوتو ڕەفتاری شەرعییانە لەگەڵیاندا، هونەرێکەو پێویستیی بە وریایی‌و شارەزایی‌و، چەندان ئەدەبو ڕەوشتی بەرزو پەسند دەکات، هەموو کەس تێیدا سەرکەوتوو نابێتو، بگرە زۆربەی خەڵکی لەسەری قەرزدار دەبنەوە، بەڵام بەڕاستیی بەڕاستیی، خۆ تەنیا کردنەوەو چوونە خەڵوەو ئیعتیکافیشەوە، زۆر قورسەو، کەم کەس دەتوانێ تەحەمولی بکات !

چونکە ئینسان، هەتا هێندە ئیمانەکەی بەهێزو پێز نەبووبێ، کە هەست بە نزیکیی‌و هاودەمی خوای بێوێنە (سبحانە وتعالی)و فریشتە بەڕێزو بێگەردەکانی بکات، ناتوانێ نەك چەند ڕۆژێك، بگرە چەند سەعاتێکیش بە تەنیاو لە شوێنی چۆڵ وخاڵییدا مەدار بکات !

بەڵگەی گرنگیی و بایەخ و پێویستبوونی بیرکردنەوەی تەنیاو خاڵیی و چوونە خەڵوەو ئیعتکافیشەوە، زۆرن و، سەرجەم ئەهلی عیرفان و پسپۆڕانی بواری تەزکیەی نەفس و شارەزایانی ئەخلاق و سولووك لەسەری یەکدەنگن، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم)، مەگەر چۆن، دەنا هەموو ساڵێك بەلای کەمەوە دە(١٠) ڕۆژ چۆتە ئیعتیکافەوە، بەزۆریش دە (١٠) شەوو ڕۆژی کۆتایی مانگی موبارەکی ڕەمەزانی هەڵبژاردوون، وەك لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گێردراوەتەوە: {كَانَ صلى اللّٰه عليه وسلم يَعْتَكِفُ العَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، حَتَّى تَوَفَّاهُ اللّٰهُ تَعَالَى}[١]، بەڵام ئەوەی کە زۆر گرنگەو مەرجی بنەڕەتیی، کاریگەربوونی ئیعتیکاف و ئامانج پێکانیەتی، دوو شتە:

١/ نەبوونی هیچ پاڵنەرو هاندەرێك بۆ چوونە ئیعتیکافەوە، جگە لە خواپەرستیی و ڕازییکردنیی خوا.

٢/ ڕەچاوکردنی سەرجەم مەرج و ئەدەبە شەرعییە ڕواڵەتیی و پەنهانەکانی[٢].

کەواتە:

ئەو کەسانەی، کە بەمەبەستی غەیری بەندایەتیی ئەنجامدان بۆ خواو، ڕازییکردنی، دەچنە خەڵوەو ئیعتیکافەوە، بۆ وێنە: بەمەبستی وەدەستهێنانی حاڵەتێکی یاسادڕ (خارق العادة)، کە لەنێو خەڵکیدا بە کەرامەت ناودەبرێ ! یان بە شێوەو چۆنیەتییەکی هەڵەو ناشەرعیی چۆتە خەڵوەو ئیعتیکافەکەیەوە، وەك ئەوەی، هەندێك لە شوێنکەوتووانی ڕێبازەکانی تەصەووف دەیکەن، بەناوی چلەکێشان (الأربعينيَّة)ەوە، بەڵێ کەسانێك، کە بەو جۆرە هەڵەو ناشەرعییانەو بەو مەبەستە ناتەواوانەوە دەچنە خەڵوەو ئیعتیکافەوە، دوایی نەك هەر ئەنجامێکی ڕووحیی

---

(١) مُتّفَقٌ عَلَيْهِ، رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (٢٤٦٥٧)، البُخَارِيُّ، برقم: (١٩٢٢)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٢٨٤١).

(٢) لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا بەوردیی باسی (إعتكاف)مان کردوە.

ئەوتۆیان دەستگیر نابێ، بگرە زۆر نزیکە تووشی زیانی زۆریش ببن[١]، دەبێ دڵنیابن کە لە کەلێنی هەڵەو ناشەرعیی خۆیانەوە، پێیانەوە دراوەو گەزراون.

لە کۆتایی ئەم باسەدا، دوو تێبینییم ماون:

١- ئینسان ئەگەر لە هەموو هەلومەرجێکدا چوونە ئیعتیکافیشی بۆ هەڵنەسووڕێ، بەڵام بیرکردنەوەو ڕامان (التفکر والتأمل)ی لە هەموو بارودۆخێکدا، هەر بۆ مەیسەر دەبێت.

٢- ئیعتیکاف کە خەڵوەشی[٢] پێدەگوترێ، بە یەکدەنگیی زانایان لە مزگەوتاندا نەبێ دروست نیە، کەواتە ئەوانەی کە لە ئەشکەوت و چیاو چۆڵدا دەچنە خەڵوەوە، دەبێ دڵنیابن، کە بە (إعتکاف)ی شەرعیی بۆیان لەقەڵەم نادرێ و، بەرهەم و سوودە شەرعییەکانی ئیعتیکافیشیان دەستگیر نابن[٣] و، ڕەفتارەکەشیان زیاتر لە هی ڕەبەنە نەصڕانییەکان (الرهبان النصرانیون)ەوە نیزیکە[٤]!

---

(١) خەڵکی وام پێ شك دێ، کە لە ئەنجامی ئەوجۆرە شتانەدا، حاڵەتی عەقڵیی و دەروونیی تێکچووە، یان یەکجاریی شێت بووە، شایانی باسیشە، کە لەکاتی ئەو هەوڵو تێکۆشانە مەعنەوییانە (المجاهدات الحیة)دا، شەیتانەکان زیاتر هەوڵی زیانگەیاندن دەدەن، ئنجا ئەگەر حاڵەتەکە چۆنیەتیی و مەرجە شەرعییەکانی تێدا ڕەچاو نەکرابن و، فریشتەش بەرگریی لە بابای خواپەرست (عابد) ناکەن و، شەیتانەکان زەفەری پێدەبەن!

(٢) (ابن تیمیة) گوتوویەتی: (ماذا یفعل بی أعدائي: نفْیي سیاحةٌ، وسجني خَلْوةٌ، وقَتْلي شهادة)!!

(٣) بەڵام هەموو جۆرە خزمەتکردنێکی ڕووح، دەبێتە هۆی بەهێزکردنی و صافکردنەوەی و پەیدابوونی هەندێك حاڵەتی نائاسایی لە خاوەنەکەیدا !

(٤) هەندێك و بگرە زۆر لە ئەهلی تەصەووف گۆشەگیریی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ئەشکەوتی (حیراء)دا، دەکەنە بەڵگەی خەڵوەو چلە کێشان! بەڵام ئەوە بە بەڵگە ناشێ، چونکە بەر لە وەحیی و پەیام بۆ هاتنی بووە، ئەو زاتە بەرزەش وەك پێغەمبەری خوا (رسول الله) (صلی الله علیه وسلم) سەرمەشقی ئیمەی مسوڵمان و پێشەواو چاوساغمانە: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، نەك وەك (محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب)، بۆیە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الضحی، ئنجا دواییش پێغەمبەری خوا لە مزگەوت و ماڵی خوادا چۆتە (إعتکاف)ەوەو، نەچۆتەوە ئەشکەوت و چیاو چۆڵ!

## تەوەری چوارەم:

### هەر خواپەرستیی و طاعەتێك هەردووك مەرجی بەس بۆ خوابوون و، بەپێی شەرعی خوابوونی تێدا نەبن، نابێتە مایەی تەزکیەو خاوەنەکەی لەسەریشی قەرزدار دەبێتەوە:

بەڵێ، بەبێ هەبوونی هەردووك مەرجی بەس بۆ خوابوون (الإِخلاص لله)و بەگوێرەی شەرعی خوابوون (الإتِّباع لشرع الله) وەك لە باسەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە، خۆ ماندووکردنی ئینسان بێسوودەو، بگرە زیانیشی هەیەو بە نەبوونی هەرکام لەو دوو مەرجە، بابای خواپەرست (عابِد) لەجیاتی پاداشتو بەرهەم، دووچاری سزاو تۆڵەش دەبێتو، بابای ڕێبوار (سالِك) لەجیاتی بەرەو پێشچوونو لەخوا نزیککەوتنەوەو بەرزبوونەوە، بەپێچەوانەوە، هەر بەرەو پاش دەگەڕێتەوەو لە خوا دوور دەکەوێتەوە.

شاعیریش لەوبارەوە گوتوویەتی:

ترجو النجاة ولم تسلُك مسالِكَها

إنَّ السَفينة لا تجري على اليَبَسِ

واتە: بەئومێدی ڕزگاربوونی، بەڵام ڕێگاکەیت نەگرتوە، بێگومان کەشتیی لەسەر وشکانیی ناڕوات !!

ئنجا ئەو ڕاستییەش، کە کردوومانەتە سەرباسو ناوونیشانی ئەم تەوەری چوارەمە، سەرەڕای دەلالەتی چەندان دەقی قورئانو سوننەت، کە تەنیا دەقێکیان بەسە بۆ ئیسپاتی هەر مەسەلەیەك، تێکڕای زاناو پێشەوایانی ئیسلام بەگشتییو، پسپۆڕانی بواری تەزکیە بەتایبەت، لەسەری یەکدەنگنو کۆکنو دەڵێن: بەبێ پابەندیی ڕەها بە قورئانو سوننەتەوە، ئینسان ناتوانێ سالّح بێو بەرەو خوا بچێ ! ئنجا بەڕاستیی سەیریشە، کە ئینسان پێی وابێ دەتوانێو دەلوێ کە بەغەیری ڕاستە شەقامی (شريعة)ی خواو ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەرەکەیدا لە خوا نزیك بێتەوە !! مەگەر خواو

پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو کەس چاکتر نازانن، چۆن چۆنیو بەکویدا بەرەو خوا بچین ؟!!

ئەمەش چەند قسەیەکە ئەهلی تەصەووفو عیرفان لەوبارەوە:

- (ابن البنّا السرقسطي) لە کتێبی (المباحث الأصلية)دا دەبارەی پابەندیی ئەهلی تەصەووف بە قورئانو سوننەتەوە، گوتوویەتی[١]:

فاسْلُكْ طريق القوم تَلْقَ يُمْنَهُ

إذ الكتاب قَيَّدَهُ والسُّنّة

واتە: ڕێگای ئەو کۆمەڵە بگرە لە بەرەکەتی بەهرەمەند دەبی، چونکە پابەندە بە قورئانو سوننەتەوە .

- (شيخ جنيد البغدادي)یش گوتوویەتی[٢]: (علمنا هذا مُقَيّد بالكتاب والسنّة، فمن لم يَسْمع الحديث ويجالس الفقهاء ويأخذ أدبهُ عن المتأدبِّين، أفسَدَ مِنْ اتبعَه).

واتە: ئەم زانستەی ئێمە پەیوەستە بە قورئانو سوننەتەوە، ئنجا هەر کەسێك گوێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕانەگرێو، لەگەڵ شەرعزانان دانیشێو، ئەدەب لە خاوەن ئەدەبانەوە فێر نەبێ، ئەوە شوێنکەوتووەکانی خۆی (لە جیاتی چاککردن) تێکدەدات.

- (سهل بن عبدالله التستري)یش گوتوویەتی[٣]: (بُنيتْ أُصولُنا على ستةِ أشياءَ: كتاب الله، وسنة رسول الله صلى الله عليه وسلم، وأكل الحلال، وكفً الأذى، واجتناب الآثام والتوبة، وأداء الحقوق).

---

(١) بڕوانە: (المباحث الأصلية) کە لە پەڕاوێزی: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)، ج: (١)، ص: (٩٢)، دا چاپ کراوە.

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج: (١)، ص: (٩٣).

(٣) بڕوانە: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم) پەڕاوێزەکەی، ج: (١)، ص: (٩٣).

واتە: بنچینەکانی ئێمە لەسەر شەش شتان بنیات نراون:

١) کتێبی خوا.

٢) ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) .

٣) خواردنی بژیوی حەڵاڵ (و دووریی لە حەرام).

٤) ئازارنەدانی خەڵکی.

٥) خۆپاراستن لە گوناحەکانو تۆبەکردن.

٦) جێبەجێ کردنی مافی خاوەن مافەکان.

ئاشکراشە، کە سێیەمو چوارەمو پێنجەمو شەشەمیش، هەر دەچنەوە نێو قورئانو سوننەتەوە، کەواتە ئەسڵ هەر ئەو دووانەن.

- (أبو القاسم النصر آباذي)یش، لەوبارەوە گوتوویەتی[1]: (أصل التصوف ملازمة الكتاب والسنة وترك الأهواءِ والبدَع).

واتە: بنچینەی تەصەووف پابەندییە بە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)و، وازلێهێنانی بیروبۆچوونی هەڵقولاو لە هەواو ئارەزووەکانیو داهێنراوەکانە.

مەبەستیشم لە هێنانەوەی ئەم قسانە ئەوەیە، کە هیچ کەس وانەزانێ لەڕێی غەیری دیاریکراوی خواو پێغەمبەرەکەیەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگاتە هیچ، شوێنکەوتووانی ڕێبازەکانی عیرفانو تەصەووفیش، بابزانن پێشەواو پێشینەکانیان چۆن بوونو، چی دیکە بە ڕەفتارو ئاکاری ناشەرعییانەو بیدعەتییانەیان، بە زمانی حاڵو کردار، بوختانو تۆمەتی خراپ پاڵ نەدەنە لایانو خۆیانو، ڕێبازو ڕێو شوێنە پاکو شەرعییەکانیشیان سووکو ناشیرینو تۆمەتبار نەکەن!

سەرنج بدە! چۆن زاناو عاریفێکی بۆ تەصەووفی ڕاستەقینە بە پەرۆشی وەك: (ابن البنا السرقسطي) لە ئەهلی تەصەووفی ڕۆژگاری خۆی بێزارو تووڕە بووە، لە چەند دێڕە شیعرێکیدا، پاش خستنە ڕووی ئەسڵو بنچینەکانی تەصەووف، گوتوویەتی:

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

١/ إذا علمتَ كيف كان الحال — والشيخ والتلميذ ثم حالوا
٢/ فاعلم بأن أهل هذا العصر — قد شغلوا بمحدثات الأمر
٣/ إذ أحدثوا بينهم ٱصطلاحا — لم أر للدين به صلاحاً
٤/ وصنفوا بينهم أحكاما — أكثرها كانت لهم حراماً
٥/ وانتهجوا مناهج منكوسةً — وارتكبوا طريقة معكوسة
٦/ كانت إذن موارد شريفة — فاستبدلت مذاهب سخيفة
٧/ قد أُسست على صحيح العقل — وأسُّها الآن بمحض الجهل
٨/ يُدْعى الذي يمشي عليها سالك — وسالكوها اليوم حزب هالك
٩/ بها عاش القوم بخير عيشة — فصيرت بعدهم معيشة
١٠/ كانت تضاهي الكوكب المنيرا — والآن أضحت حائطاً قصيرا
١١/ إذ صار لا يعلم منها إلاً — أكلا ورقصا وغنىً وسُؤْلاً
١٢/ كانت على الإنصاف والنصيحة — فهي على الإسرافٍ والفضيحة
١٣/ تعرف بالخُلُقِ والإيثار — والآن بالحِقْدِ وبالإقتارِ
١٤/ كانت أجَلً غِبطةٍ وخطةٍ — والآن فهي بِدعة وخلطةُ

واتە:

١- ئنجا ئێستا، کە زانیت حاڵو وەزعی تەصەووفو شوێنکەوتووانی چۆن چۆنی بوو، هەم شێخو هەم قوتابی (موريد)، پاشان گۆڕانیان بەسەرداهات.

٢- ئێستا بۆئەوەی لە حاڵو باڵی ئەهلی تەصەووفی ئەم ڕۆژگارە ئاگاداربی، بزانە، کە لە ڕاستەڕێ لایانداوەو، بە شتی داهێنراوو پەیداکراو لە ئاییندا سەرگەرم کراونو خافڵێنراون !

٣- چونکە چەند شتێکیان لەنێوان خۆیاندا (و لەبن پەردەی تەصەووفدا) داهێناوە، کە من هیچ جۆرە بەرژەوەندییو خێرێکی ئایینی تێدا نابینم !

٤- کۆمەڵێك ڕێورەسمیان لە بەینی خۆیاندا داهێناوەو ڕێکخستوە، کە لەوەوپێش ئەو شتانەیان لێ قەدەغە کرابوو.

٥- بەدوای چەند بەرنامەیەکی سەرەوبن و بەراوەژووکەوتوون و، ملی ڕێبازێکی پێچەوانەیان لەگەڵ تەصەووفدا گرتوە !
٦- کەواتە ئەگەر کاتی خۆی تەصەووف وەك چەند سەرچاوەیەکی ڕوون و سازگاری پاك و شەریف بوو، ئێستا بۆ چەند ڕێچکەیەکی پڕوپووچ گۆڕاوە!
٧- کاتی خۆی لەسەر بناغەی عەقڵی ساغ بنیات نرابوو، بەڵام ئێستا بنچینەکەی نەفامیی ڕووت و بێ خەڵتەیە !
٨- کاتی خۆی بەوکەسەی، کە لە سەری دەڕوات دەگوترا (ڕێبوار)، بەڵام ئێستا ڕێبوارو پەیڕەوانی بە کۆمەڵێکی فەوتاو دادەنرێن !
٩- کاتی خۆی ئەهلی تەصەووف ژیانێکی بەختەوەرانەیان پێوە گوزەراند، بەڵام ئێستاو دوای ئەوان (پێشەوا ڕەسەنانە) کراوەتە هۆکاری ژیان و گوزەران !
١٠- کاتی خۆی لەگەڵ ئەستێرەی پڕشنگدار دەچووە تەرازووەوە، بەڵام ئێستا وەك دیوارێکی نزمی لێ هاتۆتەوە !
١١- چونکە وای لێهاتوە هیچی لەبارەوە نازانرێ و، هیچی تێدابەدی ناکرێ، جگە لە خواردن و خواردنەوەو هەڵپەڕین و سەماکردن و دەوڵەمەندیی و سواڵ کردن !!
١٢- کاتی خۆی لەسەر ویژدان و ئاگا لە یەکدی بوون و بۆ یەکدی دڵسۆزبوون بوو، بەڵام ئێستا لەسەر زیادەڕۆیی کردن و عەیبدارییە ! (بەهۆی تەماع و پارەو پوول پەزمەندەکردنەوە).
١٣- بە ڕەوشتی بەرزو خەڵك بەسەرخۆدا هەڵبژاردن ناسرابوو، کەچی ئێستا مۆرکی بوغزو کینەو ڕژدیی و چرووکیی پێوەنراوە.

کاتی خۆی مایەی خۆزگە پێخوازران و باشترین نەخشەو ڕێبازبوو، کەچی ئێستا بۆتە شتێکی داهێنراوو تێکەڵ و پێکەڵ !!

## تەوەری پێنجەم:

**هەرچەندە هەبوونی ڕێپێشاندەرو چاوساغ زۆر گرنگەو، ڕێگا ئاسان و کورت دەکاتەوە، بەڵام بەخشش و هیدایەتی خوا زۆرو فراوانەو، قوڕئان و سوننەتیش بۆ ئەهلی خۆیان، هەموو ئامانجەکان دێننەدی و پەکی ناخەن:**(١)

(١) لێرەدا بەپەسندی دەزانم هەندێك قسەی زۆر نەستەقو بەجێ لە (ابن الجوزي) بخوازمەوە کە (محمد بن مفلح المقدسي) لە کتێبی: (الآداب الشرعية والحقوق المرعية)دا لێیەوە نەقڵی کردوون، گوتوویەتی:

(زۆر کەس لەکاتی بیستنی ئامۆژگارییو گوێ بیستبوونی باس‌وخواسی دنیا بەکەمگرانو صاڵحاندا، حاڵەتێکی بێدارییان بۆ پەیدا دەبێو، یەکسەر ڕاست دەبنەوەو بە عەزیمەتەوە ڕێگای دنیا بەکەمگرتنو چاوەڕێکردنی مردنێ دەگرنەبەرێ... ئنجا هەیانە بەدوای گۆشەگیرێکی نەزان دەکەوێ، یان دەکەوێتە شوێنی ڕێڕوونییەکانی کتێبی هەندێك لەدنیا بەکەمگرەکانو، کە دەبینێ باسی کەمکردنەوەی خواردنو خواردنەوەو وازلێهێنانی ئارەزووەکانو، چەند شتێکی دیکەی تێدایە، کە کابرا بە هۆی نەشارەزاییەوە لە شەریعەتو سوننەتدا دایناون، ئەویش دەست دەکا بە خۆ برسییکردنو ڕۆژووگرتنو شەونخوونییو، لەسەر خۆراکی خراپ دەوام دەکات، هەتا گەدەو ڕیخۆڵەکانی وشك دەبنەوەو جەرگو هەناوو میزاجو، بگرە هەندێك جار مێشکیشی تێکدەچێو، لەسۆنگەی ئەوەشەوە جۆرێك لە خەڵك بێزاربوونو نامۆیی بۆ دروست دەبێ، واش دەزانێ ئەوە بریتیە لە حاڵەتێکی ئونس‌و دڵ بە خوا خۆش بوونو، ئنجا چونکە واگومان دەبات، کە گەیشتۆتە ئامانجو مەنزڵ، پشت لە زانایان دەکات! ئنجا لە ئاکامی ئەو جۆرە شتانەداو بەهۆی بێهێزبوونیەوە، عیبادەتیشی بۆ ناکرێو، لەبەر چارەسەری دەردو نەخۆشییەکانی، ناپەرژێتە سەر هیچ !

ئنجا لەڕاستیدا گەلێك کەس لە خەڵکی دڵپاكو نیاز پاك، لە ئەنجامی نەشارەزایی لە شەرع لەوبوارەدا، گیرۆدەی سەرگەردانیبوونو، هەیانبووە هەر زوو بە دەردو نەخۆشییەکانییەوە مردووەو سەری ناوەتەوەو، هەشیان بووە بەرەو دوا گەڕاوەتەوەو، هەشیان بووە هەروا لە سەرگەردانییدا ماوەتەوە، بەڵام زانایانی تێگەیشتوو، ئەوە بێگومان بەپێی زانستو حیکمەت بەڕێوەچوونو ڕەفتاریان کردوە.

ئنجا زۆر وریابە لە ڕێبازی ڕاستو سەلامەت لانــەدەی‌و، بکەویــە شــوێن صــۆفییو گۆشەگیــرە نەفامەکان، کە بە حیسابی خۆیان ژیانی دنیــایان فەرامۆش کــردوە، کــە هەیانــە، هــەر بەڕاســتیی دنیای فەرامۆش کردوەو، هەشیانە هێنــدە نەزانن، کاتێك زانایەك ببینــن، کــە تۆزێــك ئاگــای لــە هەق‌و مافی نەفس‌و جەستەی خۆی بێت، بۆ وێنە بەرگی لە لۆکــە (کــتان) چــنراو لەبــەر بکــات!! ڕەخنەی لــێدەگرن‌و دەڵێن: ئەمە بە زانیارییەکەی ئیش ناکات! ئەگەر ببینن ســواری ئەســپ بــووە، دەڵــێن: ئەوە زۆردارە! جا زۆر وریابە نەچی دڵگەرم بوون‌و بێــدارییەکی کــاتیی بازێکــت پێبــدات بەرەو ئامانج‌و  سەرەنجام بخــلیســکێی، یان ئەگەر دەســتیشــت لە شــتێك گیــربێ، ببێتــە مایــەی لە بەینچوون‌و بێزاربوونــت، یــان بــە پێچــەوانەوە: هیچــت بــۆ بــەهیچ نــەکرێ‌و بــەرەو پاشــیــش بگەڕێیتەوە! بەڵــکو بەدوای چرای زانســت بکەوە، ئەگەر هێندەش شارەزا نەبووی بەدوای زانایەکــی دامــەزراو بکەوە، ئاگاداری جەستەت بە، وەك چۆن ئاگاداری وڵاخی ســوارییت دەکەی، با مەبەست‌و هیوات هەر ڕاستــکردنەوەو چاککردنی ڕەوشــت‌و ئاکــارت بێ‌و، گرنگ ئەوەیــە مەبەســت‌و نیــازت ڕاست‌و ساغ بێت، ئەگەرنا ئەزیەتــدانی جەســتە، هیچ نیەو خۆی لە خــۆیدا ئامانج نیە...، دڵــنیاو مسۆگەریش بە، کە ڕێبــاز تەنیا ڕێبــازی پێغەمبــەری خوایە (صلی الله علیه وسلم).

... سەرنج نادەیە زاهیدەکانی ڕۆژگاری ئێمە - مەگەر کەسانێك، کە خوا بە هۆی پابەندییــان بە ســــوننەتەوە پاراســتوونی - چــۆن زۆرداران‌و ئــەهلی دنیــا لەگەڵــیــان تێکەڵــن‌و، مەگــەر جــارجــارێك‌و بە سەری زمان، ئەگەرنا هیچ گــلەییەکــیان لــێ ناکەن، ســەبارەت بە هەڵەو ســتەم‌و ناشەرعییەکــانیان! ئەمانە لەکوێ‌و (سفیان الثوري) لەکــوێ، کــە هــەر کەسێك قســەی لەگــەڵ زۆردارێکــیش دا کردبایە، نەیدەدوانــد؟! ئەگــەر بــە صــۆفیی و (١) زاهیــدەکانی ڕۆژگــاری ئێمــە بگوترێ: بچن لە بازاڕ شتێك بکڕن، بۆ پاراستنی پلە (٢)و پایەی خۆیان، زۆریان لەسەر دڵ قورسە، وەك نــەزانن کــە پێغەمبــەر (صــلی الله علیــە وســلم) بۆخــۆی کەلــوپەلــی لــە بــازار کڕیــوەو هەڵــیشیگرتوە!! ئەگەر بە صــۆفییو زاهیدەکانی ئەم ڕۆژگارەمان بگوترێ: پارووێکمان لەگەڵ بخۆن، ئەوە لە سۆنگەی ئەوەوە، کە خەڵکی پێیان وایە هەمیشە بەڕۆژوون‌و بۆ ئەوەی لەبەرچاویان نەکــەون — ناخــۆن‌و — مەترســییــان هەیە! ئنجا ئەمانە لە کوێ‌و (معروف الکرخي) لەکوێ، کە ڕۆژێکیــان بەڕۆژوو بوو، بەڵام گوێی لە ئاوگێڕ(ساقي)ێك بوو دەیگوت: ڕەحمەتی خــوا لــەو کەســە بێــت، کــە دەخواتەوە، ئەویش ئاوی خواردەوە، ئنجا کە پێی گوترا: ئەرێ بەڕۆژوو نەبووی؟! گوتی با: بەڵام بــە ئومێدی دووعایەکە بووم - بۆم گیــرابێ - !!

بە خــوا لە قیامەتێ جگە لە ئیخلاص، هیچ شتێك نامێنێتەوە، پێــش قیامەتیش جگــە لە ناوی بۆ خــوا ســاغــبووەوان (مخلصين) نــاوی کــەس نامێنــێ ... بــۆ خــاتری خــوا برایــان ئامۆژگــارییو

ئەمیش یەکێکە لەو ڕاستییە هەرە گەورەو بەرزانەی کە لەمیانەی سەفەرو گەشتی تەنیایانەی پڕ هەورازو نشێوی بەرەو خوا چووندا، وەك خۆری درەوشاوە لەلام ڕوونو ئاشکرا بووە.

ئنجا دیارە هیچکەس نکوولّیی لەو ڕاستییە ناکات، کە بێگومان هەبوونی ڕێ نیشاندەری تەواو (المرشد الكامل) بۆ هەموو کەسێك دەبێتە مایەی ڕێ ئاسانکردنو کورتکردنەوە، بەلاّم وێڕای ئەم ڕاستییە، دەبێ ئەوەش بزانرێ، کە وەك چۆن خوای کاربەجێ، ئەوشتە ماددییانەی پێداویستیی گشتیی خەلّکنو هیچ کەس لێیان بێنیاز نیە، وەك: هەواو ئاوو ڕووناکییو خواردنو پۆشاك، زۆر ئاسانی کردوونو، ئەوەندە بە فراوانیی خولّقاندوونی، کە هەموو کەس دەستی بیانگاتێ ! هیدایەتو ڕێڕوونیی خۆیشی، کە لە ئاوو هەواو ڕووناکییو تیشکی خۆر بۆ ڕووحو دەروونی ئینسان پێویستترە، والێکردوە، کە هەموو ئینسانێك کە بیەوێ، بتوانێ دەستی بگەیەنێتێو لێی بەهرەمەندببێ! بۆیەش ئەم ڕاستییە ئاوا بە داکۆکییو جەخت لەسەرکردنەوە، دەخەمە ڕوو، چونکە زۆرێك لە شوێنکەوتوانی ڕێبازەکانی تەصەووف، گومانیان وایە، کە لە ڕێچکەو دەروازەی نەك تەصەووفیش بەگشتیی، بەلّکو ڕێبازو

---

دلّسۆزیی بەندە وەربگرنو لە ناخو دەروونتانەوە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بە جۆرێك، کە هەستتان پێ نەکرێ ئەهلی ئەو بازاڕەن ...

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نە وەك زاهیدەکان بەتەنیا سەرگەرمی گۆشەگیریی و نائومێدیی لە دنیا بوو، نە بە تەنیاش سەرگەرمی گرنگییو بایەخدان بە ژیانی دنیا بوو، بەلاّم حالّەتێکی تێرو تەواو کۆکەرەوەی هەبوو، بۆ سەرجەم خووڕەوشتە بەرزو چاکەکان.

ئنجا - کورتەی قسان - زانیاریی شەرعیی بناغەی هەموو خێرو چاکەیەکەو، کانگاو سەرچاوەکەیشی ڕەوشتو ئاکاری پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم).(٣)

---

١- وشەی (صۆفیی) من زیادم کرد، چونکە ئەو کاتە وشەی (صۆفییو زاهید) هاووتا(مترادف) بوون.

٢- مەبەست پلەو پایەو (جاه )ی مەعنەوییی لای خەلّکی عەوامە، کە صۆفییەکان بە حالّییکردنیان بەوەی ئەهلی دنیاو بازاڕ نین، لە دلّیاندا پەیدایان کردوە.

٣- بڕوانە: (الآداب الشرعية)،ج: (٢)، ص: (٣٧١ تا ٣٧٤).

شـێخەکـەی ئەوانەوە نەبێ، هیچ کەس دەستی لە هیدایـەتی تـەواو گیـر نابـێ‌و، بـۆی نالـوێ تەزکیەی نەفس وەدەست بێنێ‌و، بەڕەی خۆی لە ئاوێ دەربهێنێ ! بەڵام لەڕاستییدا وەك پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بەوهـاوەڵـەی، کە گوتی: {أَللّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا، وَلاَ تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا}، واتە: ئەی خوایە! بەزەییت بە من و بە موحەممـەددا بـێ و لەگـەڵ ئێمەدا، بەزەییت بەکەسدا نەیـەت! فـەرمووی: {لَقَدْ حَجَّرْت وَاسِعًا}، واتـە: بەڕاسـتیی شتێکـــی زۆر فراوانـــت (کـــە ڕەحـــمی خـــوایە) تەســـك کـــردەوە!))[١]، بەڵـــێ ئـــەو مســـوڵمـانانەش، ڕەحمەت‌و هیـدایەت‌و بەخششـی خوایان - کە بەشـی هـەموو شـتێك دەکـات - زۆر گـچکـەو تەسـك کردۆتـەوە !

ئاخر مادام خوای زانای ئاشکراو پەنهان، بۆخۆی بفەرموێ: کـە قورئـان هـیدایـــەتی تەواوی بۆ هـەموو کەسـێك‌و هـەموو حـاڵەتێك تێدایە، کە بێگومـان سـوننەتیش هـەر شەرح‌و لـێکـدانەوەی ویە: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ﴿٩﴾ ﴾ الإسـراء، و ﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ... ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل، مادام خوا گـفت‌و بەڵـێنی داوە، کە هەرکەسـێك بەڕاسـت‌و سـاغیی بـەرەو ڕووی بچـێ، بەدەمیەوە دێـت‌و، دەسـتی دەگـرێ‌و ڕێـی ڕاسـتی پێشـان دەدات‌و پشـتی بەرنـــــادات: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنکبوت، بەڵـێ مـادام وابـێ، هیـچ کـەس بۆی نیە هەر لەخـۆوەو، بەبێ بەڵـگەیەکـی شەرعیی، لافی ئەوە لـێبدات، کە هیچ کەس بەبێ شێخ‌و ڕێنماییکار(مرشد) پێـناگـات !

بەڵـــکو قســـەی ڕاسـت ئەوەیـە، کـە شـێخ‌و چاوسـاغ، ئەگـەر هـەر نـاو نـەبێ‌و نێـوەڕۆکـیشـی هـەبێ، دەتوانێ کارئاسـانیی زۆر بۆ ئینسـان بکـات‌و، گرێـی وای بـۆ بکاتەوەو گرفتی وای بۆ چارەسەر بکات، کـە ئەگـەر خـۆی بەتـەنیا خـەریکی بووایـە، هەربۆی نەدەکرا، یان تەمەنێکی زۆری پێوە بـەڕێ دەکـرد! بـەڵام ڕاسـتیـش نیـە، کـە

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٧٢٥٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٦٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٨٠)، وابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٨٦٤)، وَغَيرهُم.

ئینسـان بەبێ ڕابـەرو شێخ، هیچی بۆ نەکرێ‌و، داری بۆ لەسـەر بـەرد دانـەنرێ، بـەڵکو هەرکەسە بەپێی ساغـبوونەوە (إخلاص)ی‌و خۆمانـدووکردنی لەسـەر بناغـەی شـەرع، بەرهەمی دەست دەکەوێ‌و پەکی ناکەوێ، بـەڵام بەتەئکیـد، ئەگـەر بیـەوێ بـەرەو پلـەو پایەکانی دینداریی‌و خواپەرستیی‌و ئیحسـان، سـەربکەوێ، مەگـەر وەك ڕیزپـەڕێك خـوا لوتفـێکـی تایبەتیی لەگەڵ بکات، ئەگەرنا زۆر زەحمەت‌و دەگمەنـە، بـەبێ چاوسـاغ‌و مامۆسـتا ئەو مرادەی حاسـڵ بکـات، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی قورئـان‌و سـوننەت بـەس (کافـي) نین بۆ هیدایەت !! ئاخر لـەدوای وان کـوا هیـدایەت ؟!! بەڵـکو لـە سـۆنگەی ئەوەوە، کە ناتوانێ وەك پێویسـت بەهرەیـان لـێ وەربگـرێ‌و بەتەواویـی لـێیـان تـێ بگـات !

لێرەدا بەپەسندی دەزانم، کە وەك ڕاستییەك‌و، بەرهەمی ئەزموونگەلـی تـاڵ‌و تفـت‌و جـۆراو جـۆرو درێژی خۆم لەوبـارەوە ئەم قسـەیە تۆمار بکـەم:

هەر لـەوکـاتەوە، کە بە لوتفـی خـوا بێـدارو وشیار بوومەوە، کەوتمە گەڕان‌و پشکنین بەدوای شـێخ‌و ڕێپیشـاندەرێکی تینوێتـی شـکێن‌و گـرێ دەروون دامـرکێن‌و، ئۆخـژن‌و فەرامۆشـیی هێنـەدا، بـەڵام ڕاسـتییەکەی نـەك هـەر لـە کوردستانـدا - بـە هـەموو پارچەکـانیەوە — بەڵـکو لە هیچ کوێـی دیکەش لـێم هەڵـنەکەوت‌و دەستگیـرم نەبوو، دیارە هەرگیز ناڵێم نەبوو، بەڵـکو دەڵێم: دەسـتگیـرم نەبوو، چونکـە هیچ کـاتێك سـەر زەوی لەوجـۆرە کەسـانە خاڵیی نـابـێ.

هەڵبـەتە بڕە سوودو کەڵـکێکم وەرگرت لە دیـدارو سـەردان‌و هـاموشـۆی هەنـدێ کەسـدا، کە بەحـیسـاب لـەوبوارەدا پسـپۆڕ[1] بـوون، بـەڵام بەتەئکـید زۆر لـەوە

---

(١) یەکـێك لەوانە کە لە ساڵی (١٩٧٩ز)دا بەدیداری شادبووم‌و، سوودو کەڵـکی ئەخلاقیی‌و ڕووحیـیم لـێ وەرگرت (شیخ ناظم العاصي) بوو، کە سەر بە (الـطريقة النبهانية) بوو لە دێی (السبعة)ی سەر بە قـەزای (دووز)، سێ شەو لە خزمەتیدا مامەوە، نـموونەی عیبـادەت‌و ڕەوشت بـەرزیی‌و ئازایـەتیی‌و جورئـەت‌و جوامێریی بوو، بە دەسیسـەی ڕژێمی بەعسـی عەفلەقـیی دەرمانـداوکراو بـە ژەهـر کـوژرا، خـوا بـە شەهیدی وەرگرتـبێ، پلەو پایەی بەرزبکـاتەوە.

شـایانی باسـە هەنـدێ لـەو شـێخانەش، کـە لـەو سـەرو حـەدەدا دەچـوومە لایـان بـۆ بینـین‌و هەڵسـەنگـاندنیان، بەوە لەبەرچاوم دەبێزران، کە تەماع‌و دنیاویستیی‌و بێئاگـایی لە قورئان‌و سـوننەت

کـەمتـر بوو، کـە ئامـانجی بەندە بهـێنـێتـە دی !

دیارە لە گەرمـەی ئـەو هـەوڵو گـەڕانو پشـکـنینانەشـدا، بـەردەوام لـە خزمـەتی کـەلامی خـواو سـوننەتی پێغەمبەری پێشـەوادا (صلى الله عليه وسلم) هــەر خـەریك بوومو، بـێ پسـانەوەش سەرگەرمی موتاڵاو تێفکرینی بەرهەمو کەلـەپووری پێشـەوایان بووم، بەتایبـەتی، هـی ئەهلــی تەفسـیـرو ئەهلـی حـەدیسو پسـپۆڕانی بـواری تەزکـیە، هەتـا سەرەنجام چەند ساڵـێك لەمەوبـەر، سـاڵ بۆ سـاڵیش زیـاترو چاکتـر دڵنیـاو مسـۆگـەر بووم، کـە ڕێگا تەنیـا یەك ڕێگـایە، ئەویـش :

خوێنـدنو تێگەیشـتنو تەفاعـول لەگەڵـکردنی کـتێبی خوایـەو، موو بە موو گـرتنو جێبەجێـکردنی ڕێبـازی پێغەمبەری خوایـە (صلى الله عليه وسلم).

خواش پاداشـتی هـەموو ئەو کەسـانە بداتەوە، کـە ئەگـەر بـە وشەیەکـیش بـووە، سـوودێکـیان پـێ گـەیانـدووم.



---

لە خۆیـانـداو، لاساییکردنەوەی کوێرانەو شیـرکو بیدعەتی، وەك هـاوارکردنە شێخو پیــرو طـەریقـەتو، بەپێوەو دەست لەسەر سنگ وەستانو...هتدم، لە صۆفییو دەروێشەکانیاندا دەبینی!!

**تەوەری شەشەم:**

**هەرچەندە جۆرەکانی خواپەرستیی و، ئەرکە شەرعییەکان هەموویان لە تەزکیەکردنی نەفسدا کاریگەریی خۆیان هەیە، بەڵام هەرکەسەش لە شتێك، یان چەند شتێکدا بەهرەمەندتر دەبێ:**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: بڵێ: هەرکەسە بەپێی ڕێبازی خۆی (یان بەگوێرەی سروشتی خۆی) کاردەکات، ئنجا هەر پەروەردگارت بەو کەسە زاناترە، کە ڕێی ڕاستتری گرتووە.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {اعْمَلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ...}[1].

واتە: کار بکەن، هەر کەسە بۆ ئەوە ئاسان دەکرێ، کە بۆی دروستکراوە.

بەڵێ، هەرچەندە هەرکام لە نوێژ بەرپاکردنو، زەکاتدانو، ڕۆژووگرتنو، حەج وعومرەکردنو، فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەکردنو، جەنگو جیهادو، بانگەواز... هتد، ئەرکی سەرشانی سەرجەم مسوڵمانانن، بەڵام خوای کاربەجێ، تواناو وزەو ئامادەییەکان (إستعدادات)ی ئینسانەکانی جیاجیاو جۆراوجۆر بەسەریاندا دابەشکردوون، بۆ ئەوەی بە هەموانیان بتوانن کاروبارەکانی کۆمەڵگا ئەنجام بدەن.

ئنجا لە بوارەکانی تەزکیەی نەفسییشدا، هەیە خوا زیاتر بەهۆی زیکرو ویردو پاڕانەوەوە، پێی دەبەخشێو، هەشە زیاتر بەهۆی بانگەوازکردنو بڵاوکردنەوەی زانستو، هەشە لە ڕێی کاسبیی حەڵاڵو ماڵو سامان بەخشینو، خێرو چاکە کردنەوەو،

(١) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (٦٢١)، وَالبُخَارِيُّ، برقم: (٤٦٦٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٠٣) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ.

هەشە زیاتر بەهۆی بەرگریی لە ئیسلامو مسوڵمانانو جەنگو جیهادکرنەوەو، هەیە زیاتر بەهۆی شەونوێژەوەو، هەیە پتر لەڕێی ڕۆژووگرتنی سوننەتەوەو ...هتد.

من خۆم خوا لە کەرەمو بەخششی خۆی بۆمان زیاتر بکات، پاش لە خزمەت قورئانو سوننەتدابوونم، بەفێربوونو فێرکردن (تعلُّماً وتَعْليماً)ەوە، بەهرەیەکی زۆرم لە نوێژ بەرپاکردن وەرگرتوە، بەتایبەت لە خوێندنو تێوە ڕامانی سوورەتی (الفاتحة)، هەروەها گەڕانەوە (توبة)شم زۆر لە فریا هاتوەو، ستایش بۆ خوا زۆرم بەهرە لێ وەرگرتوە، چێژتنی ئازارو نارەحەتیی لە بواری بانگەوازو کۆچو جیهاددا، بەتایبەت لەلایەن مسوڵمانانی لاروخوارو نالەبارەوە، پێم وایە - بەپێچەوانەی حەزو ویستی ناحەزانەوە - کەڵکی زۆری پێگەیاندووم، زۆر نهێنیی دینو ژینی بۆ دەرخستووم، گەلێك ڕاستیی گەورەگەورەی تێگەیاندووم !!

کەواتە:

هەرکەس دەبێ خۆی بناسێو، سەرنج بدات داخۆ لە چیو لە چیدا، خوا تواناو بەهرەی زیاترو چاکتری پێداوە، خەریکی ئەوەیان بێتو وزەو توانای خۆی لەوبوارەدا بەکاربێنێ، چونکە وەك (علي بن أبي طالب) (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: (قيمةُ الـمَرْءِ مايُحْسِنُهُ) نرخی ئینسان لەو شتەدایە کە تێیدا کارامەو پسپۆڕە.

دیارە ئینسانی واش هەیە، کە خوا کۆمەڵێك تواناو بەهرەی زۆری پێ بەخشیون، (ذلك فضل الله يؤتيه مَنْ يشاء).

**تەوەری حەوتەم:**

**وەك بەهۆی سەختیی و دژوارییەكانی مەیدانی كاری ئیسلامییەوە، بەتایبەت كۆچكردن و جەنگ و جیهاد، ئینسان لەبێژینگ دەدرێ و تەزكیە دەبێ، بە هیچ شتێكی دی هێندە تەزكیە نابێ:**

چونكە بێگومان، ئینسان هەتا زیاتر بەندایەتیی (عبودیة) لەخۆیدا بهێنێتەدی بۆ خوای بەرزو مەزنو بێوێنە، دیارە زیاترو چاكتر لێی نزیك دەبێتەوەو، هەتا زیاتریش لێی نزیك بێتەوە، بەتەئكید باشتر نەفسی تەزكیە دەبێت، ئنجا ئەوەندەی ئینسان لە گەرمەو جەنگەی ئێشو ژانو میحنەتو گرفتاریی و دەردەسەرییەكانی كۆچو كۆچبارو دەربەدەریی و جەنگو جیهادو بەرنگارییدا، ملكەچیی و پابەندیی و لێبڕان (تجرّد)و یەكلابوونەوەی بۆ خوا (الإخلاص لله)ی تێدا دێتەدی، مەگەر چۆن، دەنا لە هیچ جۆرە خواپەرستییەكی دیكەدا ئاوا نایەتە دی.

ئاخر پێم ناڵێی: لەو كەسە بەندە(عَبْد) ترو یەكلابووەوە تر بۆ خوا، كێیە، كە لەپێناوی خواو چەسپاندنی بەرنامەكەیدا، چاوپۆشیی لە خۆی و لە هەرچی هەیەتی كردوەو، سەرو ماڵی خستۆتە سەربەری دەستو، بە كردەوە ئیسپاتی كردوە، كە خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەرنامەی خوای، لە خۆی و نیشتمانی و ماڵو حاڵی و خاوو خێزانی و خزمو دۆستو ئاشناو دەرو دراوسێی، خۆشتر دەوێ ؟!!

سەرنج بدە! چۆن خوای دادگەر، زۆر ڕاشكاوانە داوەریی (قضاء)ی لەو مەسەلەیەدا كردوەو، طاعەتی جەنگو جیهادو فیداكاریی، لە هەموو طاعەتێكی دیكە بە چاكتر داناوەو، پلەو پایەی موجاهیدو جەنگاوەرانیشی، لە هی خەڵكی دیكە، بە بەرزتر لەقەڵەم داوە:

﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟

وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَرِضۡوَٰنٖ وَجَنَّٰتٖ لَّهُمۡ فِيهَا نَعِيمٞ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٢٢﴾﴾ التوبة.

واتە: ئایا ئاودان بە حاجییانو ئاوەدانکردنەوەو خزمەتی مزگەوتی حەرامتان، وەك (کردەوەی) کەسێك دانـاوە، کە ئیمانی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناوەو، لەڕێی خوادا جیهادی کردوە؟! لەلای خوا یەکسان نینو، خواش ڕێڕوونیی کۆمەڵی ستەمکار ناکات. ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کۆچیان کردوەو، لەڕێی خوادا بە سامانو گیانیان جیهادیان کردوە، پلەیان لەلای خوا مەزنترە، هەر ئەوانەن سەرفراز، پەروەردگاریان موژدەی بەزەییەك لەخۆیەوە ڕەزامەندییو باخانیان پێ دەدات، کە نازو نیعمەتی بەردەوامو نەبڕاوەیان تێدایە. بە هەمیشە تێیان دادەمێننەوە، بێگومان خوا پاداشتی مەزنی لەلایە.

ئنجا ئەگەر سەرنجی ژیانو بەسەرهاتی هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا بدەین، خوا لێیان ڕازیبێ، لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئاندا، دەبینین ئەوەندەی لە گەرمەی جەنگەکانی بەدرو ئوحودو ئەحزابو حونەینو تەبوكو ڕووداوو کارەساتەکانیاندا، پاكو پوختەو پاڵاوتە بوونو، لە تەتەڵەو بێژینگ دراون، بە هیچ شتێکی دیکەو لە هیچ مەیدانێکی دیکەدا، ئاوا وەك گۆشتی سەرچەپەرێ نەکەوتوونە گۆڕێو، پەییان بە نەخۆشییو دەردەکانیانو، خاڵە لاوازەکانی خۆیان نەبردوە !

بەڵێ، بەڕاستیی هیجرەتو جیهاد لەڕێی خوادا، کاریگەریترینو چاکترین گۆڕەپانی ئینسان تێدا پەروەردە بوونو، نەفس تێدا تەزکیە بوونن، هەربۆیەش پێغەمبەر خوا (صلى الله عليه وسلم) جەنگو جیهادی بە لووتکەی هەرەبەرزی ئیسلام داناوە: {وذِروَةُ سنامِهِ الجهاد (في سبيل الله)}[1]. خوای پەروەردگاریش بە

(١) ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

{رأس الأمر: الإسلام، وعمودُه: الصلاة، وذروة سنامه الجهاد}. أخرجه الترمذي: ٢٦١٦، والنسائي في الكبرى: ١١٣٩٤، وابن ماجه: ٣٩٧٣، والطبراني في الكبير: ٢٦٦، وعبدالرزاق: ٢٠٣٠٣، وعبد بن حميد: ١١٢.

پالـێوەرو لەبێژینگـــدەری نـاونـــاوە: ﴿ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ ۚ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ آل عمران.

بەڵـێ، کـۆچـکردنو جیهـاد، هۆی دەرکـەوتنی ئیمـــانو، هەڵـــبژاردنی شـــەهیدانو پاکــبوونەوەو، لە تەتەڵــەو بێژینگـــدرانی موجاهیـدانو، خەفـەبوونی کـوفرو بێـهــێزو پێـزبوونی کـافرانن .

بـەڵام: بەمەرجی بەس بۆ خـوا بوونو لەڕێـی خـــوادا بـوونو، بـەپێی شـەرعی خـوا بوونو، بەگوێرەی قورئانو سوننەت پەروەردەبوونی موجاهیدانو جەنگـاوەران، لەپێشـەوە سەرکردایەتی(قیـادة) و ئنجا بنکە(قاعدة)شـیـان.

ئەگـەرنا، ناوی بـێ نێـوەڕۆكو شـیعاری بـێ کـردار، هـیچ نیـەو هیچـیشـــی لـــێ پەیـدا نابـێ.



### تەوەری هەشتەم:

### یادی مەرگ و گۆڕو بەرزەخ و قیامەت، هۆکارێکی گەورەی تەزکیە بوونە:

ئەمیش ڕاستییەکە، سەرجەم ئەهلی دڵ لەسەری ڕێککەوتوونە، چونکە مادام خۆشویستنی ژیانی دنیاو دڵ پێ بەستنیو گوریس لەبن ڕاخستنی، عادەتو نیشانەی خەڵکی کافرو لاڕێو دنیا پەرست بێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَـٰتِنَا غَـٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾﴾ یونس.

واتە: بێگومان ئەوکەسانەی، بەئومێدی دیداری ئێمەنینو، ژیانی دنیایان پەسند کردوەو، دڵیان پێیەوە هۆگر بووە، ئەوانەش، کە لە ئایەتەکانمان بێ ئاگان. ئەوانە جێگایان ئاگرە بەهۆی ئەو کردەوانەوە، کە وە دەستیان هێناون.

دیارە ژیانو گوزەرانی دنیا بەکەمگرتن (لەڕووی ماددییەوە)و، هەمیشە لەیادو بیری دوارۆژدا بوونو، خۆ بۆ سازو ئامادەکردنیو دڵ بە بەهەشتو پاداشتی خواو، بە دیدار شادبوونیشی، دەبێ نیشانەی ئەهلی ئیمانو خواپەرستان بێت .

ئاشکراشە، کە لەنێوان دنیا لەباوەش گرتنو پەرستنیو، بە ڕەهایی پشتگوێ خستنو بەهیچ دانانیشیدا - کە هەردووکیان هەڵەن- دنیا بەکەمگرتنو وەك ئامرازو شوێنی کارو هۆڵی تاقیکردنەوە (قاعة الإمتحان) تەماشاکردنی هەیە، کە هەڵوێستێکی ڕاستو واقیعییەو، ئایینی خوا هەڵیبژاردوە.

ئنجا بۆ ئەوەی ئینسان بە جوانییو ڕازاوەییو زریقو بریقی ژیانی دنیا فریو نەخواتو، خۆی سەرگەردانی دنیاو، ماڵ وێرانییو پەشێمانیی ئەولا نەکات، ئیسلام هەمیشە هانیداوە، کە یادی مەرگو مردن فەرامۆش نەکاتو، هەردەم

لەبەرچاوی بێت، کە کاتێك دێ ئەم ژیانە کورتەی بەجێبهێڵێ‌و بەرەو مەنزڵگای هەمیشەیی کۆچ بکات !!

١- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك دەستی خستۆتە سەرشانی (ابن عمر) خوا لێیان ڕازی بێ‌و پێی فەرمووە: {كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ}[١]، واتە: لە دنیادا بەجۆرێك بژی، کە وەك بابایەکی غەریب، یان ڕێبواربی.

٢- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اَللَّذَّاتِ: يَعْنِي: اَلْمَوْتِ}[٢]، واتە: زۆر یادی تێکدەری خۆشییەکان بکەن، واتە: مردن.

٣- دیسان هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە لە سەرەتاوە لەبەر هەر هۆیەك بووبێ، سەردانی گۆڕستانی لە مسوڵمانان قەدەغە کردبوو[٣]، دوایی ڕێگای داون‌و فەرموویەتی: {كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يَزُورَ الْقُبُورَ فَلْيَزُرْ، فإِنَّهَا تُذَكِّرُنَا الآخِرَةَ}، واتە: پێشتر سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون، ئنجا ئێستا کێ دەیەوێ سەردانی گۆڕستان بکات، بابچێ، چونکە دوارۆژمان دەخاتەوە بیر[٤].

٤- بگرە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەردانی گۆڕستانی کردوە بە سوننەتیش، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ: {كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْرُجُ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ إِلَى الْبَقِيعِ فَيَقُولُ: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ،

---

(١) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ، برقم: (٦٠٥٣)، رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، برقم: (٢٣٣٣)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤١١٤)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٦٩٨)، وَالبَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان).

(٢) رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، برقم: (٢٣٠٧)، وَالنَّسَائِيُّ، برقم: (١٨٢٤)، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٤٢٥٨)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٢٩٩٢)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

(٣) زۆر لەزانایان ڕایان وایە حیکمەتەکەی ئەوە بووە کە خەڵکەکە لە سەردەمی نەفامیی‌و شیرکەوە نیزیك بووەو نەبادا دووچاری شیرك بن، وەك لێپاڕانەوەو شت لێ داواکردنی مردووەکان.

(٤) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٢٢٩)، عَنْ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ،

وَأَتَاكُمْ مَا تُوعَدُونَ غَدًا مُؤَجَّلُونَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، أللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَهْلِ بَقِيعِ الغَرْقَدِ)}[١].

بەتایبەت مردنو کۆچکردنی ئەو کەسانەی، کە لە ئینسانەوە نزیکترن، بێگومان زیاتر دەبێتە هۆی ڕاچڵەکانیو هۆشیارکردنەوەی، زیاترو زووترو چاکتر خۆکۆکردنەوەیو، خۆ سازو ئامادەکردنی بۆ سەفەری بەرزەخو قیامەت[٢].



(١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٢٩٩)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

(٢) شایانی باسە، کە من چەند جارێك شەهیدبوونو مردنی دۆستو خۆشەویستانی نزیکم، زۆر توند ڕایتەکاندووم‌و کاری زۆری تێکردووم، بەتایبەت هی هەندێکیان، خوا لە هەموویان خۆش بێو بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو پلەو پایەیان بەرز بکاتەوە، کە یەکێك لەو نزیكو خۆشەویستانەشم هاوسەری وەفادارو دڵسۆزو لێهاتووم (خاتوون مەلاژن)ە، خوا لێی خۆش بێو بەکەرەمو لوتفی خۆی لەگەڵ ئەوو تێکرای خۆشەویستانم، کە لە هەموویان خۆشەویستترو بەڕێزترو شیرینتر پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، لە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەیدا پێکەوە کۆمان بکاتەوە، غەمو پەژارەو ناسۆرەکانی دنیامان لەبیر بباتەوە، ئامین.

### تەوەری نۆیەم:

**ڕووحیش وەك جەستە بەخزمەتکردن و وەرزش و ڕاهێنان بەهێز و پێز دەبێ و، بەفەرامۆشکردن و خەم لێ نەخواردنی بێهێز دەبێ و دەپووکێتەوە:**

ئەمەش یەکی دیکەیە لەڕاستییە مشتومڕ هەڵنەگرەکانو، بۆ کەسانێك کە لەوبارەوە شارەزایی (خبرة)و ئەزموون (تجربة)ێکیان هەبێ، زۆر ڕوونو بەرهەستەو، سەرەڕای دەقەکانی قورئانو سوننەت، سەرجەم شارەزاو پسپۆڕانی بواری تەزکیەو تەصەووفیش لەسەری کۆكو تەبان.

ئنجا لەو ڕاستییە بنەڕەتییەشەوە، ئەم سێ ڕاستییەمان دەستگیر دەبن:

**١/ هەرکام لە ئەرکە شەرعییەکان و جۆرەکانی خواپەرستیی[1]، کاریگەرییەکی تایبەتیی هەیە، لەسەر ڕووح و دەروونی ئینسان:**

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

هەرکام لە: نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەجو عومرە، جیهاد، فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە، بانگەواز، فێرکردن، چاکە لەگەڵ دایكو باب، گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی (صلة الرحِم)، یاریدەدانی لێقەوماو، خواردن دان بە برسییو هەژارو پۆشتەکردنیان، ڕێزگرتنی ڕێبوارو میوان، کەسابەتی حەڵاڵو پەیداکردنی بژیو، چارەسەرکردنی کێشەو گیروگرفتی خەڵکی، صولحو پێکهێنانەوەی خەڵکی ناکۆك، چاکەکردنو لێبوردنو سینگ فراوانیی لەگەڵ خێزان، مشوور لێخواردنو پەروەردەکردنی منداڵ، بەرپەرچدانەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزانی ئیسلام، ڕەوشت بەرزییو، چاکە گوتنو، چاکەکردنو خۆشڕەفتاریی لەگەڵ تێکڕای خەڵکی، لێبوردنو چاوپۆشییو ڕقو تووڕەیی

(١) بڕوانە: (خواپەرستیی ئیسلامیی) کتێبی یەکەم، کە بە درێژیی باسی چەمكو واتای وشەی (عبادة)مان توێژیوەتەوە.

خۆ قووتداتەوە، خۆپاراستن لە گوناح و خراپە ڕواڵەتیی و پەنهانە گەورەو گچکەکان، ... هتد، هەرکام لەمانە، جۆرە کاریگەرییەکی تایبەتیی هەیە، لەسەر پەروەردەکردن و گەشە پێدان و کامڵکردنی ڕووح، بەهۆی زیاترو چاکتر بوونە بەندەی خواو بوونە دۆستیی و لێ نزیکبوونەوەی.

کەواتە:

ئینسانی مسوڵمان، هەتا بازنەو ڕووبەری پەرستن و بەندایەتیی بۆ خوا کردنەکەی، فراوانتر بێ و، ئەندازەی قووڵیی و ڕۆچوونەکەی زیاتر بێت، ئیسلام و ئیمان و تەقوایەکەی زیاترو چاکترو، سەرەنجامیش ئیحسان و تەزکیەبوونەکەی باشتر دەبێت.

بەڵێ، خواپەرستی تێرو تەواو ئەو کەسەیە، کە بتوانێ لە هەموو مەیدانەکاندا ئەسپی خۆی تاو بدات و، لە هەموو خەرمانەکاندا خاوەن پشک و بەش بێت و، لە هەموو کاتەکان و حاڵەتەکاندا، ئیسپاتی عەبدایەتیی خۆی بۆ خوا بکات و، بە هەموو شێوەو جۆرەکانی پەرستن، خوای خۆی بپەرستێ !!

**٢/ ڕووحیش وەك جەستە وردە وردەو پلە پلە (تدرّجاً) دەگونجێ ڕابهێنرێ و پەروەردە بکرێ، نەك یەك تەكان و بەپەلەو یەکبینە:**

بەڵێ پلەپلەیی (تَدَرُّجْ)، سوننەت و یاسایەکی گشتیی و هەمە لایەنەی خوایە لە کائیناتداو، پەروەردە بوون و گەشەکردنی ڕووحیش، لەو یاسایە بەدەر نیە، کەواتە وەك چۆن بابایەکی وەرزشکار، بۆ وێنە: هەڵگرتنی شتی قورس (رفع الأثقال) ناتوانێ لە سەرەتاوە کێشێکی زۆر قورس بەرز بکاتەوە! بەڵام پاش چەند ساڵ ڕاهێنان و مەشق (التمرین والتدریب) - ئەگەر جەستەی لیاقەتیی هەبێ — بەئاسانیی دەتوانێ بەرزی بکاتەوە، لە بواری مەعنەوییشدا بە هەمان شێوە، ئەو خواپەرستیی و بەندایەتییەی بابایەکی خاوەن پێشینە (سابقة)و ئەزموون و ڕاهاتوو، بە ئاسانیی بۆی دەکرێ، بابایەکی تازەکارو ڕانەهاتوو، ئەستەمە یەکسەر بۆی بکرێ، ئەگەر گریمان

یەکسەریش مل بەجۆرە خواپەرستییەکی ئەوتۆوە بنێ، حەتمەن دەرنابات‌و لەژێریدا دەوەستێ‌و، زوو وازی لێدێنێ‌و کۆڵ دەدات.[1]

**٣/ تایبەتمەندییەکی ڕووحە، کە لە ئەنجامی مەشق پێکردن و ڕاهێنانیدا، بەهێز دەبێ و، هەندێك حاڵەت و دیاردەی نائاسایی تێدا پەیدا دەبن:**

بەڵێ، هەروەك چۆن جەستەی ئینسان بەبێ جیاوازیی لەنێوان مسوڵمان‌و کافرو پارێزکارو گوناحباردا، لە ئەنجامی وەرزش‌و مەشق‌و ڕاهێناندا، بەهێز دەبێت‌و، دەچێتە حاڵەت‌و وەزعێکی نائاساییەوە، بۆ وێنە: ئەوانەی یاری (جمناستیك) یان (کاراتە)و (کۆنفۆ) دەکەن، توانای ئەنجامدانی جووڵە (حرکة)و کرداری زۆر سەیرو سەرنج ڕاکێشیان هەیە، کە بۆ خەڵکی دیکەی ئاسایی، بە نائاسایی‌و یاسادڕ (خارق العادة) دادەنرێن !

دەجا ڕووحیش بەهەمان شێوەیە، بەبێ جیاوازیی لەنێوان چاك‌و خراپدا، هەرکەسێك خزمەتی ڕووحی بکات‌و، بە چەند مەشق (تدریب)و ڕاهێنان (تمرین)ێك بەهێزی بکات، ئەو ئامادەییانە(إستعدادات)ی، کە تێیدان، لەکاتی زەمینە بۆ خۆشکراندا، گەشە دەکەن‌و دەپشکوون.

ئەم ڕاستییەش پێویستە بزانرێ، بۆ ئەوەی هەرکەسێك حاڵەت‌و دیاردەیەکی مەعنەویی نائاسایی لێ بینرا، یەکسەر بۆی بەکەرامەت‌و نیشانەو بەڵگەی چاکیی‌و پاکیی‌و دینداریی دانەنرێ ! چونکە ئەگەر بەو قیاسەبێ، دەبێ ئەو هێندۆسە گاپەرستانەی هیند و بوداییەکانی هیند و چین و یابان، کە لە ئەنجامی بەهێزکردنی ڕووحیاندا، بەهۆی چەندان جۆرە وەرزش‌و مەشقی ڕووحییەوە، شتی زۆر سەیرو عەجایب، دەکەن، وەك: ئاگر خواردن‌و تیغ لەخۆدان‌و ...هتد !! بەڵێ، دەبێ ئەوانە هەموویان بە خاوەن کەشف‌و کەرامەت دابنرێن !!

بەڵام لەڕاستییدا وانیەو، نهێنیی مەسەلەکە (سِرُ المسألة) هەر ئەوەیە، کە گوتمان: ڕووح لەزاتی خۆیدا قابیلیەتی تێدا سەرهەڵدان‌و، پەیدابوونی ئەو جۆرە دیاردەو

---

(١) من خۆم لەو جۆرە کەسانەم بینیوە، کە لە سەرەتاوە زۆر بەگوڕ بووە، بەڵام لەدواییدا نەك هەر ساردو سڕبۆتەوە، بگرە وازی لە هەموو شتێك هێناوەو وەزعی تەواو شڕبووە!!

حاڵـەتـانەی هەیەو، جاری واش هەیە جندو شـەیتـانەکـانیش یاریـدەی ئـەو کەسـانە دەدەن، کـە یـان هـەر مسـوڵمان نـین، یـان مسـوڵمانی لارو خـوارن، هـەم بـۆ زیـاتر سەرلـێشـواندنی خۆیانو، هەم بـۆ چەواشـەکردنو هـەڵخەتـاندنی خـەڵـکیش، مـن بۆخۆم لەوبـارەوە پرسـیارم لـێکردوونو، ئـاواش کە نووسـیومە وەڵامیـان داوەتەوە[١].

دیـارە ناشڵـێین، هەرکەسـێك حاڵـەتو دیاردەیـەکی نائاسـاییو سـەیری ڕووحیـی لـێبـیـنرا، ئەوە حەتمـەن هەر لەو جۆرە بابەتانەیە، چونکە ئـەو جـۆرە شـتانە، جـاری وا هەیە لە ئینسـانی دیندارو پارێزکـاریشدا دێنـە دی، بـەڵام دەبـێ چـاو ورد بکەینـەوەو سەرنج بدەین: ئایا ئەو کەسە چ جۆرە کەسێکەو حاڵـەتەکەیشی بەچی دەگونجێ تەفسـیـر بکـرێ ! نـەك هەر یەکسەر حوکـمی کەرامەتی بۆ بدەین، یان بەپێچەوانەوە بـە جـادوو (سِحر) بـۆی حیسـاب بکەین !

کـەواتـە:

هەرکەسێك حاڵەتێکی مەعنەویی نائاساییو، شـتێکی یاسـادرِ (خـارق العـادة)مـان لـێبیـنی، بەرلـەوەی بە چـاك، یان بە خراپ، حوکمی بەسەردا بدەین، پێویسـتـە هـەم سـەرنجی خـودی ئینسـانەکەو، هەم حاڵەتو کردەوەکەشی بدەین، ئنجا ئەگەر هەم خودی شەخسـەکەو، هەم حاڵەتو کردارەکەی، لە مەحەکی شەرع دەرچـوونو، بـەپێی قورئـانو سوننەت بوون، ئەوە خۆی بە دۆسـتی خـوا (ولـي اللە)و، حاڵەتەکەیشـی بـە کەرامـەت دادەنرێ، ئەگەرنـا بەپێچەوانەوە، حوکـم دەدرێ، ئنجـا لـە کۆتـایی ئـەم باسەشـدا بـە پەسـندی دەزانم، ئاماژە بکەم بە ژمارەیەك لەو حاڵەتو دیـاردە نائاسـاییانەی، کـە لـە کەسـانی پابەنـد بـە قورئـانو سـوننەتەوە، بینـراونو، بۆیـان بـە کەرامـەت دادەنـرێن، ئامـاژەش بە ژمارەیەك لەو حاڵـەتو دیاردە سـەیرو نائاساییانە بکـەم، کە لە کەسـانی کـافرو بێ دین، یان سـادەو گوناحبـار بینراونو، بۆیان بە حاڵـەتی شـەیطانیی حیسـاب دەکرێن، بەڵام بەرلەوەی بێینە سەر ڕیزکردنی هەرکـام لـەو دووجۆرە حاڵـەتو دیاردانـە،

---

(١) (ابن تیمیة) لە چەند شوێنێکی (مجموعة الفتـاوی)کەیدا ئاماژەی بەو مەسەلەیە کردوە، بڕوانـە: (مجموعـة الفتاوی)، ج: (١١)، ص: (١٥٧ – ١٦٢)، هەروەهـا گەلێـك لە زانـاو پێشـەوایانی دیکـەش، بـەڵام (ابـن تیمیة) وەك عادەتی خۆی زۆر چاکی ڕوون کردۆتەوەو (کا) و (دان)ی مەسـەلەکەی لە یەك جیـاکردوونەوە.

بە پێویستی دەزانم، تەرازووو پێوەرێك بخەمە بەردەست، بۆ لەیەك جیاكردنەوەی ئـەو دوو جۆرە حاڵەتـانە:

یـەك: بـابـای خاوەن كەرامەت لە زاتی خـۆیدا، ئیمـــاندارو پارێزكـــارەو پابەنـدە بـە شـەرعەوە، ئەو حاڵـەتەش كە لـێی دەبینرێ، خێرو قازانجی ئیسـلامو مسـولْمانانی تێدایەو، لە سنووری شەرعیش نەچـۆتە دەرێو، خاوەنەكـەیشـــی بەدەســـتی خـۆی نیـەو، نـازانێ، كە بە حـەتمیی دەبێ، یـان نـابێ، یـان چـۆنو كـەی دەبێ؟

دوو: بـەڵام بـابای خـاوەن حاڵـەتی شـەیطانیی، هەم لە خودی خۆیدا كـافرو بێ دیـنو گوناحبـارو لارەو، هـەم حاڵەتەكـەیشـی، مەگەر بە ڕواڵەت، ئەگەرنـا هـیچ خێـرو بەرژەوەندیی تێدا نیەو، ئنجا هەمیشەش لەژێـر ڕكێـفی ئیـرادەو ویســتی خـۆی دایـە، كـەیو چـۆن ئەنجـامی بـدات.

**أ/ چـەند نموونـەیـەك لـە كەرامـەتی دۆسـتانی[1] خـوا:**

١- (أُسَيْدَ بْنَ حُضَيْرٍ) لە كـاتێكـدا، كە سوورەتی (الكهـف)ی دەخوێنـد، شـتێكی وەك هەور لە ئاسمانەوە دادەبەزیە سـەریو، شـتی وەك چـرایانی تێـدا بـوو، كـە فریشــتە بوونو بۆ گوێگرتن لـێی هـاتبوونـە خـوار[2].

٢- فریشـتە سەلامیان لە (عِمْرَان بْنِ حُصَين) دەكرد، هەتا بە هۆی نەخۆشـییەكـەوە خۆی داغ كـرد، لـەوە بە دواوە نەمان[3].

٣- لە كاتێكـدا هـەركام لـە (عبَّـادَ بْـنَ بِشْـرٍ)و (أُسَـيْدَ بْـنَ حُضَـيْرٍ) لـە خزمـەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بەرەو ماڵەوەیان چوونەوە لە شەوێكی تاریكدا، ڕووناكییەك بە ئەندازەی سەری قەمچـی بۆیـان داگیرسـاو، كاتێـك لـە یـەكیش

---

(١) دیارە كەرامەتی دۆستانی خوا لـقێكەو، بەرهەمو بەرەكەتێكە كە لە شوێنـكەوتنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بۆیان پەیدا بووەو، وەك زانایان گوتوویانە: (كرامات الأولياء فرع من معجزات الأنبياء).
(٢) أخرجه البخاري: ٣٦١٤، ومسلم: ٧٩٥.
(٣) رَوَاهُ الـحاكم، برقم: (٥٩٩٤).

جیابوونەوە، ڕووناکییەکەش لێیان دابەش بوو[١].

٤- (أبو بكر الصديق) خوا لێی ڕازی بێ سێ میوانی لەگەڵ خۆی بردنەوە ماڵ، هەر کە پاروویەکی دەخوارد، زیاتر دەهاتەوە شوێنی، سەرەنجام هەموویان تێریان خوارد، ئەبووبەکرو هاوسەرەکەشی، کە دوایی سەرنجیاندا خواردنەکەیان لە پێش لێخواردنی زیاتر بووە، ئنجا ئەبووبەکر خواردنەکەی بردە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەڵکێکی زۆر لێیان خواردو تێربوون[٢]!!

٥- لە کاتێکدا (سَلمان الفارسي)و (أبو الدرداء) نانیان دەخوارد لە قاپێکدا، قاپەکەیان خواردنەکەی، کە تێیدا بوو (سبحان الله)ی دەکرد![٣].

٦- کاتێك کە (خبيب بن عَدي) لە شاری مەککەی شەریف، لەلای کافرەکان دیل بوو، ترێی بۆ دەهێنرا، کە مەککەش ترێی لێنەبووە[٤]!

٧- (أمّ أيْمَن) بەبێ ئاوو نان، بەرەو مەدینە کۆچی کردو بەڕۆژووش بوو، نزیك بوو لە تینوان بخنکێ، کاتی بەربانگ گوێی لە دەنگێك بوو لەسەر سەریەوە، کە سەری بەرزکردەوە، بینی دۆڵچەیەك ئاوە بۆی شۆڕکراوەتەوە لێی خواردەوە، تاکو تێراو بوو، ئنجا لە ژیانیدا تینووی نەبۆوە[٥] !

٨- (سَفينة) کۆیلەی ئازادکراوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕێگا تووشی شێرێك دەبێ‌و، ئەویش بە شێرەکە دەڵێ کە نێرراوی پێغەمبەری خوایە، شێرەکەش هەتاکو دەیگەیەنێتە جێی مەبەستی لەگەڵی دەڕوات[٦] !.

---

(١) رَوَاهُ البُخَاري، برقم: (٣٥٩٤)، وأحْمد، برقم: (١٣٨٩٧)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مُسْلِم، عَنْ أَنَس.

(٢) رواه البخاري: ٣٣٨٨، أبوداود: ٣٢٧٠.

(٣) (دلائل النبوة) لأبي نُعيم، ويُنظر: شذرات الذهب (٤٤/١).

(٤) رَوَاهُ البُخَارِي، برقم: (٣٨٥٨)، وَأَحْمَد،برقم: (٨٠٨٢)، وابْنُ حبَّانَ،برقم: (٧٠٣٩)، عَن أَبِي هُرَيْرَة.

(٥) بڕوانە: (طبقات ابن سعد)، ج: (٨)، ص: (٢٢٤)، و (الإصابة في تمييز الصحابة)، ج: (٤)، ص:(٤٣٢).

(٦) رواه الحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي، ورواه أبو نعيم في الدلائل و، رواه البزار والطبراني بنحوه.

٩- (البراء بن مالك) ئەگەر سوێندی لە خوا خواردبایە، سوێندەکەی لێ نەدەخست، ئنجا کاتێك هاوەڵان (أصحاب) لە جەنگدا تینیان بۆ هاتبایە، پێیان دەگوت ئەی (براء) سوێند لە پەروەردگارت بخۆ ! لە جەنگی قادسیەدا پێیان گوت، ئەویش گوتی: پەروەردگارم! سوێندم لێ خواردووی، کە بۆ مانیان بشکێنیو، منیش یەکەمین شەهیدبم، ئیدی شکاندنیانو بەڕائیش شەهید بوو[١]!

١٠- (خالد بن الوليد)یش ئابڵووقەی قەڵایەکی مەحکەمی دا، ئەوانیش گوتیان، هەتا ئەم قاپە ژەهرە نەخۆیەوە، خۆمان بەدەستەوە نادەین ! ئەویش خواردیەوەو گوتی: (بِسْمِ اللّٰهِ الّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)، و هیچ زیانی پێ نەگەیاند[٢]!.

١١- کاتێك (زَنِيرَةَ) لەسەر ئیسلام بە دەستی کافرەکانی مەککە ئەشکەنجە دراو کوێر بوو، کافرەکان گوتیان: لاتو عوززا چاویان کوێر کردوە ! ئەویش گوتی: نەخێر بە خوا وا نیە، ئیدی خوا چاوەکانی بۆ چاك کردنەوە[٣].

١٢- (سعيد بن زَيْد) دوای ئەوەی (أَرْوَى بنت الحَكَمْ) بوختانی پێکردو، دووعای لێکرد، کە ئەگەر درۆ دەکات، خوا کوێری بکاتو، لە وڵاتی خۆی بیکوژێ، ئیدی کوێر بوو و کەوتە چاڵێکەوەو مرد[٤]!.

ئەوەی ڕابرد چەند نموونەیەك بوون لە کەرامەتەکانی هاوەڵان، ئنجا دیارە لە وەچەکانی دیکەی ئۆممەتیشدا، ئەو جۆرە شتانە لە دۆستانی خوا هەر بینراون، بەتایبەتی لە پشتو (جيل)ی شوێنکەوتووان بۆ وێنە:[١]

---

(١) رَوَاهُ الحاكم برقم: (٥٢٧٤)، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح.

(٢) رواه أبو نعيم في الدلائل و قال الهيثمي في مجمع الزوائد: رواه أبو يعلى والطبراني بنحوه واحد إسنادى الطبراني صحيح.

(٣) بڕوانە: (الإصابة)، ج: (٤)، ص: (٣١٢).

(٤) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٢١٨).

١٣- (أبو مسلم الخولاني): خۆیو سوپایەکەی لەکاتی هەڵسانی ڕووباری دیجلەدا، لێی پەڕینەوەو بەپێیان بەسەریدا ڕۆیشتن، بێئەوەی تەنانەت دۆلکەیەکیان لێ زایە بێت !

کاتێك (الأسود العنسي) گرتی - کە یەکێك بوو لەوانەی لافی پێغەمبەرایەتییان لێدەدا - بۆ ئەشکەنجەدانی خستیە نێو ئاگرەوە، بەڵام دوایی تەماشایان کرد لەنێو ئاگردا، خەریکی نوێژکردنە !

ئنجا کاتێك هاتە شاری مەدینە (عمر بن الخطاب) لەنێوان خۆیو (أبو بکر الصدیق)دا داینا خوا لێیان ڕازی بێ، گوتی: (الحمد اللّٰه الذي لَمْ يُمِتْنِى حتى أرى مِنْ أُمة محمدٍ مَنْ فُعِلَ به كما فُعِلَ بإِبراهيم خليل اللّٰه).

١٤-(عامر بن عبد قيس) دوو هەزار درهەم مووچەی ساڵانەی، کە وەردەگرت لە ڕێگادا گەیشتبایە هەر نەدارێك بەبێ ژماردن پێی دەدا، پاشان، کە دەگەڕایەوە ماڵ نەژماردو نەکێشیان کەمی نەدەکرد ! جارێك شێرێکی بینی ڕێی بە کاروانێك گرتبوو، ئەویش چووە نزیکیو پێی خستە سەر ملیو، گوتی: (إِنَّمَا أَنْتَ كَلْبٌ مِنْ كِلابِ الرَّحْمَنِ وَإِنِّي أَسْتَحِي أَنْ أَخَافَ شَيْئًا غَيْرَهُ)، واتە: تۆ تەنیا سەگێکی لە سەگەکانی خواو، منیش شەرم دەکەم، جگە لەوی لە هیچ دیکە بترسم .

١٥- (الحسن البصري) کاتێك، کە خۆی لە (حجاج) شاردبۆوە، شەش جاران چوونە ژوورەکەیەوە، بەڵام لە خوا پاڕابۆوە، کە نەیبینن و نەیانبینی !

١٦- (صلة بن أشيم) جارێکیان لە جەنگو غەزایەکدا ئەسپەکەی مرد، ئەویش پاڕایەوە، کە خوا منەتباری خەڵکی نەکاتو ئەسپەکەی زیندوو بۆوە، کە گەڕایەوە بە کوڕەکەی گوت: کوڕم ئەو زینو جلە لەسەر پشتی ئەو ئەسپە بێنە خوارێ، چونکە ئەسپەکە سپاردە (عارية)یەو، دەستبەجێ ئەسپەکە مردەوە!

(١) بۆ نووسینی سەرجەم ئەو حاڵەتانەی هاوەڵانو شوێنکەوتووانیان، کە بیست (٢٠) حاڵەتن، سوودم لە (مجموع الفتاوى)ی (ابن التیمیة)، ج: (١١)، ص: (١٥٣-١٥٦) وەرگرتوە.

١٧- (سعيد بن الـمُسَيَّب) لە ڕۆژانی شوومی کارەساتی (الحَـرَّة)[1]دا، کـە مزگـەوتی پێغـەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ کەسی تێدا نـەمابوو، جگـە لــە خـۆیو بانگی تێدا نەدەبێژرا، کاتی نوێژەکان لە گۆڕی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) دەنگـی بانگـی دەبیسـت !!

١٨- (أويس القـرْني) کـاتێك کـۆچی دوایی کرد، چەند کـفنێکـیـان لـە نێـو جـلو بەرگەکەیدا بینی، کـە پێشـتـر پێـی نـەبوون، کـاتێك ویسـتیان بینـێـژن، گـۆڕێکـی ئـامادەیـان بیـنی، کـە لاگۆڕ (لَحْد)ێکی لە بەرد داتاشـراوی تێـدا بوو، لـەوێـدا ناشـتیان !

١٩- (الأحنف بن قيس) کاتێك گـۆڕیان بـۆ هـەڵـقەند، پیـاوێك کـڵاوەکـەی لـێ کەوتە نێو گۆڕەکەیەوەو، خۆی داهێنـایەوە هەڵـیگـرتەوە، بینی چەشـمەندازێـك (مدَّ البَصَر) فراوان بووە !

٢٠- (عبدالـواحد بن زيد) تووشی ئیفلـیجیی بوو بوو، داوای لە پەروەردگـاری کـرد، کە بۆ کـاتی دەسـتنوێژەکـانی ئەندامەکانی کـاربکەن ! کـاتی دەسـتنوێژەکـان چـاك دەبـۆوەو، دوایی دەگەڕایەوە حاڵەتی خـۆی !.

ب/ چەند نموونەیەك لە حاڵەتە شەیطانییەکانی کافران و گوناحباران[2]:

١- ئەو حـاڵەتە شـەیطـانییـانەی، کـە لــە ڕۆژگـاری پێغەمبـەردا (صلى الله عليه وسلم) لە (عبدالله بن صياد)ەوە دەردەکەوتن، هەندێك لە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خوا لـێیان ڕازی بێ، گومانیان وابوو، کە دەججاڵ (دَجَـال)ە!! پێغەمبـەریش سـەرەتا لـێی کـەوتە گومانەوە، بەڵام دوایی دڵنیـابوو کە دەججاڵ نیـەو، پـاش

---

(١) ئەو کارەساتە شوومو پڕ شەرمەزارییە لە سـەردەمی حـوکمڕانێتیی یەزیـدی کـوڕی موعـاویەی کـوڕی ئەبووسـوفیانـدا ڕوویـدا، کە ناخۆشتـرین کارەسـات بووە، بەسەر خەڵـکـی مەدینەی پێغەمبـەری خـوادا (صلى الله عليه وسلم) هـاتوە !

(٢) بڕوانە: (مجموعة الفتاوى)، ج: (١١)، ص: (١٥٧ - ١٥٩)

تاقیکردنەوەی، بۆی دەرکەوت، کە (کاهِن)ە، وەك (بخاري ومسلم) لە (عبدالله بن عُمر)ەوە گێڕاویانەتەوە.

٢- حاڵەتە شەیطانییەکانی (الأسود العَنْسي) ، کە لافی پێغەمبەرایەتیی لێدەداو، کۆمەڵێك شەیطان هاوکارییان دەکردو، هەندێك هەواڵی پەنهانیان پێ ڕادەگەیاندن.

٣- هەروەها (مُسیْلمة الکذّاب)، کە شەیطانەکان هاوکارییان دەکرد لە زانینی هەندێك هەواڵو شتی پەنهانو، جێبەجێکردنی چەند ئیشێکدا.

٤- هەروەها (الحارث الدمشقي)، کە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداریێتیی (عبدالملك بن مروان)دا لە شام یاخیی بووو داوای پێغەمبەرایەتیی کردو، چەند جندێکی شەیطان هاوکارییان دەکردو کۆتو زنجیریان لە دەستو پێی دەکردەوەو، نەیاندەهێشت تیغ بیبڕێ... ئنجا کاتێك مسوڵمانان گرتیانو ویستیان بیکوژن، ڕمێکیان لێدا نەیبڕی ! (عبدالملك)یش پێی گوت: ئەوە ناوی خوات نەهێناوە بۆیە نەیبڕی، پاشان کابرای ڕم وەشێن (بسم الله)ی کردو لێیدا بڕی.

٥- لەو جۆرە کەسانە هی وا هەیە، کە شەیطان خواردەمەنییو میوەو شیرینیو شتی دیکەشی بۆ دێنێ، کە لەو شوێنەی لێیەتی چنگ ناکەون.

٦- هەیانە کە جند (جنّي) دەیفڕێنێ بۆ شاری مەککە، یان قودس یان جێی دیکە، هەیانە، کە جند ئێوارەی عەرەفات دەیگەیەننە عەرەفاتو هەمان شەویش دەیگێڕنەوە، بەڵام بێگومان جگە لە ماندووبوونو گاڵتە پێکردنی شەیطانەکان، هیچی دیکەی پێ نابڕێ !

٧- هی وا هەیە، کە شەیطان بۆی دەچێتە سەر دیمەنێکی جوانو شێوەی پیاوێکی صاڵحو پێی دەڵێ: من (خضر)م هەندێك هەواڵو زانیاریشی دەداتێو، هەندێك کاروباریشی بۆجێبەجێ دەکات !

٨- هەیـانە کە شـەیطان لە سـەروویەوە بارەگـا (عَرْش)یـەکی پیێشـان دەدات، کـە ڕۆشـنـاییەکـی گـەورەی لەسـەرەو بـانگی دەکـاتو دەڵـێ: (أنـا ربُـك) مـن پـەروەردگارتم! - وەك لـە(عبـدالقادر الجیلانـي) ڕوویـداوە- ئنجـا ئەگـەر زانـاو هۆشیار بێ وەك ئەو، پەنا بە خوا دەگرێو تێی دەخوڕێو لەبەرچـاوی نامێنـێ، ئەگەر سادەو نەزانیش بێ، هـەڵـدەخـەڵەتـێو سەرگەردان دەبێ.

بەڵام سەرجەم ئەو حـاڵەتـە شـەیطانییانە، کە بۆ کەسانی کـافرو خـراپو پـیسو لـە ئەنجـامی گـوناحو خراپـەداو، بە هـاوکاریی شەیطانەکان پەیدا دەبن، هەرکەسێك مـادام مسـوڵمانی چاك بێتو، لەکـاتی حاڵەتەکەدا بـە دڵ قورئـان بخـوێنـێ، بەتایبـەت (آیـة الکرسي)، ئەوە حـاڵـەتە شەیطانییەکە لەبەیـن دەچـێو نامێنـێ[١].

پوختەی مەبەست ئەوەیە: کـە ڕووح هـەم لـە زاتـی خـۆیدا توانـاو لـیاقەتی تێـدا پەیدابوونی چەند حـاڵەتو دیاردەیەکی نائاساییو (خارق العادة)ی هەیە، کە:

أ- بەهۆی مەشقو وەرزشی وەك هـی هیندۆسـییەکانو بووزاییـەکـانەوە، کە یـاریی (یۆگـا) دەکـەن، دەردەکـەون.

ب- هـەم توانـای هەیـە، کـە بەهـۆی ئیمـانو تەقـواو طـاعەتـەوە، لـە خـوای پەروەردگـارو فریشـتەکانی نزیك بکـەوێتەوەو، کـەڕامەتی جـۆراو جـۆری لـێ پەیـدا بن.

ج- یـان بەهـۆی کـوفرو شـیـرکو گونـاحو خراپـەوە، لـە شـەیطانـەکان نیزیـك بکەوێتەوەو، حـاڵـەتی جـۆراو جـۆری شـەیطانیـی سـەیرو نائاسـایی لـێ بپشـکوێنـەوە.

دیارە لە یەك جیـاکردنەوەی هەرکـام لـەو سـێ جـۆرە حـاڵەتە نائاسـاییو یاسـادڕ (خـارق العـادة)انە، پێویسـتیی بـە شـارەزاییو وردەکـاریی زۆر هـەیە، چونکـە لـە ڕواڵـەتدا، وەك یـەكو تێکەڵو، لە بنەماو ئەسڵو جەوهـەریشـدا، زۆر جـیـاوازن.

---

(١) بڕوانە: سـەرچـاوەی پێشـوو، ج: (١١)، ص: (١٥٨)

## تەوەری دەیەم:

## سەنگی مەحەك و تەرازووی تەزكیە بوونی نەفس:

خوێنەری خۆشەویست !

خوا پشتیوان بێ لەم تەوەری دەیەمو كۆتاییەی، زادەو بەرهەمی ئەزموونی تایبەتییم لەبواری تەزكیەی نەفسدا، لە حەوت (٧) بڕگەدا سەنگی مەحەكو تەرازوویەكی چاكت دەخەمە بەردەست، تاكو وەك ئاوێنەیەك حاڵەتی ئیمانییو مەعنەویی خۆتی تێدا ببینیو، بۆت دەربكەوێ، كە ئایا، تا چ ڕاددەیەك نەفست تەزكیە بووە !

**١- ئیمانێكی شهوودیی:**

واتە ئیمانێك، كە بە چاوی عەقڵو دڵ ڕاستییەكانی خوا بەیەكگرتنو، پێغەمبەرایەتییو، دواڕۆژ (حقائق التوحيد والنبوة والمعاد) ببینێو بەتەعبیری بەرزی پێغەمبەری بەڕێز (صلى الله عليه وسلم) {أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ}[1].

ئیمانێك، كە وەك لە یەكێك[2] لە پێشەوایانمانەوە گێڕراوەتەوە گوتوویەتی: (لو كُشِفَ الغِطاءُ ما ازدَدْت يقيناً)، واتە: ئەگەر پەردەش لابدرێ، دڵنیاییم زیاد نابێت !! چونكە ئەو قەناعەت و دڵنیاییەی بەهۆی وەحییەوە پەیدا دەبێ، بەهێزترە لەوەی بەهۆی دیتن و بیستن و پێنج هەستەكانی دیكەوە پەیدا دەبێ، كە ئەگەری بەهەڵەداچوونیان زۆرە، بەڵام وەحیی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا، ڕاستیی بێ خلتەی تێدایە.

---

(١) رَوَاهُ مُسْلِم، برقم: (١٠٢).

(٢) لام وایە (علي بن أبي طالب)ە خوا لێی ڕازی بێ، مەبەستیش لە پەردە لاچوون دەركەوتنی حەقیقەتەكانی ئیمانو ئیسلامە، لە دنیای عەیاندا بۆ چاوی سەر.

### ٢- تام و چێژ وەرگرتن لە عیبادەت:

نیشانەیەکی دیکەی تەزکیە بوونی نەفس، بریتییە لە تام و چێژ وەرگرتن لە خواپەرستییەکانو، ئۆخژنو ئارامیی هاتنە دڵ بەهۆیانەوە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (کاتێك نوێژ دەبوو ئەمری بە (بلال) دەکرد، کە بانگ بڵێو دەیفەرموو: {أَرِحْنَا بِهَا يَا بِلاَلُ}[١].

واتە: ئەی بیلال بەهۆی (نوێژ)ەوە ئاسوودەمان بکە.

### ٣- خۆشحاڵ بوون بە تەقواو چاکەو، دڵتەنگ بوون بە گوناح و خراپە:

بەڵێ ئەمیش یەکێکی دیکەیە لە تەرازووو پێوەرەکانی پەیدابوون، یان نەبوونی تەقواو تەزکیە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {اسْتَفْتِ قَلْبَكَ، البرُّ: مَا اطْمَأَنَّت إِلَيْهِ النَّفسُ، وَاطْمأَنَّ إِلَيْهِ القَلْبُ، وَالإِثْمُ : مَا حَاكَ في النَّفْسِ، وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتُوكَ}[٢].

واتە: پرس بە دڵت بکە، چاکە ئەوەیە، کە دەروونت پێی مورتاح بێتو دڵت پێی ئاسوودە بێ، گوناحیش ئەوەیە، کە دەروون پێیەوە سەغڵەت بێو، لە سینەدا بێتو بچێو ئارام نەگرێ، هەرچەندە خەڵك فەتوات بۆ بدەنو فەتواشیان بۆ داوی.

### ٤- ئامادەبوون بۆ بەخشینی سەرو ماڵ لەپێناوی خوادا:

بەڵێ ئەمیش نیشانەو بەڵگەو پێوەرێکی دیکەی تەزکیەیە، چونکە ئینسان ئیمانی کامڵ نابێ، بە ڕای هەندێکیان هەر دانامەزرێ، هەتا خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) لە خۆیو لە هەموو کەسو شتێك خۆشتر نەوێن: {ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ أَحَبَّ عَبْدًا لا يُحِبُّهُ إِلا لِلَّهِ...}[٣]، ئنجا دیارە کەسێکیش خواو پێغەمبەری خوای لە خۆیو لە هەموو

---

(١) رَوَاهُ الطبراني في (الكَبير) برقم: (٦٢١٥).
(٢) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٨٠٣٥)، والدَّارمي برقم: (٢٥٣٣)، وقال النووي: حسن، وَحَسَّنَهُ الألباني.
(٣) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ، برقم: (٦٥٤٢)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (١٧٤)، عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

کەسێك خۆشتـــر بوێن، بێگومان زۆر بە ســێنــایی دەتوانێ، کە سەرو ماڵی لە پێنــاوی خوادا ببەخشــێ، چونکــە هەمیشــە ئینســان شتێك، کە کەمتــری خۆشــدەوێ، لەپێنــاو شــتێکدا کە زیاتری خۆشــدەوێ، بەختی دەکات. خوای پەروەردگــاریش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ التوبـة.

**٥- جڵەو کردنی نەفس بە جڵەوی شەرع و کۆنترۆڵکردنی غەریزە جەستەیی و دەروونییەکان و ئەندامە ڕواڵەتییەکان:**

ئەمیش یەکی دیکـەیە لە نیشـانەو بەڵـگەکـانی گەیشـتن بە حاڵـەتی تەزکیـەبوونی نەفـس، وەك لە باسەکانی پێشــووتردا کراوەتەوە، لەڕاســتییدا هــەر کەســێك خــۆی لــە دیلـێتییو خزمەتکـارێتیی نەفسو ئارەزووەکانیو، جـەســتەو غــەریزەو داخوازییەکـانی ئـازادو ڕزگـار نەکردبێ، زۆر لــەوە کەمتــرە، کــە جــاری شــایســتەی بەرزبوونــەوە بــۆ پایەو مەقــامی ئیحســان بێت ! ئایا ڕێگا بە بابای کۆیلەو خزمەتکـــار دەدرێ، بچێتـــە ژوورو دیوەخانی ئەشـراف و پیــاو ماقــوولان؟!

بەڵـــێ، قوتــاربوونو ئــازادبوون لــە خزمەتکـــاریی نــەفسو جەســتەو غەریـــزەو داخــوازییەکــانیان - مەگــەر بــە ئیزنــی شــەرعو لــە ســنووری شەرعـــدا - بەڵـگـــەو نیشــانەی تەزکیــەبوونی نەفســەو، پێچــەوانەکەشی مانایەکی پێچـەوانە دەگـەیەنـێ.

ڕەحمــەتیش لەوکەســەی، کە گوتوویــەتی: {ومَنْ أباحَ النَّفْسَ ما تَهْـواه، فإنَّمـا إلـهـُـهُ هَـواه}.

واتــە: هەرکــەســێك بــێدڵیی نەفســی نەکــاتو حەز بە چــی بکــات بیــداتێ، ئــەوە بێگــومان ئــارەزووی خــۆی کردۆتە پەرســتــراوی.

### ٦- نەلەخشان لە کاتی هات و نەهات و خۆشیی و ناخۆشییدا:

خـوای کـاربەجێ ئـاوا وەسـفی بەندە چاكو صاڵحو دۆستەکانی خۆی دەکـات:

أ- ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ يونس.

واتە: ئاگاداربن! دۆستانی خـوا هـیچ ترسـیان لەسـەر نیـەو، ئـەوان پـەژارەش داناگرن.

ب- ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾﴾ المعارج

واتە: بێگـومان ئینسـان خـۆڕانەگـر دروسـت کـراوە. کـە ناخۆشـیی تـووش بـوو، سـەغڵـەت دەبـێ و، کـە خێـرو خۆشـیی هـاتەڕێ، لـە غـەیری خـۆی دەیگـرێتـەوە، بێجگـە لە نوێژکـەران (هەموو ئینسـانەکـان هـەروان).

لەڕاستییدا هەر جۆرە لەقینو جوولانو هەڵپەهەڵپکردنێکی ئینسـان، لە ئاقاری بـەلاو گرفتـاریی و خۆشـیی و ناخۆشـییەکانی ژیـانو ڕۆژگـاردا، هۆیەکـەی یەکـێك لـەم دوو شـتانەیە:

١- لەدەسـتـدانی بەرژەوەندییەکـی مـاددیی، یـان مەعنـەویی.

٢- هـاتنـەدەسـتی خێـرو چـاکـەو بەرژەوەندییـەك.

ئنجـا لە سـۆنگـەی ئەوەوە کە بەندە چاكو ساغو کـامڵـەکـانی خوا، تەنیـا ڕەزامەندیی خوایان مەبەستەو، هەمیشـەش دڵیان پێیەوە پەیوەستەو، دنیاو ئەوەش، کە لـە دنیـادایـە، هـەمووی بە شتێکی کەمو گچکە دەزانن، بۆیە لەبەردەم هاتو نەهاتەکانـدا، دامەزراوو نەلەخشـاون، خوای پەروەردگـاریش فەرموویەتی: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾﴾ الحديد.

واتە: هیچ بەڵایەکتان لە زەوی‌و لە نەفسی خۆتاندا بەسەر نایەت، مەگەر پێش ئەوەی بیخوڵقێنین، لە نووسراوێك دایە، ئەوەش بۆ خوا ئاسانە. (ئەو ڕاستییەمان ڕوونکردەوە) تاکو بەهۆی لەدەستدان‌و فەوتانی شتێکەوە زۆر نیگەران نەبن و، بە شتێکیش کە دێتە دەستتان، زۆر دڵخۆش نەکەن، بێگومان خواش هەر فیزکەرێکی شانازییکەری خۆشناوێ.

٧- ڕەوشتی بەرزو جوان:

ئەمیش سەنگی مەحەك‌و پێوەرو تەرازوویەکی یەکجار ڕاست‌و تەواوە، بۆ هەڵسەنگاندنی ڕاددەو ڕێژەی تەزکیە بوون‌و نەبوونی ئینسان !

چونکە ئەگەر ئیسلام‌و مسوڵمانەتیی درەختێك بێ، ئەوە (ئیمان‌و عەقیدە) ڕەگ‌و ڕیشەو، (عیبادەت‌و تەقوا) قەدو لق‌و پۆپ‌و گەڵاو، (ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو پەسەند)یش میوەو بەر (ثمرة)ەکەیەتی.

ئەمانەش چەند نموونەیەکی گرنگیی ئەو خەسڵەت‌و ڕەوشتە پەسندانەن، کە پێوەرو سەنگی مەحەکی تەقواو تەزکیەی نەفسن :

١) ڕقی خۆ کپکردنەوەو تووڕەیی قوتدانەوە: ﴿...وَٱلۡكَـٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ... ﴿١٣٤﴾﴾ آل عمران.

٢) لێبووردن‌و چاوپۆشیی کردن: ﴿...وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ... ﴿١٣٤﴾﴾ آل عمران.

٣) بەخشین‌و چاکەکاریی: ﴿...وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ آل عمران.

٤) خەڵك بەسەر خۆدا هەڵبژاردن (الإيثار): ﴿... وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ الحشر.

٥) لە بەرانبەر خراپەدا چاکەکردن: ﴿...وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾﴾ الرعد.

٦) خاكیی‌و بێ فیزیی‌و خۆ بەكەمگرتن: {وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ عَزَّ وَ جَلَّ}[1].

٧) قازانجو زیانی مسوڵمانان وەك هی خۆدانان: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ}[2].

بەڵێ، وەك چەند جاری دیكەش گوتوومانە:

هەر دڵو دەروونێك بەڕاستیی ئیمانی تێدا نیشتەجێو جێگیر بووبێ، بەتەئكید دەبێتە كانگاو سەرچاوەی هەموو خەسڵەتو ئاكارێكی پەسەندو بەرزو جوان، چونكە ئیمان چاكەیە (فضیلة)یێكی هێندە گەورەو بەرزو كاریگەرە، كە لەقەدەر خۆی هەرچی (فضائل)ی دیكەیە پەلكێشیان دەكاتو پەیدا دەبن، (تەزكیە)ش، زەمینە سازكەرو ڕێخۆشكەری چاكترو زیاتر كامڵبوونی ئیمانە.

كۆتایی ئەم باسەش بەم دێڕە شیعرە فارسییە پڕمانایە دێنم، كە دەڵێ:

گوهر پاك ببايَدْ كه شَوَدْ قابلِ فَيْض

وَرنَه هَرْ سنگو گل لؤلؤ و مَرْجان نَشَوَد

واتە: گەوهەری دەروونێكی پاكو بێگەرد پەیدا بكە، كە بگونجێو شایستەبێ بۆ بەسەر داڕژانو وەرگرتنی بەرەكەتو بەخششەكان (فیوضات)ی خوا، ئەگەرنا هەموو بەردو قوڕێك نابنە گەوهەرو مرواریی.

لێرەشدا كۆتایی بە بەرهەمو ئەنجامگیرییەكانی ئەزموونی خۆم دێنم، لەبواری تەزكیەی نەفسو، گشت سەفەری بەرەو خوا چوونمدا، بەئومێدی ئەوەی، خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكانم، لێی بەهرەمەند بنو، دەرسو پەندی جۆراوجۆری لێ وەربگرنو، دووعایەكی خێریش بۆ بەندەی خاوەن هەڵەو پەڵە بكەن.

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (٨٩٩٦)، وَمُسْلِمٌ، برقم: (٦٧٥٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٢٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٣٢٤٨)، وَالدَّارَمِيُّ، برقم: (١٦٧٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ.

(٢) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ أَحْمَد، برقم: (١٣٩٩٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٣)، وَمُسْلِم، برقم: (١٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥١٥) وَقَالَ: صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٦)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٢٧٤٠)، وغيرهُمْ، عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ.

# بەشی هەشتەم

## دوا سەرنجم
## لەبارەی نەفسەوە
## پاش یازدە ساڵی ڕابردوو



خوێنەری سەنگین و شیرین !

خوای میهرەبانو بەخشەر پشتیوان بێ، هەوڵدەدەم لەم بەشەدا بە کورتییو گوشراویی، دوا سەرنجو بۆچوونەکانی خۆم لەبارەی تەزکیەی نەفسەوەو، لە ماوەی یازدە ساڵی ڕابردوودا، بخەمە ڕوو:

سەرەتا دەڵێم :

دوای ئەوەی بۆ ئەم چاپی پێنجەمەو، بۆ چاپی یەکەمی تەرجەمە عەرەبییەکەی، بەوردیی چاوم بەم کتێبەدا گێڕایەوە، شتێکی ئەوتۆم نەکەوتە بەرچاو، کە پێویستیی بە گۆڕینو دەستکاریی کردن بێ، بۆیە دەتوانم بڵێم: هەڵوێستو بیروبۆچوونم لەبارەی تەزکیەی نەفسو چۆنیەتی صاڵح بوونو بەرەو خواچوونەوە، بەگشتیی هەر ئەوەیە، کە لە دوو توێی ئەم کتێبەدا خستوومەتەڕوو، بەڵام بە پێویستی دەزانم، ئەگەر تەنیا بۆ جەخت لەسەرکردنەوەش بێ، لە شەش تەوەردا، شەش ڕاستیی گەورەو گرنگ باس بکەم، کە هەندێکیان پێشتریش کەم و زۆر باس کراون:

تەوەری یەکەم:

نەفسی مرۆڤ لە بۆتەی سەختیی و دژوارییەکاندا تەزکیە دەبێ:

لە ساڵی (٢٠٠١) بەملاوە، چ لە چوارچێوەی کارو پرۆژەی ئیسلامییداو، چ لە خودی خۆمدا، تووشی کۆمەڵێك گرفتاریی و ئێشو ژانو ناڕەحەتیی بووم، کە هەتا ڕاددەیەکی زۆر بوونە مایەی ڕاتەکێنرانو تۆزو خۆڵ لێ داتەکێنرانی نەفسمو، زیاتر بەرەو خوا چوونمو لێ نیزیك بوونەوەیم، چونکە بێگومان مرۆڤ لەکاتی گرفتاریی‌و دژوارییەکاندا، زیاتر هەست بە ئاتاجیی خۆی دەکات بەرەو خواو بەرەو لای ڕادەکات، وەك فەرموویەتی:

﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ النمل.

واتە: یان ئایا کێ وەڵامی بابای ناچارو تێگیراو دەداتەوەو، خراپەو ناڕەحەتیی لا دەبات‌و، دەتانکاتە جێنشینانی زەوی، ئایا هیچ پەرستراو لەگەڵ خوادا هەن ؟! بە کەمیی پەند وەرگرن.

هەروەها فەرموویەتی:﴿ فَفِرُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ...﴿٥٠﴾ ﴾ الذاریات.

واتە: دەجا بەرەو لای خوا ڕابکەن...

کە کۆچی دوایی دایکم – خوا لێی خۆشبێ-و، بە ناهەق کوژرانی مامۆستا (عبدالله)ی قەصریو، مووشەك بارانکردنی بارەگاکانمان لە لایەن ئەمریکاوە،[1] کوژرانو بریندار بوونی نیزیکەی سەد (١٠٠) کەس لە برایانمانو،

(١) لە: ٢٠٠٣/٣/٤ز دا و لە بازگەی تاسلووجە .

پاشان گواستنەوەی بنکەو بارەگاکانمان بۆ پشدەرو، دواتر گیرانی خۆم و ژمارەیەك لە برایان لە لایەن ئەمریکاوە، بە فیتی هەندێك كوردی نەفس نزم و سیخوڕ، دواتریش بەناهەق كوژرانی مامۆستا محمد سەنگاوی،[1] گرنگترینی ئەو سەختییو دژوارییانە بوون، كە بەسەرم هاتن.



(١) لە ٢٠٠٦/١٠/١٥ز دا، لە بەغداد، لەكاتی دەوامی لە ئەنجوومەنی نوێنەران دا.

تەوەری دووەم:

## زینـدان (سـجن) دەرفـەتێکی زێڕینـە بۆ ئیـعـتیـکـاف و بەخـۆداچـوونەوەو لە خـوا نیـزیك بوونەوە:

بەڵێ زینـدانیـی کرانو گـیـرانی مـرۆڤ - بە تـایبـەت ئەگـەر بە نـاهـەقو سـتەم بێ - هەلو دەرفەتێکـی یەکجار گرنگو بایەخـدار ـ بـە مەرجێـك بـاش بـەهرە لـە کـات وەربگـیـرێ - بـۆ کـارکردنـی مـرۆڤ لەسـەرخـۆ تەزکـیـەکردنی، وەك مـن لـە ئەزمـوونی بیـسـتو دوو (٢٢) مانگـی گـیـرانم لە لایەن ئەمریـکـاوە بۆم دەرکـەوت، چـونکـە وەك لە کـتێـبـی: (ئەشـکـەنجەو زینـدان)دا باسـکراوە[1]، لـە مـاوەی ئـەو بیسـتو دوو مانگـەدا، کە نیـوەی زیـاتری بەڕۆژوو بووم، وێـڕای ئـازارو نـاڕەحەتیـی زۆری جەستەییو دەروونیـی، هەتـا کەناری نیـزیکـی مـەرگ، خـوای بەخشـەرو بـە بەزەیی، زۆر جۆرە کەرەمو بەخششی تـایبەتـی پێـدام، وەك:

١- دوو کەڕەت دابەزینـی سـەکینەت (نزول السـکینة)، کە وەسـفکردنی زەحمەتـەو، لـەوێش نەبـێ ئەو حالەتـەم نەبینـیـوە.

٢- هەسـتکـردن بە ئـۆخـژنو ئـارامیـی.

٣- زیـکـرو قورئان خـوێـنـدنـی بـەردەوام، کە زیـاتر لـە سـەدو چـل (١٤٠) جـار قورئانم خەتـم کرد.

٤- نووسـینـی مەوسووعـەی: (الإسـلام کـما یتجـلی فـي کتـاب الله) کـە لەچاپی دووەمیدا دوازدە کتێبە، لـە چوار هـەزار (٤٠٠٠) لاپـەڕە زیـاترداو، تـاکـە سـەرچاوەیشـم قورئان بوو.

---

(١) ئەو کـتێبە کۆی ئەو چاوپێکەوتنە چەند ئـالـقـەییەیە، کە پاش گەڕانەوەم لە زیندان بە ماوەیەکی کـەم، کاك هاوژین عومـەر لـەبارەی زینـدانیـیکرانـمەوە لەگـەڵی ئەنـجام داومو، بـۆ زمانـەکانی عەرەبیـیو فارسـییو ئینـگلیـزییـش وەرگێڕراوەو چاپکراوە .

٥- وتوویـــژو موناقەشـــەی زۆر لەگـــەڵ هـــەر کـــام لـــە لـێکـۆڵـــەر (محـــقق)ە ئەمریکـایـی‌و بەریتـانیـیەکـانو، بەرپـرس‌و سـەرانی ڕژێـمـی بەعسـیدا.

٦- دەرس گـوتـن بە ژمـارەیـەك لە هـاوەڵە زینـدانیـیەکانم ... هـتد.

٧- تۆخکردنەوەی خواپەرستییەکانم بەگشـتیی، بەتایبـەت نوێـژەکانی ڕۆژ و شـەوم و، قورئانخوێندنی زۆر تێیان دا...



### تەوەری سێیەم:

### خۆڕاگریی و نەلەخشان لە بەرانبەر قسەو قسەڵۆك و بوختان و درۆو دەلەسەو پرۆپاگەندەی کەسانی ناحەزو کینە لەدڵ و خاوەن حەسەددا:

ئەمیش – بەپێی ئەزموونی بەندە – هۆکارێکی دیکەی گەورەو کاریگەری صالْح بوونو بەرەو خواچوونو نەفس تەزکیە بوونە، چونکە هەم پێش زیندانیی کرانمو، هەم پاش گەڕانەوەشم لە زیندان، چ لەلایەن کەسانێکی ناحەز بەئیسلامو تەوژمی ئیسلامییەوە، چ کەسانێکی زڕە مسوڵمانو فەریکە مسوڵمانی دڵ پڕ گرێو گۆڵو بوغزاوییەوە، هەتا ئێستاش (٢٠١٢/٢/١٧)، بەردەوام لە ژمارەیەك کەناڵی ڕاگەیاندنی جۆراو جۆری وابەستەو دابەستەو دەست لە پشت دراوو زار چەورکراو، یان ئیخفالْکراوو بە سەهوو براوەوە، چەندان جۆرە تۆمەتو بوختانو ناو ناتۆرەو قسەو تەعبیری ناشیرینو بێنەزاکەتم پێگوتراوەو ئاڕاستە کراوە، بەلاّم لە خوا بەزیاد بێ، مەگەر بەدەگمەنو زۆریش بە کورتیی، ئەگەرنا وەلاّمی هیچیانم نەداوەتەوەو، ئەوەی دەعواشمان لەسەر تۆمار کردبێ، لێمان بردۆتەوە، چونکە قسەکانیان زیاتر درۆو دەلەسەو بوختانو شتی هەڵبەستراو بوون ! ئاشکراشە، کە قسە پێگوترانو بوختان بۆ هەڵبەسترانو ئازاری ڕووحیی دران، بەهۆی قسەی ناشیرینو بێنەزاکەت پێگوترانەوە، لەلایەن ناحەزانی داخ لەدڵو دڵ پڕ گرێو گۆڵەوە، سوننەتو عادەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)و شوێنکەوتووە ڕەسەنەکانیان بووە، خوا بە کەرەمی بێسنووری خۆی لە ڕیزی ئەواندا حیسابمان بۆ بکات، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿١١﴾ ﴾ الحجر.

واتە: بێگومان لـە پـێش تۆشـدا پێغـەمبەرانێکـمان بـۆ گـەلـە پێشـووەکان ناردوون و، هیـچ پێغەمبەرێکـیان بۆ نەهـاتوە، کـە گـاڵتـەیان پێ نەکـردبـێ.

* ﴿ إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ ﴿٩٥﴾ الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر.

واتە: بێگـومـان ئێمـە گـاڵتـە پێکـەرانـت لەکۆڵ دەکەینەوە، ئەوانەی لەگەڵ خـوادا پەرسـتـراوی دیکـە دەپەرسـتـن، لەمـەودوا دەزانـن و، ئێـمە دەزانیـن، کـە بەوەی دەیـڵـێـن سـینەت تەنگ دەبـێ، دەجـا بە سـتایش کردنەوە، پـەروەردگـارت بە پـاك بگـرەو لە کـڕنووشـبەران بەو، هەتـا مەرگـت بـۆ دێ، هـەر پەروەردگـارت بپـەرسـتە.

* ﴿ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ ﴾ طه.

واتـە: دەجـا خۆڕاگـر بـە لەسـەر ئـەوەی دەیـڵـێنو بـە سـتایشکردنەوە پـەروەردگـارت بە پاك بگرە، پێش خۆرهەڵاتنو پاش ئاوابوونیشـی و، لـە کاتـەکانی شەوگارو ئەمـلاولای ڕۆژگـاردا، بەڵـکـو – بەهـۆی پـاداشـت درانەوەتـەوە ڕازی ببـێ –.

* ﴿ بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: بەڵـکـو گـوتیـان: خـەونی تێکـەڵو پێکـەڵـن، بەڵـکو هەڵـیـبەسـتوە، بەڵـکـو ئـەو شـاعیـرە..

* ﴿ كَذَٰلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوْا بِهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: ئاوا بەو شێوەیە ئەوانی پێشووش هیچ ڕەوانەکراوێکیان بۆ نەهاتوە، مەگەر گوتوویانە: جادووگەرە، یان شێتە، ئنجا ئایا یەکدییان بەو قسەیە ڕاسپاردوە؟ بەڵکو کۆمەڵێکی یاخیین.

شایانی باسیشە بەبێ خۆ بۆ خوا ساغو یەکلاکردنەوەو، پشت بە خوا بەستن (توکل)و، زیکرو طاعەتی بەردەوامو، هەڵبژاردنی دوارۆژ بەسەر دنیاداو، ژیانی دنیا بەکەمگرتن (زهد)، مرۆڤ ناتوانێ لە بەرانبەر درۆو دەلەسەو بوختانو پڕۆپاگەندەی ناحەزاندا، نەلەخشاو شلوێ نەبوو بێ، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ بەردەوام بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ، کە لە یادی خوا، طاعەتو چاکەکاریی‌و دنیا بەکەمگرتنو دوارۆژ هەڵبژاردن، زیاد بکات، بۆ وێنە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾﴾ الإنسان.

واتە: ئێمە بە دابەزاندن قورئانمان دابەزاندۆتە سەر تۆ، دەجا بۆ حوکمی پەروەردگارت خۆڕاگربەو، فەرمانبەریی هیچ گوناهبارێکی سپڵەیان مەکەو، بەیانیانو ئێواران ناوی پەروەردگارت باس بکەو، لە شەوگاردا سەجدە بۆ خوا بەرەو، لە ماوەیەکی درێژی شەوگاردا بەپاکی بگرە.

ئاشکراشە، کە زیادکردن لە ئیخلاصو پشت بەخوا بەستنو زیکری خوا، طاعەتو چاکەو دنیا بەکەمگرتنو ڕۆژی دوایی هەڵبژاردن، دەبێتە مایەی تەزکیەبوونی نەفسو زێدەبوونی تەقوا.

## تەوەری چـوارەم:

## دڵـسۆز بوون بۆ خـەڵك و بەتەنگـەوەبوونیـان و، بەزەیـی و پەرۆش بۆ نواندنیـان:

ئەمیـش یەكێـكـە لە هـۆكـارە كاریگـەرو گـەورەكـانی تەزكیـەبوونی نەفـسو، سـەرەنجـامو صـاڵح بوونو بەرەو خـواچـوون، دیـارە هەر بۆیـەش، كـە پێـغـەمبـەرانی پایـە بەرزی خـوا (صلى الله عليه وسلم)، دڵسـۆزییو ڕاسـتو سـاغیـی خۆیـانیـان بـۆ گـەلەكـانیـان خسـتۆتەڕوو، بۆ نـموونـە:

(نـوح) سـەلامی خـوای لـێبـێ بە گـەلـەكـەی دەفـەرموێ: ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ الأعراف، هـەروەهـا (هـود) بە گـەلـی خۆی (عـاد) دەفەرموێ: ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ الأعراف.

هەروەها هەر بۆیـەش پێغەمبەری كۆتایی (صلى الله عليه وسلم) هـەموو دینداریـی (تـدیُّن)ی لـە دڵسـۆزییو ڕاسـتو سـاغـیی دا كـورت هەڵـهێنـاوە، وەك فەرموویـەتـی: {الدين: النصيحة، قلنا لِمَن ؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم} متفق عليه عن تميم الداري[1].

واتە: دینداریـی دڵسـۆزییـە، گـوتـمان بـۆ كـێ ؟ فـەرمووی: بـۆ خـواو، كـتێبـەكـەیو، پێـغـەمبـەرەكـەیو، پێشـەواو بەرپـرسـانی مسـوڵمـانانو، تێـكـڕای مسـوڵمـانـان.

---

(١) صحيح البخاري: ٧٢٠٤، بلفظ: (... والنصح لكل مسلم)، و: صحيح مسلم: (٩٥).

شایانی باسیشـه، کـه دڵسـۆزیـیو بەزەیـیو پـەرۆش نـوانـدن بـۆ خەڵـكو کۆمەڵـگاش، لە زۆر شـتـاندا بەرجەسـتـە دەبـێ، وەك:

خۆشـویسـتـنیان، خـەمو مشـوور لـێخواردنیـان، دڵـخۆش بـوون بـە خێـرو خۆشـییانو، دڵـتەنـگ بـوون بـە نـاڕەحـەتیـیو زیـانیـان، بانگـەوازکـردنیـان بـۆ چـاکەو، لـەگەڵدا ئەنـجامـدانی ئـەرکی فـەرمـان بە شـتە پەسـندەکـانو ڕێگـریـی لە شـتـە ناپەسـندەکـان، بەرگـریـی لێـکردنیـانو پـشـتگرتـنیـان لـەسەر هـەق، دەسـت گـرتنو ڕێـلـێـگـرتنیـان لـە سـتەمو ناشـەرعیـی،...هتد.



**تەوەری پێنجەم:**

**نیزیکی و تێکەڵیی کردن لەگەڵ خەڵکی سادەو هەژارو نەدارداو، هەستکردن بە ئێش و ژانەکانیان و، خۆ دوورگرتن لە ستەمکارو خۆبەزلگران، مەگەر بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی شەرعیی و بەگوێرەی پێویست و بە وریاییەوە :**

ئەمیش کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە تەزکیەبوونی نەفسدا، هەر بۆیەش خوای بەرزو مەزن لە چەند شوێنێکی قورئاندا، فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەکات، کە لەگەڵ خواپەرستانی سادەو کەمدەستو نەداردا هاودەم بێتو، خۆی لە زلەزلانی ئارەزوو پەرستو لە خوا بێخەبەر دوربگری، بۆ وێنە:

﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ الكهف.

واتە: خۆت مەرزەم بکەو بمێنەوە لەگەڵ ئەوانەدا، کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو (دیداری) ڕووی (یان ڕەزامەندیی)وییان دەوێ و، چاوتیان لەسەر هەڵمەنگێوە (چاویان لێ لامەدە) بە مەبەستی ویستنی جوانیی ژیانی دنیاو، بە قسەی کەسێک مەکە، کە دڵیمان لەیادی خۆمان بێئاگا کردوەو، کەوتۆتە شوێن ئارەزووی خۆیو، کاری لەکار ترازاوەو بۆی دەرچووە !

هیچ گومانیشی تێدانیە، کە هاودەمو هاوڕازو نیزیکانی مرۆڤ، کاریگەریی ئەرێنیی، یان نەرێنیی لەسەر دادەنێنو، کەمو زۆر پێیان کارتێکراو (متأثّر) دەبێ، هەر بۆیەش گوتراوە:

لا تَسَلْ عن المرءِ وسَل عَن قرينه
فكلُّ قرينٍ بالمقارن يقتدي

هەڵبەتە بابای مسوڵمانیش هەمیشە هەڵوێستی بەگوێرەی هەستو نەستی دەبێو، دوای ئەوەی هەست بە ئێش و ژانو نارەحەتییو گرفتارییەکانی توێژی سادەو هەژارو گرفتار دەکات، ئەو هەستە لە هەڵوێستی بەرگرییکارانەو لەسەرکەرەوانەدا، بەرجەستە دەکاتو، هەوڵدەدات ئەو سەرچاوەیەی ستەمو بێدادییو نەهامەتیی بەرەی چەوساوانی لێوەدێ، وشکو چۆرەبڕ بکات، ئنجا هەر مەسرەفێکی تێچووبێو، بە هەر نرخێك بۆی تەواو بووبێ !

کە دیار، ئەمەش خوازیاری بەگژداچوونەوەی ستەمی ستەمکارانو خراپەی خراپەکارانە، هەر بۆیەش خوا نەفرینی لە ستەمکاران کردوە: ﴿... أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٨﴾﴾ هود، هەروا ڕایگەیاندوە لە خراپەکارانی خۆشناوێنو دەیانبوغزێنێ: ﴿... وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾﴾ القصص، هەروەها خوای دادگەرو کاربەجێ ڕایگەیاندوە، کە هەمیشە خراپەکاریی -بە مانای فراوانی، کە گەندەڵیی یەکێکە لە موفرەدەکانی- لە ئەنجامی ستەمو یاخییبوونی حوکمڕانانی ستەمکارەوە پەیدا دەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ ﴿١٢﴾﴾ الفجر.

واتە: ئایا نەتدی پەروەردگارت چۆنی بە (گەلی) عاد کرد ! ئیرەمی خاوەنی پایەو کۆڵەکەکان. کە وێنەی وان لە وڵاتاندا دروست نەکرابوو، هەروەها (چی بە گەلی) ثەموود (کرد)، ئەوانەی چیاو بەردیان لە دۆڵو

شـیوەکـاندا کـۆڵـیو داتـاشـی (بـە مەبەسـتی خـانوو بــەرە دروسـتکردن)، هـەروەها چی بە فیرعەونی خاوەنـی سینگو مێـخەکـان کرد. ئەوانەی، کە لـە وڵاتاندا لــە خـوا یاخیی بوون. ئـنجا خراپـەیـان تێـدا زۆر کرد.

کــەواتــە:

وەك پێشـتـریش گـوتـوومـانە، نـابـێ هیـچـکـەس پێـی وابـێ، کــە پـرۆسـەی خــۆ تـەزکـیـەکـردن، پێـچـەوانـەی کــارو پــرۆژەی ئیسـلامیـیو پـاکسـازیی‌و چـاکسـازیی تێـداکردنی کـۆمەڵـگایـە، بـەڵکو خـۆ پـاكو چـاکـکردن، لـەمیـانەی پـاکسـازیی‌و چـاکسـازیی کـۆمـەڵـگـاو، تێــدا نـەهـێشـتـنی سـتـەمو جــەورو خـراپـەدا، ئەنـجـام دەدرێ.

تەوەری شەشەم:

## خۆ ڕازاندنەوە بە خەسڵەتی بەرزی لێبوردەیی و سینگ فراوانیی (سماحة) و، خۆ دوورگرتن لە کینەو جوغزو غەرەز، تەنانەت بەرانبەر بە دوژمن و ناحەزانیش:

سەماحەتو دڵگەورەییو چاوپۆشییو لێبوردن کردنە پیشەش، هۆکارو فاکتەرێکی دیکەی کاریگەری بواری تەزکیەبوونو صاڵح بوونو بەرەو خوا چوونە.

هەر بۆیەش خوای میهرەبان لە چەندان شوێنی قورئاندا، فەرمان بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەکات، کە سەماحەتو چاوپۆشییو دڵگەورەیی بکاتە پیشە، بەرانبەر بە نەزانییو نەفامیی دوژمنو ناحەزانی، بۆ نموونە:

* ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَـَٔاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾﴾ الحجر.

واتە: ئاسمانەکان و زەوی ئەوەی نێوانیانمان بەس بە هەق دروستکردوون و، بێگومان کات (ی تێدا کۆتایی هاتنی دنیا) هەر دێ، دەجا بە شێوەیەکی جوان چاوپۆشییان لێبکە.

* ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾﴾ المزمل.

واتە: لە بەرانبەر ئەوەدا، کە دەیڵێن، خۆڕاگربەو، بە شێوەیەکی جوان وازیان لێبێنە (واتە: جوابیان مەدەوە).

﴿... وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾﴾ المائدة.

واتە: تۆ بەردەوام ئاگاداری ناپاکییان دەبی، مەگەر کەمێکیان، دەجا لێیان ببوورەو چاوپۆشییان لێبکە، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدوێن.

هەڵبەتە خۆڕازاندنەوەش بەم خەسڵەتە بەرزو پەسندەی سەماحەت‌و لێبوردەیی‌و دڵگەورەییە، شتێکی ئاسان نیەو بە سەبرێك‌و دوو فوان نایەتەدی‌و، زەحمەت‌و ماندووبوون‌و پشوو درێژیی‌و کار لەسەرخۆکردنی دەوێ، بەڵام بەڕاستیی بەرهەم‌و بەرەکەتێکی گەورەو فراوانیشی هەیە، لە پاك‌و چاکبوون‌و گەشەکردنی نەفسدا، بەڵگەشمان لەوبارەوە ئەوەیە، کە خوای میهرەبانی بەخشندەی لێبوردە تبارك وتعالی لە سووڕەتی (النور) لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا، کە باسی ڕووداوی دڵتەزێنی بوختان (إفك) دەکەن، لە ئایەتەکانی ژمارە (٢١، ٢٢)دا مەسەلەی تەزکیەبوون‌و لێبوردەیی پێکەوە باس دەکات‌و پەیوەستیان دەکات:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون و، هەر کەسێك شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ، ئەوە بێگومان ئەو تەنیا فەرمان بە قسەی دزێوو کرداری خراپ دەکات و، ئەگەر

بەخششو بەزەیی خوا نەبووایە لەسەرتان، هەرگیز هیچ کامێکتان پاكو چاك (تزكية) نەدەبوون. بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێ چاكو پاکی دەکات و، خوا بیسەری زانایە.

با خاوەن بەخششو دەوڵەمەندانتان سوێند نەخۆن کە هاوکاریی خزمانو نەدارانو کۆچکەرانی ڕێی خوا بکەن و، با ببوورنو چاوپۆشیی بکەن (لە هەڵەو کەموکووڕیی هاوکارییکراوەکان) ئایا حەز ناکەن، کە خواش لێتان ببووریٚ (لە ئەنجامی لێبوردەییو چاوپۆشییتاندا)؟!

وەك دەبینن خوای بەرزو بێهاوتا، دوای ئەوەی شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان لە ئیمانداران قەدەغە دەکات... ئنجا ڕایدەگەیەنێ، کە بەبێ بەخششو بەزەیی خوا، هیچکەس تەزکیە نابێ، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ تەزکیەی دەکات، ئنجا دوای ئەوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە ئەبووبەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) ڕادەگەیەنێ، کە مادام خوا پێداوو هەبوویە، با سوێند نەخوات، کە هاوکاریی خزمانی نەدارو کۆچکەری نەکات، کە مەبەست پێی - وەك تێکڕای توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە – (مسطح بن أثاثة)یە، کە خزمی ئەبووبەکر بووەو، یەکێك بووە لە بەشداربووانی بوختانکردن بە دایکمان عائیشە خوا لە خۆیو بابیو دایکی ڕازی بێ، کە ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، پاش بەشدارییکردنی لە بوختانەکەی عائیشەدا، هاوکارییەکی ماددیی، کە دەیکرد، لێیبڕی، بەڵام دوای هاتنی ئەم ئایەتە، لە قسەکەی خۆی - کە هاوکاریی نەکات - ژیوان بۆوەو گەڕایەوە سەر هاوکارییکردنەکەی[1]!.

لەم ئایەتانەش بەڕوونیی دەفامرێتەوە کە:

شوێنی شەیتان کەوتن، پێچەوانەی ئیمانو تەزکیەی نەفسە، هەروەها سەماحەتو لێبوردەییو دڵگەورەییو چاکەکاریی، مایەی تەزکیەی

(١) بڕوانە: المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (٩٣)، وصحيح البُخَارِيُّ: (٣٨٥٣).

نەفســـە، چـونكـــە خـــوای كـاربەجـــێ لـێـبـــوردنو چاوپـۆشـيـی خــۆی كـــردۆتە بەرهــەمـی چاكەكـاریی‌و چـاوپـۆشـيی‌و لـێـبـورد‌ەيـی، ئەبـووبـەكر (خــوا لــێی ڕازی بێ)، بـەرانـبــەر بـە (مسطح) خــوا لــێی خۆشـبـــێ، ديــاره خـــواش لــه كەسـێك دەبـووریێ، كـه خـاوەنـی نەفـسـێكـی پـاكو چـاك بـێ !

ديـاره، كـه دەشـلـێـيـن: (... تەنـانەت بـەرانبـەر بـە دوژمـــنو نـاحـەزانـيـــش) نـابـێ هـيـچـكـەس ئـەوەی لـێ بفـامـێتـەوە، كـه لـەگـەڵ دۆسـتـايـەتيـــی گـرتـــنو دوژمــنـايـەتيی كردن بـۆ خـوا (الـموالاة والـمعاداة في الله)دا، تيـك دەگـيـرێ !

چـونكـه پێويسـتە ڕق و بوغـزمـان بـەرانبــەر بـە كـوفـرو كــردارو هـەڵـوێسـتی خـراپو زيـانبـەخشـی كـافـران بـێ، نـەك بـەرانبـــەر بـــە خـــودی خـۆيـــان، وەك مـرۆڤ، هەروەها نـــەك بـەرانبـــەر بـــه خەسـڵـەتو كـــردەوەی چـاكو پەسـنديـــان، چـونكـه:

يـــەك: (لـــوط) پـێـغـەمبـــەر عليـــه الصـــلاة والســـلام بـــه گـەلـــه خـراپـەكـــەی دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلۡقَالِينَ ١٦٨ ﴾ الشعراء. واتـه: مـــن ڕقـــم لـــه كـردەوەكـەتـانـــە، يـــانی: خـــودی خـۆتـــان وەك مـرۆڤ نـاتـانـبوغـزێـنـم، بەڵـكـو تەنيـا كـردەوە خـراپـەكـەتـان – كـه نيـربازيـی بوو- دەبوغـزێـنـم.

دوو: كـاتێـك پيـاوێـكـی نـاوداری كـافـر بـەنـاوی (أشـجّ بـن عبـدالقيـس) هـاتـه خـزمـەت پـێـغـەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم)، كـه جـارێ مسـوڵـمـان نـەبوو بـــوو، پێـــی فـــەرموو: {إنَّ فيك خصلتين يُحبُّهما الله: الحلم والأناة}، رواه مسلم[(١)]، واتـه: بێگومـان تـۆ دوو ئـاكارت تـێدان، كـــه خـــوا خۆشـيـدەوێـــن: هـێـديـی‌ومـەنديی‌و لەسەرخۆيـی، ديارە (حِلْـم) پێـــچەوانەی زوو تـووڕەبـــوونو (سرعة الغضب)و، (أناة)يـش پێچەوانەی پـەلـەكـردن (عـجلة)ە.

---

(١) صحيح مسلم: (٢٥).

بەڵێ، خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

ئەوەی لە شەش خاڵی ڕابردوودا گوترا، کۆی ئەو تێبینییو سەرنجانەم بوون، کە لە یازدە ساڵی ڕابردوودا، لەبارەی تەزکیەی نەفسەوە – وێڕای ئەوەی لە بەشەکانی دیکەی کتێبەکەدا باسکراوە- بۆم دروست بوونو، بە پێویستم زانی بە کورتییو گوشراویی بیانخەمە ڕوو، دیارە بابەتی تەزکیەی نەفسیش دەریایەکی بێ بنەو کۆتایی نایەتو، بێجگە لە خاوەنو بەدیهێنەری نەفسیش تبارك وتعالی، هیچکەس دەرکی ڕازو نهێنییە زۆرو زەوەندەکانی نەفس ناکاتو، پەی بە هەموو حاڵو بارەکانی نابات.

ئەڵمانیا – بەرلین

ئێوارەی ڕۆژی جومعە

٢٥ی ربیع الأول ١٤٣٣ هـ

١٧ی شوباطی ٢٠١٢ ز

# دوا قسەم

١/ وشەی (تزكية) لە بەكارهێنانی قورئانو سوننەتدا، چەمكو واتايەكەی زۆر فراوانترە، لە چەمكو واتای بەكارهێنانی عورفییو باوو زاراوەیی (اصطلاحي)، چونكە لە بەكارهێنانی قورئانو سوننەت دا، پاكبوونەوەی ئینسان لە هەموو خراپەیەكو، ڕازاندنەوەی بە هەموو چاكەیەك دەگرێتەوە، بەبێ سنووردارکردن (تحديد) بە لایەنو بواری ڕووحییو مەعنەوییەوە:

أ- ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾﴾الأعلى.

ب- ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾﴾ الشمس.

ج- ﴿... وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفۡسِهِۦۚ .. ﴿١٨﴾﴾ فاطر.

بەر لە هەر شتێك، پاكبوونەوە لە كوفرو شیركو، ڕازاندنەوە بە ئیمانو خوا بەیەكگرتن دەگرێتەوە، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ سەرفرازیی ڕەها (الفلاح المطلق)ی كردۆتە بەرهەمو ئەنجامی، كە بێگومان سەرفرازییو بەختەوەریی ڕەها، بەس شایستەی پاكییو چاكیی ڕەهایە، كە مانای بەرفراوانی وشەی (تزكية)یە، نەك پاكییو چاكیی مەعنەوییو ئەخلاقیی، كە ماناو چەمكی سنووردار (محدود)و زاراوەییەتی !

٢/ بابەت (موضوع)ی تەزكیەی نەفس، بە هەردووك چەمكو واتا قورئانییو زاراوەییەكەی، بەسەرهاتێكە سەرەتا (بداية)ی هەیە، بەڵام كۆتایی (نهاية) نا ! كەواتە وامەزانە بەم كتێبە لە چاپی پێنجەمیدا، كە زۆری لێ زیادكراوەو گۆڕانكارییەكی ڕیشەیی تێدا كراوە، قسەو باسمان لەمەڕ تەزكیەوە تەواو بووە،

نەخێر، تەواو نەبووەو، تەواویش نابێ، بەڵام ئەوەندەش بزانە ئەم کتێبە شیلەو پوختەی موتاڵاو لێکۆڵینەوەکانمو داوایین تێبینییو سەرەنجامەکانمو، دەرسو پەندو بەرهەمەکانی ئەزموونی تایبەتیی خۆیشمە!

**٣/** تێکڕای پسپۆڕو شارەزایانی بواری تەزکیەو عیرفانو تەصەووف، لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەم زانیارییو شارەزاییو تەزکیەو تەصەووفە، هەرچەندە دەگونجێ لە کتێباندا بخوێنرێتەوەو، لە کۆڕو مەجلیساندا گوێ لەباسو خواسەکانی بگیرێ، بەڵام مەحاڵە بە کردەوەو ڕەفتارو جێبەجێ کردن (تطبيق) نەبێ، وەك پێویست فام بکرێو وەربگیرێ!! هەر بۆیەش ڕستەی: (مَنْ ذاقَ عَرَفَ)، ئەوەی چێژتی دەزانێ، بەسەرزاری هەر پسپۆڕو چاوساغێکی ئەو مەیدانەوەیە.

کەواتە:

تۆش وامەزانە، کە بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە، کە دەربارەی تەزکیە نووسراوە، تەزکیە دەبی !! نەخێر نەخێر، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدەی زانینەکەت بگۆڕی بۆ توانینو، حاڵی بوونەکەت لەخۆتدا بکەیە حاڵ، ئەوجار شتێك بە شتێك دەکەیو، خوا پشتیوان بێ بە ئامانج دەگەی.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

مێژووی دواپێداچوونەوە بۆ چاپی پێنجەم:

٣ی جمادي الثانية ١٤٣٣ك

٢٠١٢/٤/٢٤

هەولێر

خوێنەری سەنگین!

لەم بەشی نۆیەمەدا باسی بیرۆکە (فکرة) یەکی یەکجار هەستیار دەکەین، کە بەڕای بەندە هۆکارێکی کاریگەری بەلاڕێداچوون و سەرگەردان بوونی خەڵکێکی زۆری بواری تەصەووف و ڕێبازەکانی، ئەو بیرۆکەیە، کە بریتیە لە: (یەکبوویی – وحدة الوجود).

هەرچەندە ژمارەیەک لە زانایانیش ویستوویانە لەڕێی تەئویلکردن و پینەو پەڕۆوە، بەرگریی لەو بیرۆکەیەو هەڵگرانی و تەبەننییکەرانی بکەن، یان خۆیان و خەڵکی بەوە تۆمەتبار بکەن. کە گوایە عەقڵیان توانای وەخۆگرتن (إستیعاب) ئەو بیرۆکەیەی نییە، ئەگەرنا لە ئەسڵ دا بیرۆکەکە هیچ عەیبی نییە!

بەڵام لەڕاستییدا هەر بەرگرییەک لەو بیرۆکەیە بکرێ، کە ڕاست پێچەوانەو دژی عەقڵ و زگماک و وەحییە، شتێکی بێ جێیەو خاوەنەکەی پێی لەکەدار بوە و دەبێ.

ئنجا خوا یاربێ، ئێمە لە حەوت تەوەردا باسی ئەو بیرۆکەیە دەکەین:

**١. پێناسەی ئەو بیرۆکەیە.**

**٢. هەڵگرانی ئەو بیرۆکەیە.**

**٣. مەترسیی ئەو بیرۆکەیەو دەرهاویشتە خراپەکانی.**

**٤. هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی یەکبوویی.**

**٥. (إبن عربي)و لافلێدانی زل زلی بێ بەڵگە.**

**٦. پوختەی قسان لەبارەی بیرۆکەی (یەکبوویی – وحدة الوجود)ەوە.**

**٧. ڕای بەندە لەبارەی بیرۆکەی یەکبووییەوە.**

## تەوەری یەکەم:

### پێناسەی یەکبوویی (وحدة الوجود):

بیرۆکەی یەکبوویی (وحدة الوجود) جەوهەرو کاکڵەکەی ئەوەیە کە بوون (وجود) بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو (خالق و مخلوق)ەوە، یەکەو، لەیەک جیانین و، وشەی (الحُلول: چوونەتێ) و (الإتحاد: یەکگرتن) هەڵەن بۆ خوای بەدیهێنەرو گەردوونی بەدیهێنراو (الکون المخلوق) بەکاربێن، هەروەها بیرۆکەی ناوبراو پێی وایە: کە گەردوون (الکون)یش، وەک خوا لەمێژینەو بێ سەرەتایە!

**یەکەم:** با سەرەتا لەوبارەوە سەرنجی چەند قسەیەکی (إبن عربي) بدەین، کە بە داهێنەری دیارو باوی ئەو بیرۆکەیە لە نێو موسوڵماناندا دادەنرێ:

١. لەسەرەتای کتێبە ناودارەکەی (الفتوحات المكّية)دا گوتوویەتی[١]:

(...وأَنَّ حِجَابَ العِزَّةِ دُونَ سُبُحَاتِهِ مُسْدَلٌ .وَبَابُ الوُقُوفِ عَلَى مَعْرِفَةِ ذَاتِهِ مُقْفَلٌ، إن خاطب عبده، فهو المُسمِعُ السميع. وَإن فعل مَا أَمر بِفِعْلِهِ، فَهُوَ المطاع الْمُطِيع، وَلما حَيَّرتني هَذِهِ الْحَقِيقَة، أنشدت على حكم الطَّرِيقَة للخليقة:

الرَّبُّ حَقٌّ وَالْعَبْدُ حَقٌّ ... أَلَيْتَ شِعْرِي مَنْ الْمُكَلَّفُ؟

إنْ قُلْت: عَبْدٌ، فَذَاكَ مَيِّتٌ ... أَوْ قُلْت: رَبٌّ أَنَّى يُكَلَّفُ؟

واتە: هەروەها پەردەی عیززەت بەسەر پڕشنگەکانی (ڕووی) دادراون و، دەرگای پەیبردن بە ناسینی خودی داخراوە، ئەگەر بەندەکەی بدوێنێ، بۆ خۆیەتی پێبیسەرو بیسەر، ئەگەر ئەوەش بکات کە فەرمانی پێکردوە، بەس خۆیەتی فەرمانبەریی بۆ کراوو فەرمانبەر!

---

[١] الفتوحات المكية في معرفة الأسرار المالكية والملكية. ج١ ص٣٥ ط١ ١٩٩٨، دار إحياء التراث العربي.

ئنجا کاتێک ئەم ڕاستییە سەراسیمەی کردم، بەپێی حوکمی ڕێباز بۆ خەڵکی گوتم:

پەروەردگار هەقەو بەندەش هەقە       بریا زانیبام کێ ئەرکدارە؟

ئەگەر بڵێی: بەندەیە، ئەو مردوویە، یان بڵێی: پەروەردگارە، ئنجا چۆن ئەو ئەرکدار دەکرێ!

٢- دیسان هەر لەبارەی یەکبوونی بەدیهێنەرو بەدیهێنراوەوە، گوتوویەتی:

(سبحان من خلق الأشياء وهو عينها).[١]

واتە: پاکیی بۆ ئەو کەسەی شتەکانی هێناونە دی و، خۆیشی خودی ئەوانە.

٣- هەروەها گوتوویەتی:

(فما من موجودٍ إلاّ الله، ولا يعرف الله إلا الله، ومن هذه الحقيقة قال من قال: أنا الله، وحققت أنّي عين مَنْ هويته).[٢]

واتە: جگە لە خوا هیچ هەبوونێک نییەو، بەس خوا خوا دەناسێ و، لەم ڕاستییەوەیە، ئەو کەسەی گوتوویەتی: من خوام، منیش ساغم کردۆتەوە کە خودی ئەوکەسەم کە خۆشمویستوە!

٤- هەروەها لەبارەی بێ سەرەتابوونی گەردوونەوە" گوتوویەتی:

(فَعَدمُ العالم لم يكن في وقتٍ، لكن الوهم يتخيل أن بين وجود الحق ووجود الخلق امتداداً).[٣]

واتە: هیچ کات نەبووە گەردوون نەبێ، بەڵام وەهم پێی وایە لە نێوان بوونی هەق(خوا) و بوونی دروستکراودا، بۆشاییەک هەبووە.

---

(١) الفتوحات المكية. ج٣ ص٥١٣.

(٢) التصوف ص١٧٢، لە: (الروحية عند محي الدين بن عربي) ص٢٤، دكتور علي عبدالجليل راضي.

(٣) إنشاء الدوائر، ص١٧ (الروحية عند محي الدين بن عربي) د.علي عبدالجليل راضي. ص٢٨ ط١٩٧٥ م/مكتبة النهضة المصرية.

**دووەم**: هەروەها بـا سـەرنجی چەنـد قسـەیەکی (العلامـة عبـدالعلي بحـر العلـوم اللكنـوي)یش بـدەین کە لەسـاڵی (١٢٢٥ک)دا مـردووە، بە ڕوونکـەرەوەی بیردۆزەی (إبن عربي) لە بارەی (یەکبوویی) یەوە دادەنرێ:

(جميعُ ما سوى الله تعالى، عالم الشؤون والتعيُّنات، وجميـع الشـؤون والتعينـات مظاهره، هو ظاهرٌ فيها وسارٍ، وليس هذا السريان هو ما يقول به أصحاب (الحلول) أو يعتقده أهل (الإتحاد)، بـلْ إنَّ هـذا السَّريان كَسَرَيان عـدد الواحـد في الأعـداد، وجميع الأعداد ليست إلا واحدات، فلا يظهر في العالم إلا عين واحدة أو ذات واحـدة، وهي التي ظهرت من ذات الله القـدوس، فَتَجَلَّـى ذات الله تعـالى في هـذه الكثـرة، فالله هو الأول والآخر والظاهر والباطن، تعالى عن الشركاء والأنداد)[1].

واتە: هەمـــوو شـــتێک جـــگە لە خـــوای بەرز، جیهـــانی کارەکـــان و دیارییکراوەکـــانەو، تێکـــڕای کارەکـــان و دیارییکراوەکـــان ڕواڵەتـــی ویـــن (درەوشێنەرەوەکانی خوان)و، ئەو تێیاندا دەرکەوتـوو و ڕۆیشتوویە، بەڵام ئەو پێدا بڵاوبـوونەوەیە ئەوە نییـە کە خاوەنـانی هـاتنە نێـو (الحلـول) دەیڵـێن، یـان خاوەنانی یەکگرتن (إتحاد) بڕوایان پێیەتی، بەڵکـو وەک پێدا بڵاو بـوونەوەی ژمارەی یەکە، بە ژماراندا و، تێکڕای ژمارەکانیش بەس یەکەکانن.

بۆیە لە دنیادا تەنیا چاوێک یان خودێک دەرکەوتـوە، کەبریتیە لەوەی لە خـودی پـاکی خـوادا دەرکەوتـوە، ئیـدی خـودی خـوای بەرز، لەو زۆرانەدا دەدرەوشێتەوە، ئنجا خوا یەکەمین و دوامـین و، ئاشکراو پەنهانە، بەرزە لەوەی هاوبەشی هەبن، یان وێنەو هاوتای هەبن.

هەڵبەتە ئەو کەسـەی دواتـر لە هەمـوو کەس زیـاتر بـوو بە ئـاڵا هەڵگـری بیرۆکەی: یەکبـوویی (وحدة الوجـود) بریتـی بـوو لە: (محـي الـدين بـن عربـي ٥٦٠ – ٦٣٨ هــ) بەتـــایبەتی لە هەردوو کتێبـــی: (الفتوحـــات المكيـــة) و(فصوص الحكم)ی دا.

---

[1] وحدة الوجود، ص٢٩، عن [رجال الفكر والدعوة في الإسلام] ج٣ ص٢٦٧، السيد أبي الحسن علي الحسني الندوي.

**سێیەم:** یەکێ دیکە لە زانایان بەمجۆرە پێناسەی (یەکبوویی) دەکات:

﴿ وحدة الوجود عقيدة إلحادية هندية كما قال بها فلاسفة اليونان، وتبعهم عليها بعض المذاهب الفلسفية المعاصرة وغلاة الصوفية، تقوم هذه المقولة على الوحدة الذاتية لجميع الأشياء، مع تعدُّد صورها في الظاهر، فالعالم بما فيه إنما هو التجلِّي الإلهي الدائم الذي كان ولايزال، فالموجود واحدٌ وهو الله واجب الوجود الأزلي، عين ( المخلوقات) فكل شيء هو الله، واختلاف الموجودات هو اختلاف في الصوروالصفات مع توحُّدٍ في الذات..﴾.[1]

واتە: یەکبوویی بڕوایەکی ئیلحادیی هیندییە، وەک هەندێک لە فەیلەسووفە دێرینەکانی یۆنان تەبەنییان کردووە، هەندێک فەلسەفەی هاوچەرخ و صۆفییە تێپەڕێنەرەکان شوێنیان کەوتوون، ئەو بیرۆکەیە دەڵێ: هەموو شتەکان یەک خودن، هەرچەندە وێنە ڕواڵەتییەکانیان جیان، جیهان هەمووی و هەرچی تێیدایە، درەوشانەوەی بەردەوام و نەپساوەی خوایە، بوون (وجود) یەکە، کە خوای بوون پێویستی بێ سەرەتایەو، خودی دروستکراوەکانە، هەموو شتێک خوایەو جیاوازیی دروستکراوەکان، تەنیا لە جیاوازیی دیمەن و سیفەتەکان دایە، وێڕای یەکبوون لە خود دا.



(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، د.مانع بن عبدالله الجهني، ج٢ ص ١٢٦٨.

### تەوەری دووەم:
### هەڵگرانی ئەو بیرۆکەیە:

هەر لە زووەوە هەندێک لە ئەهلی تەصەووف -کە ڕەنگە لە حاڵەتی نائاسایی دا بووبن- هەندێک قسەیان لێ گێڕدراونەوە، بۆنی یەکبوویی (وحدة الوجود)یان لێدێ:

بۆ نموونە:

١- أبو يزيد البسطامي: لێی گێڕراوەتەوە،کە گوتوویەتی: (سبحاني ما أعظم شأني) پاکیی بۆ من چەندە پێگەم مەزنە!

هەروەها گوایەگوتوویەتی: (ليس في جُبَّتي إلاّ الله) لە نێو جوببەکەم دا، بەس خوا هەیە!

٢- (الحسين بن منصور الحلاج) زۆر باوە، کە لێی گێڕراوەتەوە، هاواری کردوە:(أنا الحق) منم هەق![1]

٣- بەڵام دواتر(ابن عربي) ئەو بیرۆکەیەی زۆر بە قووڵیی تەبەننیی کردوەو خۆی بۆ تەرخانکردو، وای لێهات دوای وی، ئەو بیرۆکەیە، هەر بەناوی ئەوەوە دەناسراو، لە هەردووک کتێبە ناودارەکەی خۆی:

أ - (الفتوحات المكية) و، ب - (فُصوص الحكم)دا، زۆری قسە لەبارەوە کردن.

ئنجا دوای خۆیشی، چەند کەسێک زۆریان ڕەواج بەو بیرۆکەیەدا، بەتایبەت:

١ - إبن سبعين.
٢ - صدرالدين القونوي.
٣ - ألبَلياني.
٤ - ألتلمساني.

---

(١) (رجال الفكر والدعوة..) ج٣ ص٢٦٥.

کە (إبن تيمية) لەبارەی (التلمساني)یەوە گوتوویەتی[١]:

(كان يطبق المذهب الوجودي عملياً، فيستَحِلُّ جميع المحرّمات، لأنه إذا كان الوجود واحداً، فلم التفريق بين الحلال والحرام؟).

واتە: ئەو بیرۆکەیەی بەکردەوە جێبەجێ دەکردو، تێکڕای قەدەغەکراوەکانی بەحەڵاڵ دادەنان، چونکە مادام بوون یەکبێ، بۆچی حەڵاڵ و حەرام لێک جیابکرێتەوە ؟

هەروەها (ابن تيمية) لێی گێڕراوەتەوە، کە[٢] لەبارەی(التلمسانی)یەوە گوتوویەتی:

(وحدَّثني من كان معه: فمررت على كلب أجرب ميت بالطريق، فقلت له: هذا أيضاً هو ذات الله؟ فقال: وهل ثمَّ شيء خارج عنها؟ نعم الجميع في ذاته).

واتە: کەسێک بۆی گێڕامەوە(گوتی): لەڕێیەدا بەلای سەگێکی تۆپیوی گەڕدا ڕەتبووم، ئنجا پێمگوت: ئەمەش خودی خوایە؟

گوتی: ئەدی هیچ شتێک هەیە لە خودی وی بەدەربێ؟

بەڵێ، هەمووی لە خودی وی دایە!

شایانی باسیشە: ئێمە تەوەری پێنجەممان تەرخانکردووە، بۆ بەرپەرچدانەوەی بەشێک لە لافلێدانەکان(إدعاءات)ی (إبن عربي).



---

[١] الفرقان بين الحق والباطل ص١٤٥ لە (رجال الفكر والدعوة..) ج٣ ص ٢٧١.

[٢] هەمان سەرچاوە.

## تەوەری سێیەم:

## مەترسیی ئەو بیرۆکەیەو دەرهاویشتە خراپەکانی:

ئەو بیرۆکەیە وێڕای هەڵەبوونی لە خودی خۆیداو دژوەستانی لەگەڵ: عەقڵ و زگماک و وەحیی و واقیعدا، مەترسییەکی یەکجار گەورەی لەسەر کۆی دینداریی و دنیاداریی هەیەو، دەرهاویشتەی یەکجار پیس و خراپی هەن، چونکە:

ئەگەر بوون (بەدیهێنەرو بەدیهێنراو - الخالق والخلق - ) هەمووی یەک شت بێ: خوا پەرستیی و بتپەرستیی و، ئیمان و کوفرو، طاعەت و سەرپێچیی و، ڕەوشت و بێ ڕەوشتیی و، حەڵاڵ و حەڕام و، چاک و خراپ و... هتد، هەموویان یەکسان دەبنەوەو جیاوازییان نامێنێ!

هەروەک سەرجەم ئەوانەی لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا ڕاستیان کردوەو جێبەجێیان کردوە، وایانکردوە، وەک پێشتر چەند نموونەیەکمان لە زاری (إبن تيمية)وە، لەبارەی (التلمساني)یەوە هێنانەوە، ئەمەش چەند دەرهاویشتەیەکی زۆر خراپی بیرۆکەی یەکبوویی:

**یەك:** (إبن تيمية) لەبارەی (التلمساني)یەوە گوتوویەتی:

(وَحَدَّثَنِي الثِّقَةُ أَنَّهُ قَرَأَ عَلَيْهِ " فُصُوصَ الْحِكَمِ " لِابْنِ عَرَبِيِّ وَكَانَ يَظُنُّهُ مِنْ كَلَامِ أَوْلِيَاءِ اللَّهِ الْعَارِفِينَ، فَلَمَّا قَرَأَهُ رَآهُ يُخَالِفُ الْقُرْآنَ، قَالَ: فَقُلْت لَهُ: هَذَا الْكَلَامُ يُخَالِفُ الْقُرْآنَ! فَقَالَ: الْقُرْآنُ كُلُّهُ شِرْكٌ، وَإِنَّمَا التَّوْحِيدُ فِي كَلَامِنَا، وَكَانَ يَقُولُ: ثَبَتَ عِنْدَنَا فِي الْكَشْفِ مَا يُخَالِفُ صَرِيحَ الْمَعْقُولِ).[1]

واتە: بابایەکی متمانە پێکراو بۆی باسکردم، کە کتێبی (فصوص الحكم)ی (ابن عربي) بەسەردا خوێندەوە - بەسەر (التلمساني)دا- کە وایدەزانی قسەی

---

[1] الفرقان بين الحق والباطل ص١٤٥. لە (رجال الفكر والدعوة..) ج٣ ص٢٧١.

دۆستەکانی خواو خواناسانە، ئنجا کاتێک دیتی دژی قورئانە، گوتی: پێمگوت: ئەو قسەیە پێچەوانەی قورئانە!

ئەویش گوتی: قورئان هەمووی شیرکە، خوا بەیەکگرتن لە قسەی ئێمەدایە!

هەروەها دەیگوت: شتی وامان بە کەشف بۆ چەسپاوە، کە دژو پێچەوانەی ڕاشکاوی عەقڵە!

**دوو**: دیسان هەر ئەو هێناویەتی:

(وَقِيلَ لبعضهم: إِذَا كَانَ الْوُجُودُ وَاحِدًا، فَلِمَ كَانَتْ الزَّوْجَةُ حَلالا وَالْأُمُّ حَرَامًا؟ فَقَالَ: الْكُلُّ عِنْدَنَا واحدٌ، وَلَكِنْ هَؤُلَاءِ الْمَحْجُوبُونَ قَالُوا: حَرَامٌ، فَقُلْنَا: حَرَامٌ عَلَيْكُمْ).[1]

واتە: بەیەکیان گوترا - لەهەڵگرانی بیرۆکەی: (یەکبوویی - وحدة الوجود)- مادام بوون(وجود) یەک بێ، بۆچی ژن حەڵاڵە و دایک حەڕامە؟!

گوتی: لەلای ئێمە هەمووی یەکە، بەڵام ئەو پۆشراوانە - بە پەردەی نەزانین- گوتیان: حەڕامە، ئێمەش گوتمان: لێتان حەڕامە!

**سێ**: (الشيخ جنيد البغدادي)، کە یەکێک بووە لە پێشەوایانی ڕێپێشاندان (أئمة الهدى)و (إبن تيمية) دەڵێ: (قدس الله روحه) کاتێک لەبارەی خوا بەیەکگرتن (توحيد الله)ەوە پرسیاری لێکراوە، گوتوویەتی:

(التوحيد إفراد الحدوث عن القدم)، یانی: خوا بەیەکگرتن، تاککردنەوەی پەیدابوویە لە بێ سەرەتایی، واتە: خوا بەیەکگرتن بریتییە لە یەک جیاکردنەوەی بەدیهێنەرو بەدیهێنراو(الخالق والمخلوق).

کەچی (إبن عربي) ئەوە لە (جنيد) بە ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ:

(يَا جنيد! هَلْ يُمَيِّزُ بَيْنَ الْمُحْدَثِ وَالْقَدِيمِ إلَّا مَنْ يَكُونُ غَيْرَهُمَا؟).[2]

واتە: ئەی جونەید! ئایا کێ پەیداکراوو بێ سەرەتا لەیەک جیا دەکاتەوە، مەگەر جیابێ لێیان ؟

---

(١) الرد الأقوم على فصوص الحكم. لابن تيمية. ص٤٢ . له (رجال الفكر والدعوة..) ج٣ ص٧٢٣.

(٢) مجموعة الفتاوى، ج ١١ ص ١٣٤ لابن تيمية.

کە بێگومـان ئەم قسـەیە پـووچەو، ڕەخـنەکەی (إبـن عربـي) لە (جنیـد) بـێ بنەمایـە، چـونکە مەرجـی لەیەک جیاکەرەوەی دووشـتان بە زانیـاریی و، قسـە ئەوە نییە ،کە شتێکی سێیەم بێ، چونکە هەمـوو کەس خۆی لەخەڵکی دیکە لەیەک جیـا دەکـاتەوە، شـتێکی سـێیەمیش نـییە، بەنـدەش دەزانـێ بەنـدەیەو، خـۆی و خـوای بەدیهێـنەر لەیەک جیـا دەکـاتەوە، خـواش خـۆی و دروسـتکراوەکانی لەیەک جیـا دەکاتەوە.[1]

**چوار**: هەروەها (إبن عربي( لەکتێبی (فصوص الحكم)دا دەڵێ:

(ومـن أسمائه الحسنى (العلي) على من؟ وما ثمّ إلاّ هو، وعـن مـاذا؟ ومـا هـو إلاّ هـو، فعلوه لنفسه وهو عين الموجودات، فالمسمى محدثات هي العلية لذاته وليست إلاّ هو... هـو عين مابطن، وهو عين ماظهر، وما ثم يراه غيره، وما ثم من ينطق عنه سواه، وهو المسمى أبو سعيد الخرّاز، وغير ذلك من الأسماء المحدثات).[2]

واتە: لە ناوە پەسەندەکانی خوا بریتیە لە (بەرز)، بەسەرکێدا بەرزە؟

کە جگە لە خۆی هیچ شتێکی دیکە نییە؟

هەروەها لەچی بەرزو باڵایە، کە جگە خۆی هیچ کەس و شتێک نییە؟

ئنجـا بەرزیـیەکەی بـۆ خـۆیەتی و ئەو خـودی بوونەوەرەکانـە، نـاوبراوەکە پەیـداکراوەکانن و، ئەوان لە خـودی خۆیانـدا بەرزن و، جـگە لەوی هـیچ شـتێک نییە...

ئەو خودی پەنهانەو خودی ئاشکرایەو، جگە لە خۆی هیچکەس نییە ببینـێ، هەروەها جگە لە خۆی، هیچکەس بەناویەوە نادوێ، هەر ئەویشە ناوی (أبو سعید الخراز)ەو، جگە لەویش لەناوە پەیداکراوەکان.

هەڵـبەتە ئەو قسـانەی(إبن عربـي) زۆر زەق و ڕوونـن، کە خـواو گەردوون، بەدیهێنەرو بەدیهێنراو(الخالق والخلق)بەیەک دەزانێ.

---

(١) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.
(٢) سەرچاوەی پێشوو، ج١١، ص٣٥.

بەڵام ئەو قسانە، وێڕای کوفر لێچۆڕانیان، نەفامیی و نەزانیییشیان لێ دەتکێ، چونکە هەموو عاقڵێک خۆی و دروستکراوەکانی دیکە، لەیەک جیا دەکاتەوەو، دەزانێ خۆی فلانکەس و فلان شتە نییەو، فلانکەس و فلان شتەش ئەو نین!

لێرەدا بۆ سەلماندنی بێ بنەمایی بیرۆکەی(یەکبوویی)، تەنیا عەقڵێکی ساغ و بیرکردنەوەیەکی ڕاستمان دەوێ، ئنجا با سەرنجی ئەم دوو قسەیەش بدەین:

**یەک:** شێخێک بە موریدێکی خۆی گوت: هەرکەس گوتی: لە گەردووندا، جگە لە خوا هەیە، درۆی کردووە.

موریدەکەش گوتی: ئەو کەسەی درۆ دەکات کێیە؟!

**دوو:** بە یەکێکیان گوت: گەردوون هەمووی دەرکەوتوو و ڕواڵەتەکان (مظاهر)ە، ئەویش گوتی: ئایا ڕواڵەتەکان خودی ئاشکرا (ظاهر)ن - واتە خوا- یان لێی جیان؟

یانی: ئەگەر لێی جیاین، کەواتە: هەموو شتێک خوا نییەو، ئەگەر یەکیش بن کەواتە: چۆن دەڵێن: گەردوون ڕواڵەتە دەرکەوتووەکانی خوایە؟![1]

شایانی باسیشە لەبەردەم ئەو جۆرە قسانەی (إبن عربي)دا، زانایان بەگشتیی، دوو جۆرە هەڵوێستیان هەن:

**یەکەم:** زۆربەیان ڕەخنەی لێدەگرن و، ئەو قسانەی لەسەر حیساب دەکەن و، بەپێی ئەوە حوکمی دەدەن.

**دووەم:** بەشێکیشیان یان بۆی پینەو پەڕۆو تەئویل دەکەن، یان دەڵێن:

ئەو قسانەی پێچەوانەی قورئان و سوننەتن، هی خۆی نین وڕەگەڵ کتێب و قسەکانی خراون، بۆیەش ڕەخنەیان لەوانە گرتووە، کە بە هۆی ئەو قسانەیەوە، بە کافری دادەنێن و، لەو بارەوەش ئاماژە بە دوو کتێبان دەکەین:

١- (تنبيه الغبي بتبرئة ابن عربي، للسيوطي).

٢- (تنبيه الغبي إلى تكفير ابن عربي، لبرهان الدين البقاعي).

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج١١ ص٣٥.

پێشم وایە: قسەو هەڵوێستی (إبن تیمیة) لەو بارەوە میانجیی و باشە، چونکە (إبن عربي)لە (الفتوحات المکیة)دا، قسەی ڕێک و شەرعییانەی زۆرن، بەتایبەت لەبواری حوکمە شەرعییەکاندا.[١]

(إبن تیمیة) لەبارەی (إبن عربي)یەوە گوتوویەتی:

(لَكِنَّ ابْنَ عَرَبِيّ أَقْرَبُهُمْ إلَى الْإِسْلَامِ وَأَحْسَنُ كَلَامًا فِي مَوَاضِعَ كَثِيرَةٍ، فَإِنَّهُ يُفَرِّقُ بَيْنَ الْمَظَاهِرِ وَالظَّاهِرِ، فَيُقِرُّ الْأَمْرَ وَالنَّهْيَ وَالشَّرَائِعَ عَلَى مَا هِيَ عَلَيْهِ، وَيَأْمُرُ بِالسُّلُوكِ بِكَثِيرٍ مِمَّا يأمُر بِهِ الْمَشَايِخُ مِنْ الْأَخْلَاقِ وَالْعِبَادَاتِ...)[٢]

واتە: بەڵام (إبن عربي) لە هەموویان لە ئیسلامەوە نیزیکترەو، لە زۆر شوێنان قسەکانیشی باشترن، چونکە ڕواڵەتەکان و ئاشکرا، لەیەک جیا دەکاتەوە و، دان بە فەرمان و قەدەغەدا دێنێ و، بەرنامەکان وەک خۆیان دەسەلمێنێ و، فەرمانیش بە ڕەچاوکردنی زۆرێک لەوەی ئوستادەکان فەرمانی پێدەکەن، لە ڕەوشت و پەرستنەکان، دەکات...

لە کۆتایی قسەکردنیشیدا لەبارەیەوە، گوتوویەتی:

﴿وَاَللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا مَاتَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ، وَاَللَّهُ يَغْفِرُ لِجَمِيعِ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ الْأَحْيَاءِ مِنْهُمْ وَالْأَمْوَاتِ {رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ}﴾.[٣]

واتە: خواش زاناترە، پیاوەکە لەسەر چی مردوە! خواش لە تێکڕای مسوڵمانانی پیاوو ئافرەت و، بڕوادارانی پیاوو ئافرەت ببووڕێ، بە زیندوو و مردوویانەوە، {پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەوبرایانەمان ببوورە کە بە ئیمانەوە پێشمان کەوتوون و، پەروەردگارمان! کینەمان مەخە دڵەوە بەرانبەر بە بڕواداران، بێگومان تۆی مهیرەبانی بە بەزەیی}.

---

(١) بڕوانە: (الفتوحات المکیة) ج١ ص ٤٠٥ – ٩٠٣. کە شەش (باب)ی (٦٧ – ٧٢)ی بۆ شایەتمان و نوێژو زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج و عومرە، تەرخان کردوون.

(٢) جلاء العینین، ص٥٨.

(٣) جلاء العینین، ص ٥٨.

## تەوەرەی چوارەم:
## هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی یەکبوویی:

ژمارەیەکی زۆر لە زاناو پێشەوایان بەرپەرچی بیرۆکەی یەکبوویی (وحدة الوجود)یان داوەتەوە:

١ - یەکەم: ( إبن تيمية/ ٦٦١ - ٧٢٨هـ).

٢ - یەکی دیکە لەوانە: (علاء الدولة السمناني/ ٦٥٩ - ٧٣٦ هـ).

٣ - یەکی دیکە لەوانە: (الإمام شرف الدين المنيري/ ٧٨٢ هـ)، کە لەو بارەوە گوتوویەتی:

(إن ما يظن وحدة الوجود وفناء كل موجود - سوى واجب الوجود - وعدمه عَدْماً كاملاً، هو - في واقع الأمر- ليس إلاّ أفول الموجودات إزاء الوجود الحقيقي وغروبها وانقهارها، كما يخبو ضوء النجم وينطمس إزاء ضوء الشمس الوهاج، وتصبح الذرات كأنها لا حقيقة لها ولا وجود)[1].

واتە: ئەوەی وا دەزانرێ (یەکبوویی)یەو، لاچوون و نەمانی سەرجەم دروستکراوەکانە، تەنیا خەفەبوون و دیارنەمانی دروستکراوەکانە لە بەرانبەر بوونی ڕاستەقینەداو، ئاوابوون و کوژانەوەیانە، وەک چۆن تیشکی ئەستێران خەفە دەبێ و نامێنێ، لە بەرانبەر تیشکی پڕشنگداری خۆرداو، گەردیلەکانی وایان لێدێ، کە هیچ چییەت و بوونیان نەبێ.

دوایی (شرف الدين المنيري) لە دوو ڕستەی کورتدا، بیرۆکەکەی پوخت دەکاتەوەو دەڵێ: (عَدمُ الأشياء وفناؤها شيء، وعدم رؤيتها شيء آخر).

واتە: نەبوونی شتەکان و فەوتانیان شتێکەو، نەدیتنیشیان شتێکی دیکەیە.

---

(١) الرسالة الأولى من مكتوبات (سه صدى)، له: (رجال الفكر والدعوة) ج٣ ص٢٧٦.

٤ - یەکێ دیکە لەو زاناو پێشەوایانەی بەرپەرچی بیرۆکەی [یەکبوویی - وحدة الوجود]یان داوەتەوە بریتییە لە:

(السيد أحمد السرهندي) ناسراو بە (الإمام الرباني) [٩٧١ - ١٠٣٤هـ].

کە لەو بارەوە لە (المكتوبات)ەکەیدا قسەو باسی زۆری هەن، بۆ نموونە، دەڵێ:

[إن الله الأحد القدوس لايَتَّخِذُ بشيء (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) الشورى ١١، والعالم مُتَّسِمٌ بالحدوث والنقص والمحدودية، فكيف يمكن أن يكون ما لا يوصف بالكيف والكم، عين أو مثل ما يوصف بالكيف والكم؟ وكيف يقال للواجب إنه عين الممكنات؟ ولن يكون القديم عين الحادث، ولا ممتنع العدم عين جائز العدم، وانقلاب الحقائق مستحيلٌ – عقلاً وشرعاً - .

ولنضرب مثالاً نشرح ذلك أكثر من ذي قبل:

أراد عالم بارع يجمع بين جميع العلوم والفنون، أن يُظْهِرَ كمالَهُ وكفاءاته المتنوعة الكثيرة، ويُعْلِن فضائله ومحاسنه الخفية على مشاهد الناس، فأبدع حروفاً وأصواتاً ليظهر كمالاته المخفية في مرآة هذه الحروف والأصوات، فلا يمكن – في هذه الحال – أن يقال: إن هذه الحروف والأصوات التي هي مظهر هذه المحاسن المستورة، ومرآة الكمال المكنون، إنما هي عين هذه المحاسن والكمال، أو أنها محيطة بها إحاطة كاملة، أو أنها قريبة منها، أو معها معية ذاتية وقرباً ذاتياً، بل إن بينها من النسبة ما بين الدال والمدلول عليه، فليست هذه الحروف والأصوات إلاَّ دليلاً على هذا الكمال، وما نشأت من النسبة بينها، إنما هي بفعل الوهم والخيال][١].

واتە: بێگومان خوای تاکی پاک، لەگەڵ هیچ شتێکدا یەکناگرێ: (هیچ شتێک وەک وێنەی وی نییە) جیهانیش بە پەیدا کردن و ناتەواویی و سنووردارییی ناسراوە، ئێمە چۆن زاتێک کە بە چۆن و چەند، وەسف ناکرێ، خودی یان وێنەی ئەو شتەبێ کە بە، چۆن و چەند، وەسف دەکرێ؟

یان چۆن بە پێویست (واجب) دەگوترێ: خودی گونجاو (ممكن)ەکانە؟

---

(١) الرسالة رقم: ٣١، المجموعة الأولى عن رجال الفكر والدعوة، ج٣ ص٢٨، ٨١.

هەرگیزیش بێ سەرەتا نابێتە خودی پەیدابوو، هەروەها نەبوون مەحاڵ، هەرگیز نابێتە نەبوون ڕەوا، هەڵگەڕانەوەی ڕاستییەکان لە ڕووی عەقڵ و شەرعەوە مەحاڵە.

ئنجا با وێنەیەک بێنینەوە،کە ئەو بابەتە لە پێشوو زیاتر ڕوون بکەینەوە:

زانایەکی هەڵکەوتوو، کە سەرجەم زانست و هونەرەکانی کۆکردبوونەوە، ویستی: تێرو تەواویی و شایستەییە زۆرەکانی دەربخات و، چاکیی و جوانییە شێراوەکانی بۆ خەڵکی بخاتە ڕوو، ئیدی هەڵسا چەندان پیت و دەنگی داهێنان، تاکو تەواوییەکانی خۆی لە ئاوێنەی ئەو پیت و دەنگانەدا، پێیشان بدات، بێگومان لەو حاڵەیش دا ناگونجێ بگوترێ:

ئەو پیت و دەنگانەی لە ئاوێنەی ئەو دیمەنانەدا دەرکەوتوون، بریتیین لە خودی ئەو چاکیی و تەواوییانە، یان ئەو پیت و دەنگانە بە تەواویی دەوری ئەو چاکیی و تەواوییانەیان داوە، یان لێیان نزیکن، یان لەگەڵیاندان بە لەگەڵدابوون و نزیکییەکی خودیی! بەڵکو هەر ئەوەندە پێکەوە پەیوەستن، کە گەیەنەر گەیەنراو (بێژەو واتا) پێکەوە پەیوەستن و، ئەو پیت و دەنگانە، جگە لە نیشانەو بەڵگەی ئەو تەواوییە، هیچی دیکە نین و، پەیوەندییەکەشییان تەنیا لە ئەنجامی وەهم و خەیاڵەوە پەیدابووە [ئەگەرنا هیچ پێک ناچن و لێک دوورن].

## تەوەرەی پێنجەم:
## (إبن عربي) و لاف لێدانی زل زل و بێ بەڵگە

بە پێویستم زانی هەندێک شیکردنەوە بۆ چەند قسەیەکی (إبن عربي) بکەین، کە لافی زۆری لێداون و بۆشی ئیسپات نەکراون، بۆ نموونە، گوتوویەتی:

[ليس عندي بحمدالله تقليد لأحد غير رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، فعلومنا كلها محفوظة من الخطأ](1).

واتە: (ستایش بۆ خوا، جگە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لاسایی کەسم نەکردۆتەوە، بۆیە زانیارییەکانمان هەموویان لە هەڵە پارێزراون!!

دیارە(إبن عربي)لافی دیکەشی زۆر لێداون وەک: (ختم الأولياء)،(2) کە گوایە هی خۆیەتی، بەڵام ئێمە تەنیا ئەو قسەیەی لە مەحەک دەدەین،کە گوتوویەتی: زانیارییەکانی ئێمە هیچ هەڵەیان تێدانین!).

بابزانین وایە؟!

### چەند هەڵەیەکی جۆراو جۆری (إبن عربي)(3):

١ ) لە بارەی هۆکاری نیشتنی ماددەکانەوە لە شلەکاندا، گوتوویەتی: (فالمرسوب للبرودة والرطوبة... نیشتن بە هۆی ساردیی و تەڕییەوەیە).

بەڵام زانست دەڵێ: هۆکارەکەی زیادیی چڕیی (كثافة) ماددە نیشتووەکەیە، لە شلەکەدا.

---

(1) الفتوحات المكية، ج٣، باب: ٣٦٧، ص٣٣١ — ٣٤٣.

(2) گوایە (إبن عربي) کۆتایی دۆستانی خوایە!!

(3) سەرجەم ئەو نموونانە جگە لە (١١ و ١٢) لە کتێبی: (الروحية عند محي الدين بن عربي) وەرمگرتوون: ص٤٣٦ — ٤٤٣.

٢ ) لەبارەی تیشکەوە دەڵێ: (زمان التحاظه هو زمان التحاقه).

واتە: کاتی بینینی، کاتی دەرچوونییەتی! کە ئەوەش ڕاست نییەو، تیشک ماوەی (٣٠٠٠٠٠)کلم لە چرکەیەکدا دەبڕێ و تیشکی ئەستێرەی وا دەبینین، چەندان ملیۆن ساڵە بەڕێوەیە! خۆریش، کە سەد و پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر (١٥٠.٠٠٠.٠٠٠)کلم لێمانەوە دوورە، تیشکەکەی بە هەشت خولەك دەمانگاتێ.

٣ ) لەبارەی هەورە تریشقەوە گوتوویەتی:

(وهذا الملك المسمى الرعد، وهو مخلوق من الهواء كما خلقنا نحن من الماء).

واتە: ئەو فریشتەیەی(رعد)ی پێدەگوترێ، لە هەوا دروست بووە، وەک چۆن ئێمە لە ئاو دروست بووین.

ڕاستەکەیشی ئەوەیە، کە هەورە تریشقە، دەنگ و هەوا نییەو، دەرەنجامی موتوربە بوونی هەورانە، فریشتەکانیش لە ڕووناکیی(نور) دروستبوون، نەك لە هەوا، وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خُلِقَتِ الملائكةُ من نُّورٍ).رواه مسلم: ٢٩٩٦.

٤ ) لەبارەی ژمارانەوە دەڵێ:

(فإن مراتب العدد أربع: آحاد وعشرات ومائون و آلاف).

واتە: پلەکانی ژمارە چوارن: یەکان و دەیان و سەدان و هەزاران.

بەڵام ئاشکرایە، کە ژمارەکان کۆتاییان نییە، سەد هەزار، ملیۆن، ملیار، تریلیۆن...

٥ ) لەبارەی زیندەزانییەوە پێی وابووە: (أن التعفين يحدث في الجو فينشأ عنه حيّات تعيش هناك، وأن والده رأي البازي وقد نزل من الجو بواحدة منها..).

واتە: بۆگەن بوون لە هەوادا دەبێ و، مارەکان لەوێ پەیدا دەبن و دەژین و، بابیشی بازێکی دیوە مارێکی لەسەرێوە دابەزاندوە!

بەڵام بێگومان باز مار لە زەوییەوە بەرەو ئاسمان دەباو دەیکوژێ!

٦ ) (إبن عربي) پێی وابووە: زەوی چەقی گەردوونە!

کە ئەوە هەمان قسەی گەردوون ناسە گریکەکان بووەو، ئێستا زانست بە ئەفسانەی دەزانێ.

٧ ) هەروەها (إبن عربي) پێی وابووە: ئەستێرەکانی ئاسمان خانووی تاریک و تەڵەمن و، ڕووناکیی خۆریش لە خودی خۆی نییە!

بەڵام ئەو قسانە، هەموویان پێچەوانەی زانستی گەردووناسیین و، ئێستا هیچ بایەخێکیان نیە.

٨ ) دیسان (إبن عربي) پێی وابووە: زەوی بەر لە خڕۆکەو ئەستێرەکان بووە، یانی: پێش وان دروستبووە!

بەڵام زانست جۆرێکی دیکەی گوتوەو سەلماندوەو، زەوی یەکێکە لە نۆ خڕۆکەکەی کۆمەڵەی خۆر و، خۆر(شمس)یش ئەستێرەیەکە لە تریلیۆنێك ئەستێرەی نێو کەهکەشانی کاکێشان و، کەهکەشانەکانیش دەوری یەك تریلیۆن($10^{12}$)یان لێ مەزەندە کراون.

٩ ) هەروەها (إبن عربي) تەمەنی گەردوون بە: سەدو چل و چوار هەزار (١٤٤٠٠٠) ساڵ مەزەندە دەکات!

ئەوەش زانستی تازە هەڵیوەشاندۆتەوە، کە دەڵێ: تەمەنی گەردوون دەوری (١٣ - ١٥) ملیار ساڵە!

١٠ ) (إبن عربي) زۆر باسی دیتنی فریشتەکان و قسە لەگەڵ کردنیان دەکات، بەڵام نازانین بۆچی جارێ: چارەسەری نەخۆشییەک، پەیداکردنی

زانیـارییەک، وەدەسـتهێنانی هێـزو توانـایەکی لــێ داوا نەکـردوون، کە لەو ڕۆژگارەدا بۆ موسوڵمانان، زۆر پێویست بوون ؟![1]

١١) (إبن عربي) دەڵێ: من قسەکانی خۆمم لە فریشتان وەرگرتوون!

کە بێگومـان، جـگە لە پێغەمـبەران، هـیچ کەس ڕاسـتەوخۆو لە حـاڵەتی بێداریی دا، زانیاریی لە فریشتان وەرناگرێ، کەچی ئەو گوتوویەتی:

(فإنه ليس من علوم الفكر هذا الكتاب، وإنما هو من علوم التلقّي والتَولّي).[2]

واتە: ئەم کتێـــبە لە زانیارییەکـــانی بیرکـــردنەوە نیـــیە، بەڵکـــو لە زانیارییەکانی وەرگرتن و شۆڕکردنەوەیە.

یانی: فریشتە بۆلام شۆڕبوونەوەو لێم وەرگرتوون!

ئنجا ئایا ئەگەر ڕاستبایە، دەبوایە قسەکانی بەمجۆرەبن!

دەبوایە:

١ - لەو پەڕی وردەکاریی زانستیی و ڕاستیی دا بوونایە.

٢ - بۆ خەڵکی سوودبەخش بوونایە!

کەچی تێکەڵ و پێکەڵ و پڕ لە هەڵەن و، بۆ خەڵکیش مـایەی سەرئێشـەی زۆرن و، ئەهلی تەصەووفیشیان بەگشتیی عەیبدارو سەغڵەت (مُحْرَج) کردوون!

١٢) (إبـن عربـي) لە چەنـد شـوێنێکی کتێبەکـانی دا، باسـی (خضـر) دەکـات، هـاوەڵە صـاڵحەکەی مووسـا "علیـه السـلام"، خوا لێـی ڕازی بـێ، گـوایە: دیتوویەتی و ئامۆژگاریی کردوە!

---

[1] بڕوانە: الروحية عند ابن عربي (الدكتور علي عبدالجليل راضي، ص٤٣٨ – ٤٩٢، ط١ ١٩٧٥).

[2] الفتوحات المكية: ج١ ص٢٢٨، الباب ٢٢١ في معرفة علم ومَنزل المنازل.

بۆ وێنە: گوتوویەتی:

(إعلم أيها الولي الحميم أيّدك الله أن هذا الوَتَد هو خضر صاحب موسى "عليه السلام" أطال الله عمره إلى الآن، وقد رأينا من رآه، واتفق لنا من أمره شيء عجيب...)[1]

واتە: ئەی دۆستی نزیک! خوا پشتت بگرێ، بزانە ئەو سینگە (خضر) هاوەڵی مووسایە (عليه السلام)، خوا هەتا ئێستا تەمەنی درێژ کردووە کەسێك، کە دیتوویەتی دیتوومانە و، شتی سەرسوڕهێنەرمان لە گەڵی بووە!

شتێکی ئاشکراشە، کە(خضر)و هیچ مرۆڤێکی دیکەش نەماوە،خوا فەرموویەتی:

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾﴾ الأنبياء:٣٤

واتە:لەپێش تۆش - ئەی موحەممەد!- هیچ مرۆڤیکمان بەهەرماو نەگێراوە، ئایا، کە تۆ مردی ئەوان - بێبڕوایان- هەر ماودەبن؟!




[1] هەمان سەرچاوە، ج١ ص٢٤٤، الباب الخامس والعشرون في معرفة وتَدٍ مخصوصٍ مُعَمَّرٍ.

تەوەری شەشەم:

## پوختەی قسان لەبارەی بیرۆکەی یەکبوونییەوە

بیرۆکەی [یەکبوویی - وحدة الوجود]، هەرچەندە کەسێک لێی ورد نەبێتەوە، سەرنجڕاکێش و فریودەرە، بەڵام یەکجار ترسناک و بە زەرەو، دەرهاویشتەی خراپی زۆرن و، بە بەرهەم و دەرهاویشتەکانییەوە دەبێ سەرنجی بدەین و، وێڕای نەقڵ (وحي)،پێچەوانەی ڕاشکاوی عەقڵ و زانست و زگماک و واقیعیشە.

ڕاستیش نییە بەرهەمی ڕاستەوخۆی(إبن عربي) بێ، بەڵکو ئەویش لە کەسانی زۆری پێش خۆی وەریگرتوە، بەڵام زۆر ڕەواجی پێداوەو پێوەی ناسراوە، ئەگەرنا بیرۆکەی (یەکبوویی ) ڕەگ و ڕیشەی لە هەرکام لە:

(البراهيمية والكونفوشية والأيونية والرواقية والأفلوطينية)دا هەبووە[١].

شایانی باسە:

هەندێک لە زانایانیش زاراوەی: یەکبینیی (وحدة الشهود )یان بەکارهێناوە، واتە: مرۆڤ هێندە بە ناسینی خوادا قووڵ دەبێتەوەو، هێندە پێیدا ڕۆبچێ، کە جگە لە خوا هیچ شتێک و هیچ کەس نەبینێ،کە بێگومان ئەمەیان هیچ ئیشکالی نییەو، زۆریش جیاوازە لە بیرۆکەی: (یەکبوویی - وحدة الوجود )وفەرموودەکەی پێغەمبەریش:

(أصدق كلمة قالها شاعر كلمة لبيد: ألا كل شيء ما خلا الله باطل).[٢]

واتە: ڕاسترین وشە شاعیرێک گوتبێتی، ئەم قسەیەی (لبيد)ە:

ئاگاداربن! جگە لە خوا هەموو شتێک پووچە.

یانی: جگە لە خوا، هیچ شتێک بوونەکەی خودیی و چەسپاوو بەردەوام نییە...

---

(١) الروحية عند محي الدين بن عربي، ص ٤٦١ .

(٢) أخرجه البخاري: ٦٤٨٩ ومسلم: ٥٨٤٩ والترمذي: ٢٨٤٩ وإبن ماجة: ٣٧٥٧.

### تەوەری حەوتەم:

### ڕای بەندە لەبارەی بیرۆکەی (یەکبوویی - وحدة الوجود)ەوە

وێـڕای عەقـڵ و زگمـاک و واقیـع، کە لەگەڵ بیـرۆکەی یەکبووییـدا دژو نـاکۆکن، بەڵگەی وەحییـش زۆرن و، هەرکەس بەدڵێکـی سـاغ و سـاف و، دوور لە کارتێکراویی فەلسەفە جۆراو جۆرەکان، سەرنجی ئەو بیرۆکەیە بدات، بەئاسانیی و بێ ئەرک و ماندوو بوون، دەرکی پوچەڵییەکەی و، بێ بنەماییەکەی دەکات و، بێ سێ و دوو لێکردن، ڕەفزی دەکات.

لە چەند خاڵێکدا، بیروڕاو هەڵوێستی خۆم لەبارەی بیرۆکەی (یەکبوویی - وحدة الوجود)ەوە دەخەمە ڕوو:

**یەکەم**: هەموو مرۆڤێکی عەقڵ ساغ، خۆی و دەوروبەری لەیەک جیا دەکاتەوە، دەوروبەرێـک، کە وەک خـۆی دروسـتکراوو بەدیهێنـراون، چ جـای خـوای بەدیهێنەری تاک و پاک و بێ وێنە.

کەواتە: بیرۆکەی(یەکبـوویی)، دژو پـێچەوانەی عەقـڵەو، لەگەڵیـدا تێـک دەگیرێ.

**دووەم**: هەروەها بیرۆکەی ناوبراو، دژو پێچەوانەی زانستیشە، با لەوبارەوە گوێ بۆ یەکێـک لە زانایـانی نـاوداری گەردوونـناس و فیزیـازان بگـرین، کە بـریتییە لە:(سیر جیمس جینز)،کە لەوبارەوە لە کتێبی:(گەردوونی نەزانراو - الكون الغامض)دا گوتوویەتی[1]:

(ولقد وصف الأوائل الخالق وهو يفعل في الزمـان والمكـان، دافعـاً بالشـمس والقمـر والنجوم، ليخرجها من مادتها البدائية، والنظرية العلمية الحديثة تضطرنا لنفكر في

---

[1] الروحية عند محي الدين بن عربي. ص٤٧٤.

الخالق على أنه يعمل خارج نطاق الزمان والمكان، اللذين هما جزء من الخلق تماماً، مثل وجود الفنّان خارج نطاق اللوحة التي يرسُمُها).

واتە: پێشووەکان وا وەسفی بەدیهێنەریان کردووە، کە لە میانی کات و شوێندا کاری کردووەو، خۆرو مانگ و ئەستێرەکانی لە ماددە سەرەتاییەکەیانەوە پاڵپێوەناون، دەری هێناون، بەڵام بیردۆزەی زانیاریی نوێ، ناچارمان دەکات وا بیر لە بەدیهێنەر بکەینەوە، کە لە دەرەوەی بازنەی کات و شوێن دا، کاردەکات، کە ئەوانیش خۆیان بەشێکن لە دروستکراو، ڕێک وەک چۆن هونەرمەندێک (وێنەکێشێک)خۆی لە دەرەوەی جوغزی ئەو تابلۆیەیە، کە نیگاری دەکێشێ.

**سێیەم**: خوای بەرزی مەزن، وەک چۆن وەک باسی حەوت ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان دەکات، بە هەمان شێوە باسی عەرشیشی کردووەو، ڕاشیگەیاندووە ،کە چۆتە سەر عەرشی خۆی - بەو جۆرەی شایستەیەتی - بۆ نموونە:

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف: ٥٤.

واتە: بەدڵنیاییەوە پەروەردگارتان ئەوخوایەیە،کەئاسمانەکان و زەوی لەشەش ڕۆژاندا- بەشەش قۆناغ- هێنایەدی،دوایی چۆتە سەرتەخت،بەشەوێ ڕۆژ گاردادەپۆشێ بەخێرایی دوای دەکەوێ،خۆرومانگ و ئەستێرەکانیش بەفەرمانی ویشملکەچ و ڕامکراون،ئاگاداربن!دروستکردن و فەرمان بەس هیوین،بەرزو بەپێزە پەروەردگاری جیهانییان.

کەواتە: خوا لەسەر عەرشە - بەو جۆرەی شایستەیەتی - و لە دەرەوەی ئاسمانەکان و زەوییە و ئاوێتەیان نییە!

زانایانی ئیسلامیش تێکڕا لەسەر ئەوە یەکدەنگن:

(الله مَستَوٍ على عرشه، بائن عن خلقه........... خوا لەسەر تەختی خۆیەتی و، جیایە لە دروستکراوی خۆی).

**چوارەم**: مووسا (علیه السلام)، داوای لەخوای بەرزی بێ وێنەکردووە، خۆی پیشان بدات و تەماشای بکات، بەڵام خوای کاربەجێ پێی فەرمووە: ناتوانی بمبینی و، دواتریش بەڵگەیەکی کردەیی پیشانداوە، کە بریتی بووە لە خۆ دەرخستنی خوا بۆ چیایەک و، سەرەنجام وردووخاش بوونی چیایەکەو، بێهۆش کەوتنی مووسا، بە هۆی دیتنی ئەو وێنە سامناکەوە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِىۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾ الأعراف: ١٤٣.

ئنجا ئەگەر بیرۆکەی (یەکبوویی)، فرێ بەسەر ڕاستییەوە بوایە، نەپێویست بوو(مووسا) ئەو داوایە بکات، چونکە هەرچی تەماشا کردبایە: خوا بووا، نە خوای میهرەبانیش دەیفەرموو: ناتوانی بمبینی (لن تراني)!

**پێنجەم**: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بوارەدا فەرموویەتی:

(إِنَّ اللّه عزوجل لاينامُ ولا يَنْبَغي لهُ أنْ يَنَام، يَخْفِضُ القِسْطَ وَيَرْفَعُه، يُرْفَعُ إليه عَمَلُ الليل قبل عمل النهار، وعَمَلُ النهار قبل عمل الليل، حِجَابُهُ النور – وفي رواية أبي بكر: النار – لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ما انتهى إليه بصره من خلقه).[1]

واتە: بێگومان خوا نانوێ و شایستەشی نییە بنوێ، تەرازوو نزم و بەرز دەکات، کردەوەی شەوێی پێش هی ڕۆژێ بۆلا بەرز دەکرێتەوەو، کردەوەی

[1] مسلم ٤٤٥ وابن ماجه: ١٩٥ ، ١٩٦.

ڕۆژیشی بەر لە هی شەوێی بۆلا بەرز دەکرێتەوە، پەردەکەی ڕووناکییە - لە ڕیوایەتی ئەبی بەکردا: ئاگرە - ،ئەگەر لایبەرێ پڕشنگەکانی ڕووی، هەر دەکەوێتە بەر حوکمی دیتنی لە دروستکراوەکانی، دەیسووتێنێ.

کەواتە: خوا پەردەیەکی ڕووناکی - یان ئاگری - لە نێوان خۆی و دروستکراوەکانیدا داناوەو، بە لابرانی، سەرجەم دروستکراوەکان دەبنە قەرەبرووت و دەسووتێن.

**شەشەم :** بەڕاستیی پێم سەیرە ،کە ژمارەیەک لە ناودارانی تەصەووف، پێیان وابووە: بیرۆکەی یەکبوویی (فکرة وحدة الوجود) قۆناغێکە، هەردەبێ بابای هەوڵدەر بۆ زۆر لە خوا نیزیککەوتنەوە، بیبڕێ!

بۆ نموونە: (السید أحمد السرهندی)، کە بە (الإمام الربانی) ناسراوە، لەبارەی خۆی و باییەوە گوتوویەتی: لەسەر ئەو ڕێبازە بوون.

بەڵام دوایی، خوا ئەوی بەهۆی (الشیخ المرشد محمد عبدالباقی)یەوە، لە (التوحید الوجودي)دەربازکردووە بەرەو(التوحید الشهودي).[1]

هەروەها باس دەکات، کە شێخەکەیشی(محمد عبدالباقي) ماوەیەکی کەم هەر لەسەر ئەو ڕێبازە بووە و، دوایی میهرەبانیی خوا دەربازی کردووە.[2]

هەروەها پێم سەیرە،کە(أبو الحسن النَّدَوي)یش لەبەرانبەر ئەو قسانەدا، بێدەنگ بووەو هیچی لەسەر نەگوتوون!

بەڵام بێگومانم، کە مەرج نییە ئەو حاڵەتە بۆ هەموو کەس بێتە پێش ، وا تێدەگەم ئەوە دەرهاویشتەی جۆرێک لە مەشق و ڕاهێنانی ڕووحیی بەشێک لە ئەهلی تەصەووف بێ، ئەگەر نا بۆچی:

نەک هەر هاوەڵان (أصحاب) خوا لێیان ڕازی بێ، بگرە دوای وان شوێنکەوتوان(تابعین)و، پێشەوانیش ئەو حاڵەتەیان نەبووە، هەروەها زۆری دیکەش لە زانایان و بۆ خوا صوڵحاوان!

---

(١) الرسالة رقم: ١٦٠. المجموعة الأولى، لە: (رجال الفکر والدعوة..) ج٣ ص٢٨٣ ، ٢٨٤.

(٢) الرسالة رقم: ٤٣. المجموعة الأولى، لە: (رجال الفکر والدعوة..) ج٣ ص٢٨٢.

**حەوتەم :** هەروەهــا ڕەخنەشــم لەســەرجەم ئەوانە هەیە، کە لە ئەنجــامی ئەوەدا هەندێک لە قسەکانی (إبن عربی)یان بەدڵ نەبوون و، دژی قورئان و سوننەت و عەقڵ و زگماک بوون، لەجیاتی ئەوەی ڕەخنە لە قسەکانی وی بگرن و بڵێن: ماڵی قەڵب سەربە خاوەنییەتی، هاتوون:

١ - یان پینەو پەڕۆی بێ جێیان بۆ قسەکانی کردوون، تاکو ڕەشەرعیان بخەن!

٢ - یان عەقڵی خۆیانیان تۆمەتبارکردووە، کە تێیان ناگات!

هەڵــبەتە ڕەنــگە نازنــاوی زلی(الشــیخ الأکبــر)یش، کە بە نــاهەق داویانەتە(محي الدین بن عربي) کاریگەریی لەسەریان بووبێ!

هەروەهــا ڕەنــگە ئەو هەمــوو لاف لێــدانانەی نــاوبراو، خســتبنییە ژێــر کاریگەریی و هەژموونی خۆیەوە، بۆ وێنە: لەسەرجەم کتێبی: (الفتوحات المکیة)و کتێبی: (فصوص الحکم)دا، باسی دیتنی فریشتان و پێغەمبەران و ئیلهام بۆکرانی زۆر دەکات!

بەڵام بێگومان:

١) زۆربەی قسەی سەیرو بێ بەڵگەکانی (إبن عربي)، ڕەگ و ڕیشەیان لە کلتوورو فەرهەنگی ڕۆژگاری خۆی - کۆتایی سەدەی شەشەم و سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچیی- دا هەن و، بۆ کەسێک شارەزایی وردیی لەبارەی ئەو فەلسەفەو بیرۆکانەوە هەبێ، دۆزینەوەی دەزووەکانی پێکەوە بەستنەوەیان ئاسانە، وەک:

١. گریکەکان (الإغریق)، کە (إبن عربي) بیرۆکەی (العماء)و (الحقیقة المحمدیة)، یان (العقل الأول)ی لێ وەرگرتوون.[1]

٢. الفارابی (٨٧٠ - ٩٥٠م) بیروڕاکانی لەبارەی (النفس والقوة المصورة والوهم والحافظة والقلب...)ەوە لێ وەرگرتوون.[2]

(١) الروحیة. ص٤٤٤.

(٢) هەمان سەرچاوە: ص٤٢٨.

٣. إخوان الصفا، کە لەدەوری ساڵی (٩٨٣م)دا ژیاون و،چەند نامیلکەیەکیان نووسیون، (ابن عربي) بیرۆکەی پلە پلەیی دروستکراوان لە خوارەوە بۆ سەرەوە (تدرج الكائنات من أدنى إلى أعلى)، لەوان وەرگرتوە: (گڵ، ئاو، کانزا، ڕووەک، ژیاندار...).[1]

٤. (ابن سينا وإبن طفيل) (٩٨٥ -١٠٣٧م) و (١١١٠ - ١١٨٥م)، (ابن عربي) چەند زانیارییەکی لەبارەی خڕۆکەکان و پەرستراوەکانیان (الكواكب وآلهتها)، کە ئەو ناوی لێناون فریشتەکان (ملائكة)، هەروەها لەبارەی چینەکانی ئاسمانەکان، لەوانەوە وەرگرتوون.[2]

٥. (شهاب الدين السهروردي) (٥٤٥ - ٥٨٧م) (إبن عربى) ژمارەیەک وشەو زاراوەی وی بەکارهێناون، وەک: (المسافر، الوجد، الوجود، الغناء والشهود الهيولى، الجوهر، الذوق، الحلاوة، الحق الأول، الخيال، الرياضيات...).[3]

شایانی باسیشە: کارتێکراوبوونی (إبن عربي) بە خەڵکی پێش خۆی و، وەرگرتنی زۆرێک لە بیرۆکەکانی لێیان، ژمارەیەک لە لێکۆڵەران لەسەری یەکدەنگن، بۆ نموونە:

١. الدكتور أبوالعلا عفيفي.[4]
٢. الدكتور زكي مبارك.[5]
٣. الأستاذ عباس العزاوي.[6]
٤. الدكتور محمد رجب حلمي.[7]
٥. الدكتور محمد غلاب.[8]

---

(١) هەمان سەرچاوە: ص٤٤٩.
(٢) هەمان سەرچاوە: ص٤٥١.
(٣) هەمان سەرچاوە: ص ٤٥٢.
(٤) الروحية: ص٤٥٥.
(٥) هەمان سەرچاوە: ص٤٥٦.
(٦) هەمان: ص٤٥٧.
(٧) هەمان: ص٤٥٧.
(٨) هەمان: ص٤٥٨.

٦. الدكتور علي عبدالجليل راضي.[١]

کەواتە: پێویستە بزانرێ، کە (إبن عربي)یش وەک سەرجەم خەڵکی دیکە، کەم و زۆر ،کارتێکراو بووە بە بیرۆکەکانی ڕۆژگاری خۆی و، شایانی باسە: هەرکام لەو نووسەرانەی ناومان هێناون، بە وردیی باسیان کردووە، کە (ابن عربي) چی و چی و لە کێ و کێ نەقڵ کردووە!

٢) وێڕای ئەو سەرچاوانەی باسمانکردن، وا پێدەچێ (ابن عربي) هەم خەیاڵ و وەهمی خۆی و، هەم هەندێک لە شەیتانەکانی کاریگەریی نەرێنیی (التأثير السلبي)یان لەسەری بووبێ، وەک (إبن تيمية)ش ئاماژەی پێداوە، لەوبارەوە گوتوویەتی:

(... وهذه الأرواح الشيطانية هي الروح الذي يزعم صاحب الفتوحات، أنه ألقى اليه ذلك الكتاب، ولهذا يذكر أنواعاً من الخلوات بطعامٍ معيَّن وشيء معيَّن، وهذه مما تفتح لصاحبها اتصالاً بالجن والشياطين، فيظنون ذلك من كرامات الأولياء، وإنما هو من الأحوال الشيطانية...)[٢]

واتە: ئەو ڕووحە شەیتانییانەن، ئەو ڕووحەی، کە خاوەنی (الفتوحات) پێی وایە: ئەو کتێبەی بۆ ناردووە! بۆیەش چەند جۆرە خەڵوەکێشانێک باس دەکات، بە خواردنێکی دیارییکراوو شتێکی تایبەتەوە،کە ئەمەش ڕێی پەیوەندیی لەگەڵ جندو شەیتانان بۆ خاوەنەکەی دەکاتەوە و، پێیان وایە: لە کەرامەتەکانی دۆستانی خوایە، بەڵام تەنیا حاڵەتە شەیتانییەکانن.

---

(١) هەمان. ص٤٤٤ – ٤٦٠.

(٢) مجموعة الفتاوى: ج١١ ص١٣٣.

# بەشی دەیەم

## تەصەووف و صۆفییەکان

## ( التصوّف والصوفية )

١- وشەی تەصەووف لە چییەوە هاتوەو کەی پەیدا بووە؟
٢- سەرەتای سەرهەڵدانی تەصەووف.
٣- ناوەکانی تەصەووف.
٤- پێناسەی تەصەووف و نێوەڕۆکەکەی.
٥- گەشەکردنی تەصەووف.
٦- سەرهەڵدانی ڕێبازەکانی تەصەووف و گرنگترین ڕێبازەکانی.
٧- هەڵسەنگاندنێکی کورت بۆ تەصەووف و تەزکیەی نەفس.

**بەڕێــزان!**

خوا یاربێ بە کورتیی لەو حەوت تەوەردا، کە ناوونیشانەکانیانمان خستنە ڕوو، لەبارەی تەوژمی تەصەووفەوە دەدوێین، کە ئەو ناوە (التصوف) باوترە، ئەگەرنا من زیاتر وشەی (تزكية) بەكار دەهێنم، كە وشەیەكی قورئانییە، بەڵام وشەی تەصەووف زیاتر وەك ناوو نیشانێك بۆ بابەتی مەعنەویی و ڕووحیی، برەوی هەیەو ناسراوەو زانراوە.

شایانی باسیشە:

ئەم بەشی دەیەم وكۆتاییە، لە ئەسڵدا بەشی پازدەیەمە لە كتێبی سێیەمی (مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا)" بە ناوونیشانی: (تەوژمە فیكرییە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان)."[1]

بەباشم زانی بیكەمەوە بەشی كۆتایی كتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)، چونكە نوێترین قسەمە لەبارەی: خۆپاك و چاككردنەوە).




[1] ئەو مەوسووعەیە بریتییە لە چل و نۆ (٤٩) وتاری بەندە بە هەمان ناوونیشان، كە لەنێوان ڕۆژانی: (٢٠١٦/١٠/٢١ز- ٢٠١٧/٥/٥ز)دا پێشكەشكراون و، دواتر بوونەتە ئەو مەوسووعە پێنج كتێبییە.

## تەوەری یەکەم:

## وشەی تەصەووف لە چییەوە هاتووەو کەی پەیدا بووە؟

ئەم تەوەری یەکەمە لە دوو بڕگەی کورت دا دەخەینە ڕوو:

**یەکەم: وشەی [تصوف] لە چییەوە هاتووە؟**

{لەو بارەوە، کە وشەی (تصوف) لە چییەوە هاتوە؟ چەند ڕایەك هەن، کە بەکورتیی ئەمانەن:

١- (تصوَّف: أي لِبسَ الصُّوفَ فهو صوفِي)، واتە: (تَصَوَّفَ) یانی: بەرگی خوریی لەبەر کردو ئەو خورییی پۆشە.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە (أهل الصُّفَّة)وە، هاتوە، (سوففە) شوێنێکی بەرزایی، سەکۆیەك بووە بەتەنیشت مزگەوتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، سەقفێکیشی هەبووە، ئەوانەی، کە بێ ژن و ماڵ بوون، لەوێدا پشوویان داوە.

٣- هەندێکی دیکە گوتوویانە:لە(الصفُّ الأول)ەوە هاتووە، ئەوانەی هەمیشە ویستوویانە لە ڕیزی یەکەمی نوێژ، یان جەنگ لە دژی دوژمناندا بن.

٤- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە وشەی(صوفة)وە هاتووە،کە هۆزێکی بیابانشین(قبيلة بدوية)بوون، دیارە زۆربەی ئەو کەسانەش لەو هۆزە بوون، بۆیە ئەو ناوەیان بەدوا کەوتووە.

٥- هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئەو وشە لە (الصوفانة)ەوەیە، یانی:(بقلة)، کە دانەوێڵەیەکە دەخورێ، ئنجا زیاتر وەك دنیا بەکەمگرتن (زهد)، ئەوانە ئەو جۆرە خواردنەیان خواردووە.

٦- هەندێکی دیکەگوتوویانە: لە(صوفة القفا)ەوە هاتووە، یانی: (الشعرات النابتة على القَفا)، واتە: ئەو موانەی،کە لەپشتی سەر دێن، یانی: زۆر خزمەتی خۆیانیان نەکردوەو، دەستیان بەخۆیاندا نەهێناوە.

٧- هەندێکی دیکە گوتوویانە:(صوفي)لە(صفا)ەوە هاتووە،واتە:خۆی صاف کردەوە.

٨- هەندێکی دیکە گوتوویانە: (تصوف) وشەیەکی یۆنانییە (سوفوس) یان (تیوسوفیا)، لەوێوە هاتوە}[١].

بەڵام ئەوەی کە زۆربەی زانایان لەسەرنی، وەك (إبن تیمیة)و غەیری ئەویش پشتگیرییان کردووە، ئەوەیە کە بۆچوونی یەکەمیان ڕاستە، کە دەڵێ: لە (صوف)ەوە هاتوە.

لەڕووی زمانی عەرەبییشەوە، هیچ کام لەوانی دیکە ناگونجێ (صوفي) لەوانەوە هاتبێ، ئەوەش لەبەر ئەوە بووە، هەرچەندە ئەو کات، جگە لە بەرگی خوریی{صوف}، بەرگی دیکەش هەبووە، وەك: (ئاوریشم و کەتان و لۆکەو تووك (وَبَر)و موو)، بەڵام وا پێدەچێ ئەو کاتە، بەرگی خوریی لە هەموان هەرزانتر بووبێ، ئەوانیش ئەو بەرگەیان لەبەر کردووە، وەك دنیا بەکەمگرتن، ئەوە وەك ئەصڵی وشەی (صوفي).

شایانی باسە: لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەش دا، هەر ئەم ڕایەمان لەبارەی ڕیشەی (تصوف)ەوە پەسند کردووە.

### دووەم: وشەی (صوفي) و (صوفیة) کەی سەری هەڵداوە ؟

وشەی (صوفي)،کە بۆ (تاك) بەکار دێ، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زایینیدا، دەرکەوتووەو، بەپێی ڕای هەندێ لە زانایان: یەکەم کەس کە ئەو وشەیەی بۆ بەکار هێنراوە: (جابر بن حیان)ە، کە زانایەکی ناوداری شیعە بووەو، خەڵکی شاری (کووفە) بووەو لەساڵی (٢٥٣ك)دا، کۆچی دوایی کردووە، ئەمە ئەگەر وەك (تاك) بەکار بێ.

بەڵام ئەگەر وەك (کۆ) بەکار بێ: (الصوفیة) بۆیەکەم جار، وەك سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: لەساڵی (١٩٩ك)دا، ئەو وشەیە بەکار هاتووە لە باسی فیتنەو ئاشووبێکدا، کە لە ئەسکەندەرییە ڕوویداوە، بۆ یەکەم جار ئەو وشەیە لەوێ بەکار هێنراوە، وەك کۆ (جمع)[٢].

---

(١) دائرة المعارف الإسلامیة، ج٧ص ٢٢١٤-٢٢١٨.

(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕی پێشوو.

## تەوەری دووەم :

## سەرەتای سەرهەڵدانی تەصەووف

هەندێ لە سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: سۆفییگەریی (تصوف) لە ساڵی (٢٥٠ك)دا، دەستی پێکردوە، {بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە وەك ناوەکەی، نا، بەڵام وەك نێوەڕۆکەکەی، لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بووە، چونکە پێشەوای هەموو کەس، لە تەزکیەی نەفس و لەهەر کارێکی چاکەدا، پێغەمبەری خاتەم بووە (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها پێغەمبەرانی پێشووش، خاوەنی ئەو پەڕی نەفسی تەزکیە کراو بوون.

ئنجا، کە دەڵێن: سەرەتای تەصەووف لە ساڵی (٢٥٠)ك دەستی پێکردووە، واتە: وەك کۆمەڵێك خەڵك، کە کۆببنەوەو وەك کۆمەڵێك خەڵکی پسپۆڕو شارەزا، کاری تایبەتیی بکەن لەسەر تەزکیەی نەفس و لایەنی مەعنەویی، مەبەستیان پێ ئەوەیە.

ئەگەرنا وەك لایەنی تەزکیەی نەفس، هەر لەسەرەتاوە هاوەڵان لە هەموو کەس زیاتر، پشك و بەشیان هەبووە لە تەزکیەی نەفسدا}[1].

لە ساڵی (٢٥٠ك)دا، دەستکرا بە هەندێ کۆبوونەوەو هەندێ بازنە لە مزگەوتەکاندا دەبوون و، دەرس دەربارەی تەزکیەی نەفس لە مزگەوتەکاندا دەگوترایەوەو، ئامۆژگاریی خەڵك دەکرا، ئنجا لە سەدەی سێی کۆچییدا، بۆ یەکەمجار کێشە و مشت و مڕ کەوتە نێوان شەرعزانان و ئەهلی تەصەووفەوە، لەسەر هەندێ باس و بابەت، کە مەرجیش نییە، هیچ کامیان هەقی ڕەهای پێ بووبێ، بەڵام شەرعزانەکان زیاتر ڕواڵەتی شەریعەتیان بینیوەو، ئەوانی دیکەش، زیاتر تەماشای دیوی پەنهانی شەریعەتیان کردووە، هەروەك بەسەرهاتەکەی مووسا (سەلامی خوای لێبێ) لەگەڵ بەندە صالحەکەدا.

---

[1] نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

مووسا سێ جاران ڕەخنەی لێدەگرێ، بەڵام دیارە ئەو بەندە چاکە دیوی پەنهانی شتەکانی دەبینی، دواییش بۆ مووسای ڕوون دەکاتەوە: بۆچی ئەو کارانەی کردن! بەڵام مووسا (سەلامی خوای لێبێ)، کە بە پێی ڕواڵەتی شەرع حوکمی کردووە، ڕەخنەی لێگرتووە، دیارە هەم (مووسا)ش و هەم ئەو پیاوەش، هەردووکیان لەسەر هەق بوونە {هەریەکەی لە ڕوویێکەوەو بەئیعتیبارێك}.

هەر لەو سەردەمەشدا کۆمەڵێك لە ئەهلی تەصەووف، لەلایەن شەرعزانەکانەوە، بردران بۆ لای قازیی، بۆ دادگایی کران: لەوانە: (ذوالنون المصري، أبو حمزة، الحلاّج)، کە دیارە دوایی (حەللاج )لە سێدارە دراوە.[1]



[1] هەمان سەرچاوەو لاپەڕی پێشوو.

## تەوەری سێیەم:
## نـــاوەکـــانی تـەصـەووف

ئەم بابەتە گرنگ و گەورەیە: {پسپۆڕیی لەڕوویی مەعنەویی و سەرنجدانی دیوی پەنهانی کردەوەکانەوە}، ناوونیشانی زۆری بۆ بەکار هێنراون، که دە(١٠)یانمان، وەك گوڵبژێر هێناون:

١- علم القلب - زانیاریی دڵ.

٢- علم الأسرار - زانیاریی نهێنییەکان.

٣- علم المعارف - زانیاریی زانستەکان.

٤- علم الباطن - زانیاریی دەروون و پەنهان.

٥- علم الأحوال والمقامات - زانیاریی حاڵ و مەقامەکان.

٦- علم السلوك - زانیاریی ئاکار.

٧- علم الطريق - زانیاریی ڕێباز(ی بەرەو خوا چوون).

٨- علم المكاشفة - زانیاریی دەرکەوتنی ڕاستییەکان.

٩- علم التزكية - زانیاریی پاك و چاك بوون.

١٠- التربيه الروحية - پەروەردەی ڕووحیی[١].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٨ ص٢٢٤٢.

تەوەری چوارەم:

## پێناسەی تەصەووف و نێوەڕۆکەکەی

کۆمەڵێـک پێناسـەم هێنـاون، کە سـەرجەم دوازدە(١٢)ن، هەنـدێکیان بەگشـتیی ڕوونی دەکەنەوە، چونکە زانیاریی تەصەووف، تایبەت نەبووە بە ئەهلی ئیسلامەوە.

جـارێ وەك (تزکیـة) هەمـوو پێغەمـبەران (سـەلامی خوایـان لـێ بـێ)، هـاتوون خەڵك تەزکیە بکەن، ڕەوشت و ئاکاریان جوان بکەن، بۆیە ئەم ڕەوتە، تـایبەت نییە بە ئەهلی ئیسلامەوە:

١- {التصـوف نشـاط معـرفي وسـلوكي، يَتَّخِـذُهُ الإنسـانُ لتحقيـق كمالـه الأخلاقـي، والإتصال بمبدأ أسمى وعرفانه بالحقيقة، وتحقيـق سـعادته الروحيـة، والتصـوف مشـترك بـين ديانات وفلسفات وحضارات متباينة، في عصور مختلفة}[1].

واتە: تەصـەووف {بەگشـتیی} چـالاکییەکی مەعریفیـی و ئاکـارییە، کە مـرۆڤ دەیگـرێتە بەر، بـۆ تەواو کردنـی ڕەوشـت و ئاکـاری خـۆی {مـامەڵە لەگەڵ خـواو لەگەڵ خەڵکـی خـوادا}، بـۆ پەیوەسـت بـوون بە خـوای پەروەردگـارەوەو ناسـینی بەشـێوەیەکی ڕاسـتەقینەو، بـۆ هێنـانەدی بەختەوەریـی ڕووحیـی و مەعنەویـی و،تەصـەووف حـاڵەتێکی هاوبەشـە لەنێـوان چەنـدان ئـایین و فەلسـەفەو شارسـتانیی جۆراو جۆر، لە چاخە جیاوازەکاندا.

٢- {التصوّف: طريق من طرق العبادة، يتناول الأحكـام الشـرعية، مـن ناحيـة معانيهـا الروحية، وآثارهـا في القلـوب، فهـو يقابـل: علـم الفقـه الـذي يتنـاول ظـواهر تلـك العبـادات ورسـومها، ثـم انتقـل التصـوف فأصـبح طريقـاً للمعرفـة، يقابـل طريـق أربـاب النظـر مـن المتكلّمين}[2].

---

(١) الموسوعة العربية ج٦ ص٥١٣.

(٢) دائرة المعارف الإسلامية ج٨ ص ٢٢٤٢.

واتە: تەصەووف ڕێیەکە لە ڕێیەکانی خوا پەرستیی، کە باسی یاسا شەرعییەکان دەکات لەڕووی نێوەڕۆکیانەوەو، لەڕووی شوێنەوارە پەنهان و نادیارەکانیانەوە، لەسەر دڵ و دەروون.

بۆیە تەصەووف و تەزکیە لەم ڕووەوە، کە باسمان کرد: لەبەرامبەر زانیاریی فیقهـ دایە، کە زانیاریی فیقهـ باسی ڕواڵەتی کردەوەکان و یاسا شەرعییەکان دەکات و، باسی دیوی دەرێیان دەکات.

بەڵام دوایی تەصەووف بوو بە ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی خواناسیی، لەبەرامبەر ڕێبازی ئەهلی کەلامدا {ئەو زانایانەی، کە لە ڕووی عەقڵیی و زانستییەوە، باسی خواناسیی دەکەن}، بەڵام تەصەووف لەڕووی ڕووحیی و دەروونییەوە، باسی دەکات {هەردووکیشیان هەر ڕێن و ئینسان بە خوای پەروەردگار دەگەیەنن، بەڵام بەتەئکید وەك پێشتریش باسمان کرد: ئەگەر هەردووکیان بەیەکەوە کۆ بکەیەوە، ئەوە ڕاست و دروستە}.

٣- {التصوف: حركة دينية انتشرت في العالم الإسلامي في القرن الثالث الهجري، كنزعاتٍ فردية تدعو إلى الزهد وشدة العبادة، كـرد فعل مضاد للإنغماس في الترف الحضاري، ثم تطورت تلك النزعات بعد ذلك حتى صارت طرق مميزة معروفة باسم الصوفية، ويتوخّى المتصوفة تربية النفس والسمو بها بغية الوصول إلى معرفة الله تعالى بالكشف والمشاهدة، لا عن طريق أتباع الوسائل الشرعية، ولذا جنحوا في المسار حتى تداخلت طريقتهم مع الفلسفات: الوثنية الهندية والفارسية واليونانية المختلفة}[(١)].

واتە: تەصەووف بزووتنەوەیەکی ئاینییە لە سەدەی سێیەمی کۆچییدا، لە جیهانی ئیسلامییدا بڵاو بۆوە، وەك داخوازییەکی تاکیی، بانگەشەی بۆ دنیا بەکەمگرتن و بە خەستیی خوا پەرستن دەکرد، وەك کاردانەوەیەکی دژ بۆ خۆشگوزەرانیی شارستانیی، دوایی ئەو حاڵەتە تاکییە گەشەی کرد، تاکو بوو بەچەند ڕێبازێکی جیاوازی ناسراو بۆ سۆفیگەریی.

سۆفیگەریی مەبەستی پەروەردە کردنی دەروون و، بەرزکردنەوەی بەمەبەستی ناسینی خوا بەشێوەی دەرکەوتن (کَشف) و بەچاوی دڵ بینینی، نەك لە ڕێی ئامرازە

---

(١) الموسوعة الميسَّرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، د. مانع بن عباد الجهني، ج١ ص٢٤٩.

شـەرعییەکانەوە، هەر بـۆیەش لە ڕێ لایانـدا، تـاکو ڕێبازەکەیـان لەگەڵ فەلسـەفە بتپەرستییەکانی: (هیندیی و فارسیی و یۆنانی)یە جۆراو جۆرەکاندا، تێکەڵ بوو.

(الجرجاني)یش بەچەند شێوەیەك پێناسەی تەصەووف دەکات[1]:

٤- {مذهب كلُّهُ جِدٌّ، فلا يخلطونه بشيء من الهَزْل}.

واتە: تەصـەووف ڕێبـازێکە هەمـووی جیـددییەتە، هـیچ گـاڵتەو سـوعبەتی تێکەڵ ناکەن.

٥- {وقيل: تصفية القلب عـن موافقـة البريـة، ومفارقـة الأخـلاق الطبيعيـة، وإخمـاد صفات البشرية، ومجانبة الدعاوى النفسانية، ومنازلة الصفات الروحانية}.

واتە: گـوتراوە: پـاككردنەوەی دڵ و دەروونە لەوە، کە ئینسـان وەك خەڵـك بکـات {خەڵك چی کردوە تۆش وا بکەی، بەبێ ئەوەی تەماشا بکەی: داخۆ ڕاستە، یان ناڕاستە؟} و، خۆ دوورگرتنە لەڕەوشتە سروشتیی و غەریزەییەکان و، کپ کردنەوەی سـیفەتە(خراپە)کانی مـرۆڤەو، خـۆ دوور گـرتنە لە بانگەشـەی نەفسـانیی {ئەو شـتانەی، کە لە دەروونـی شـەیتانییەوە، سـەرچاوە دەگـرن} و، خـۆ بـردنە پێشـە لەو سیفەتە ڕووحانییانەی، کە شەریعەت بەپەسەندی داناون.

٦- {الوفاء لله تعالى على الحقيقة، واتباع رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في الشريعة}.

واتە: وەفادارییی بۆ خوا بە شێوەیەکی ڕاستەقینەو، شوێنکەوتنی نێردراوی خوا لەو شەریعەتەدا، کە خوا پێیدا ناردووە.

٧- {بَذْلُ المجهود والأُنْسُ بالمعبود}.

واتە: ئەوەی لەتواناتدا هەیە، بەکاری بێنی لەڕووی ماددیی و مەعنەوییەوە، بۆ ڕەزامەندیی خواو، دڵخۆش بوون و هۆگر بوون بەپەرستراوەوە.

٨- {الصبر تحت الأمر والنهي}.

واتە: خۆڕاگرتن لەژێر ئەمرو نەهی شەریعەتدا.

---

[1] بڕوانە: التعريفات، ص٦٥، ٦٦.

٩- {صفاء المعاملة مع الله تعالى، وأصله التفرُّغ عن الدنيا}.

واتە: ئەوەیە ئینسان لە هەڵس و کەوتی لەگەڵ خوادا، صاف بێ و خڵتەی ڕەگەڵ نەخات، بناغەکەشی ئەوەیە: ئینسان دەست بەتاڵ بێ لە دنیاو خۆی بۆ خوا یەکلا بکاتەوە.

١٠- {الأخذ بالحقائق، والكلام بالدقائق، والإياس ممّا في أيدي الخلائق}.

واتە:وەرگرتنی حەقیقەتە شەرعییەکان و، قسە کردنی ورد دەربارەی کردەوەکانی دڵ و دەروون و، نائومێد بوون لەوەی، کە لە دەستی خەڵك دایە[١].

١١- (إبن القيم) دەڵێ: {التصوف هو الخُلُق}[٢].

واتە: تەصەووف هەمووی بریتییە لە ڕەوشت و ئاکاری بەرز.

١٢- منیش دەڵێم: تەزکیەی نەفس: بریتییە لەوە، کە ئینسان خۆی پاك بکات و چاك بکات.

هەندێ لە ئەهلی تەصەووف گوتوویانە: (التخلية من الرذائل والتحلية من الفضائل).

واتە: خۆ بژار کردن لە سیفەتە نزم و پەستەکان و، خۆ ڕازاندنەوە بەسیفەتە بەرزو پەسندەکان.




---

[١] مەرج نیە من لەگەڵ هەموو ئەو پێناسانە دابم.

[٢] مدارج السالكين، ج٢، ص٣٠٧.

## تەوەری پێنجەم:
## گەشە کردنی تەصەووف

سەرەتا بزانن!

زانستی تەزکیەو خۆ پاك و چاك کردن، وەك هەموو زانستەکانی دیکە، پێشێ بە شێوەیەکی سادە دەستی پێکرد.

بۆ وێنە: زانستی(نحو) ،دەڵێن: عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، چەند بنەمایەکی بە(أبو الأسود الدوئلي)گوتووە، پاشان ئەو هەموو لق و پۆپەی لێ بوونەوە، هەروەها زانستەکانی دیکەش بەهەمان شێوە، پێشێ بە سادەیی دەست پێدەکەن، دوایی ئاڵۆز دەبن.

سەرەتا تەصەووف، وەك دنیا بەکەمگرتن(زهد) دەستی پێکرد، هەروەها خۆ یەکلا کردنەوە بۆعیبادەت و تاعەت، لەسەرەتاوە هیچ کەس وشەکانی: (صوفي) و (عابد) و (زاهد) و ئەوانەی بەکار نەدەهێنان، چونکە هیچ ناوێك لەناوی هاوەڵ (صحابي)گەورە تر نەبوو.

هەتا وشەی (صحابي) هەبێ، بۆ ناساندنی ئەو جیلەی، کە لەگەڵ پێغەمبەر دابوون(صلى الله عليه وسلم)، کە گوتت: (صحابي)، یانی: دەبێ: عابیدو زاهیدو عالیم و موجاهیدیش بێ، لەدوای وانیش وشەی (تابعين) بەکار دەهێنرا.

بۆ وێنە: حەسەنی بەصرِیی (سيد التابعين)ە، دوای ئەوانیش پێیان دەگوتن: (تابعي التابعين)، یانی هەتا ئەو نازناوانە هەبوون، وشەی دیکەیان بەکار نەدەهێنا، پێشێ زیاتر وشەکانی: (عُبّاد، زُهّاد، نُسّاك) بەکار دەهێنران، ئنجا دوایی وشەی(صوفي) بەکارهات.

تەصەووف زیاتر لە سەدەکانی (سێ و چوار)ی کۆچییدا گەشەی کرد، زانستەکانی دیکەش، هەتا کۆتایی سەدەی چوار هاتوون و گەشەیان کردوە.

(تەفسیر، فیقهـ، فەرمـوودە، قیرائـات، مێـژوو، عیلمـی کەلام) ئەو کـاتە بەڕاسـتیی مسـوڵمانان خەریکـی پێشـکەوتن و داهێنـان (إبـداع) بـوون لە دنیـاداو، خەریکی شوێن کەوتن(إتباع) بوون لە خواپەرستییدا، نەك لاسایی کردنەوەی کوێرانە.

بۆیە لەو کاتەدا مسوڵمانان توانیان گەشە بکەن و، بەرەو پێش بچن لە هەمـوو ڕوویـێکەوەو، هەمـوو زانسـتەکان لەوێـوە گەشـەیان کـرد، دوایـی، کە دەرگـای ئیجتیهادیـان داخست لە هەمـوو ڕووەکـانەوە، ئەو شتانە شکڵیان گرت و شکڵێکی قاڵب بەستوویان گرت، ئیدی لەوێوە لەڕووی فیکریی و سیاسیی و ...هتدەوە، بەرەو سەرەو لێژ بوونەوە چوون.

دەتوانین ئەهلی تەصەووف لەو دوو سەدەی سێ و چوارەدا، بۆ سێ چین دابەش بکەین:

**چینی یەکەم:** ئەو تەوژمە بوون، کە زیاتر بەم شتانە ناسرا بوون: دنیا بەکەمگـرتن و خۆ دوور گرتن لە دنیـاو، زێدەڕۆیی کردن لە عیبـادەتی شەخصییدا، بەشێوەیەك، کە تۆزێـك جیـاواز بـوو لە هـی پێشـینی یەکەم، لەهـی چینـی یەکەمـی هـاوەڵان و شوێنکەوتوان.

ئەوانەی، کە لەم چینی یەکەمەدا، زیاتر دیار بوون، ئەمانە بوون:

١- الحارث المحاسبي: (٢٤٣)ك.

٢- الشيخ جنيد البغدادي، (أبـو القاسـم الخزّاز) (٢٩٨)ك، نازناوی (سيد الطائفة)ی هەبووە.

٣- أبو سليمان الداراني: (٢١٥)ك.

٤- السري السقطي: (٢٥٣)ك.

٥- سهل بن عبدالله التستري: (٢٧٣)ك.

٦- هەر لەو سەردەمەدا جووڵانەوەیەك سەری هەڵدا بەناوی: (الحركة الملامَتيّـة) کە (حمدون بن أحمد القصّار النيسابوري) (٢٧١)ك، سەرپەرشتیی دەکرد.

(الملامتية) واتە: ئەوانەی هەمیشە خەریکی لۆمەو سەرزەنشتی خۆیان بوون.

جارێ لەم چینی یەکەمەدا، شتی فیکرییان تێکەڵ نەکردبوو، تەنیا گرنگیی دان بوو بە عیبادەتی شەخصیی و، پاککردنەوەی ناخ و دڵ و دەروون.

**چینی دووەم:** لەم چینەدا، عیبادەتە شەخصییەکان تێکەڵ کران، لەگەڵ هەندێ زاراوەو وشەی (باطینیی)، بەڵام نەك بەمانا شیعییەکەی، بەڵکو بەمانای ئەوە، کە دیوی پەنهانی شتەکانیان باسدەکرد.

هەندێ تەعبیریان بەکار دەهێنان، خۆیان زیاتر لێی تێدەگەیشتن، عیبادەت کردنی شەخصیی لە مومارەسەی کردەوەییەوە، گواستییەوە بۆ ئاستی تیۆرامانێکی تەجریدیی تیۆریی و، هەندێ زاراوە پەیدا بوون وەك: (الوحدة، الفناء، الصحو، الكشف، البقاء، الأحوال، المقامات، ...)، ئەوانە کۆمەڵێك زاراوە بوون، ئەهلی ئەو بازاڕە بەکاریان دەهێنان، مەرجیش نییە بە مەبەستی خراپ بووبێ:

١- (الوحدة): مەبەستیان خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا دیتن و، تەنیا خوا بە هەمەکارە زانین، بوو.

٢- (الفناء في الله): ئەمە واتای ڕاست و هەڵەشی هەیە: مانا ڕاستەکەی یانی: وات لێبێ لەبەرامبەر شەرعی خوادا، دەمارێکت نەمێنێ بجووڵێ پێچەوانەی شەرعی خواو، تەواو تەسلیمی خوابی.

بەڵام بەمانای (وحدة الوجود)، کە ئینسان لەخوادا بتوێتەوەو بوونی نەمێنێ، یاخود خوا لە ئینساندا بەرجەستە ببێ، وەك دەڵێن: (حەللاج) وایگوتووە، ئەوە واتایەکی هەڵەیە.

٣- (الصَّحو): واتە: ئینسان هەمیشە هۆشیارو بێدار بێ، لەبەرامبەریدا (مَحو) هەبووە، واتە: ئینسان مەحو بێتەوەو نەمێنێ لەبەرانبەر خوادا.

٤- (الكشف): واتە: دەرکەوتن.

٥- (البقاء): ئەوەیە، کە تۆ بمێنییەوە، بەڵام بەخواوە بمێنییەوە.

٦و٧- (الأحوال والمقامات): کۆی حاڵ و مەقامن، حاڵ ئەوەیە، کە دەوام ناکات و، مەقام ئەوەیە، کە دەوام دەکاو دەمێنێتەوە، ئەو حاڵەتانەی، کە ئینسان پێیاندا دەڕوات، لە کاتێکدا، کە خەریکی تەزکیەی نەفسی خۆی دەبێ.

ئەوانەی لەم چینی دووەمەدا زیاتر دیار بوون:

١- (أبو یزید البسطامي)، ناوی (طیفور) بووە، لە (٢٦٣ك)دا وەفاتی کردووە، لەڕووی کاتەوە لەگەڵ تەبەقەی یەکەم تێکەڵ بووە، بەڵام {ئەبویەزید} هەندێ وشەی بەکار هێناون، کە ئەوانەی پێشێ بەکاریان نەهێناون، ئەگەرنا لەڕووی کاتەوە هەندێ تێکەڵن.

٢- ذو النون المصري: (٢٤٥)ك.

٣- الحلاج (أبو منصور): (٣٠٩)ك.

٤- أبو سعید الخراز: (٢٧٧)ك.

٥- الحکیم الترمذي: (٣٢٠)ك.

٦- أبو بکر الشبلي: (٣٣٤)ك.

چینی سێیەم: لەم چینەدا، تەصەووف وردە وردە لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانییدا ئاوێتە بوو، هەندێ بیرۆکەش پەیدا بوون، وەك:(حلول)،کە ئەوەیە خوا بێتە نێو جەستەی مرۆڤەوە،(إتحاد)یش ئەوەیە: مرۆڤ لەگەڵ خوادا یەك بگرێ،(وحدة الوجود) ئەوەیە، کە بوون(وجود)، هەمووی بەیەك تەماشا بکەی.

واتە: بوون هەمووی یەك شتەو، خواش ڕووحی ئەو بوونەیە، کە ئەوە کوفرو شیرکە، ئەگەر ئینسان لەحاڵەتی ئاساییدا بیڵێ، بەڵام هەندێ حاڵەتی ڕووحیی، کە بەسەر مرۆڤدا دێ.

زۆر لە زانایان دەڵێن: لەو کاتەدا، کە ئینسان هۆشی لەخۆی نەبێ، بۆی بە کوفر لەقەڵەم نادرێ، ئینسان هەندێ حاڵەتی ڕووحیی بەسەردادێ، تەنیا خوا دەبینێ و، ئەو دروستکراوانەی دیکە، هەموویان وەك خەیاڵ دێنە بەرچاوی، ئەوە کە غەیری خوا، هەمووی وێنەو دیمەنی بۆش و وەهمە! هەندێ لە فەیلەسوفەکان

قسەی وایان کردووە، ئەو ئەهلی تەصەووفەش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەو فەلسەفەیە.

هەر لەو سەردەمەشدا بیردۆزەی: (فیض)و(إشراق)لەسەر دەستی (ئەبو حامیدی غەززالیی) و (سوهرەوەردیی) پەیدا بوون، (هەرچەندە من پێم وایە (غەززالیی) بەو شێوەیە نەبووە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو سەرچاوەیەی من لێم وەرگرتوە، وا دەڵێ، بەڵام من پشتڕاستی ناکەمەوە، هەرچەندە ئەبو حامیدی (غەززالی)یش باسی دەکا، بەڵام نەك بەو شێوەیەی، کە (سوهرەوەردیی) باسی دەکات،(سوهرەوەردیی )بە فەرمانی (صەلاحەددینی ئەییوبی) وەك سزادان کوژراوە،بەڵام (ئەبو حامیدی غەززالیی) پیاوێکی زۆر پابەند بووە بەشەریعەتەوە).

لە دیارترین کەسایەتییەکانی ئەم چینی سێیەمە:

١- الحلاج: (٢٤٤-٣٠٩)ك.

٢- السهروردي: (٥٤٩-٥٨٧)ك.

٣- إبن عربي: (٥٦٠- ٦٣٨)ك.

٤- إبن الفارض: (٦٣٢)ك.

٥- إبن سبعين: (٦١٣-٦٦٧)ك.

ئەمانە دیارترین کەسایەتییەکانی ئەم چینی سێیەمە بوون، کە لەو چینی سێیەمەوە، تەصەووف و ڕێبازەکانی تەصەووف، بەرەو لادان و دووركەوتنەوە لە شەریعەت چوون.[1]

---

[1] الموسوعة العربية، ج٦، ص٥١٣-٥١٧،و(الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة)، ج١، ص ٢٤٩.

تەوەری شەشەم:

## سەرهەڵدانی ڕێبازەکانی تەصەووف و گرنگترین ڕێبازەکانی

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان: یەکەمین کەسێك، کە پەیکەری ڕێبازی تەصەووفی دانا {کە ئێستا تەریقەتەکان (چ قادریی چ نەقشیی و...هتد) دەڵێن: وەریانگرتووە لە فلان و ئەویش لە فلان و تا کۆتایی}، یەکەمین کەس کە داینا، پیاوێك بوو بەناوی:(أبو سعيد محمد بن أحمد الميهمي الصوفي الإيراني)[1] {وڵاتی ئێران کاتی خۆی هەموویان ئەهلی سوننەت بوون، لەسەردەمی صەفەوییەکانەوە، سوننییەکان پاکتاو کران، ئەگەرنا: (غزالي، رازي، ترمذي، أبو داود، راغب الأصفهاني ...هتد)، ئەوانە هەموویان خەڵکی ئێران بوون.

ئێران، جگە لە کەمێك، شیعەی هەر لێ نەبوون، بەڵام لەسەردەمی صەفەوییەکاندا، سوننەیان قەلاچۆکردو هەمووی چوو بۆ دەرەوەی ئێران، ئێستا دەورو بەری ئێران هەمووی سوننەیە، تورکمانستان و بلوچستان و کوردستان و خوزستان، هەرچواردەوری سوننەیە، بەڵام نێوەڕاستەکەی، مەگەر چۆن، ئەگەرنا سوننەیان تێدا نەهێشتوە}.

ئەو کابرایە لەنێوان ساڵانی: (٣٥٧-٤٣٠ك)دا ژیاوەو قوتابی (أبو عبدالرحمن السلمي) بووە، یەکەمین کەس بووە ،کە پەیکەری تەنزیمیی بۆ ڕێیبازەکانی تەصەووف داناوە، بە زنجیرە گوتوویەتی: فلان لە فلان، فلان لە فلان، بەزۆرییش وایە بردوویانەتەوە سەر عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ)، پێم وایە تەنیا تەریقەتی نەقشبەندیی دەچێتەوە سەر ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەگەر نا ئەوانی دیکە بەزۆریی، دەچنەوە سەر عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)!

---

[1] الموسوعة الميسرة في الأديان .... ج١ ص٢٤٩-٣٠٣ ، و (الموسوعة العربية)، ج٦ ص٥١٣-٥١٧.

ئنجا بۆ زانیارییتان! ئەمە ئەصڵ و ئەساسی نییە، هەرچەندە بەشێك لە ئەهلی تەصەووف، جاروبار هەندێك قسەی ئێمەیان لەسەر دڵ گران بووە، ئەوەشیان زۆر پێ ناخۆشە، بەڵام وەك یەكێ لە زانایان دەڵێ: فڵان كەسمان خۆش دەوێ، بەڵام هەقمان لەوی خۆشتر دەوێ! ئەوە، كە ئەبوو بەكری صیددیق، یان عەلی كوڕی ئەبی تالیب دانیشتبێ و بە یەكێكی گوتبێ: ئەوە بەتایبەتیی ئیجازەی تۆم دا، بچۆ تەزكیەی نەفس و تەعلیمی خەڵك بكە! ئەوە هیچ ئەصڵ و بناغەیەكی نییە.

ئەو شەجەرانەی هەڵیان دەواسن، وەك ڕیشەی خزمایەتیی، كە دەچێتەوە سەر پێغەمبەر، ئەوە جیایە، دەچێتەوە سەری، یان نا؟

لەوەدا گرفتمان نییە، بەڵام ئەوە، كە ئەو شێخە لەوەی پێش خۆی وەرگرتبێ و، ئەویش لەوو، ئەویش لەو ...هتد، ئەوە هیچ بنەمایەكی نییە.

بەڵێ، دەزانم لەم دواییانەدا ئەوە هەیە، بەڵام ئەوە ،كە لە هاوەڵان و شوێنكەوتوانەوە ئەو كارەیان كردبێ، شتی وا نییە.

یەكەمین كەس، كە دایناوە، ئەو كابرایەیە، كە صۆفییەكی ئێرانیی بووەو، لەسەدەی چوارەم و پێنجەمی كۆچییدا ژیاوە[(١)].

یەكەمین كەسیش، كە كەلەپووری زانستەكانی تەصەووفی كۆكردەوە لە كتێبێكدا، بە شێوەیەكی كۆكەرەوە (أبو حامد الغزالي) بوو، كە لەنێوان ساڵانی:(٤٥٠-٥٠٥ك)دا ژیاوە، بەڵام بەتەئكید ئەبو حامید لە سفرەوە دەستی پێ نەكردوە، بەڵكو لە كتێبی(قوت القلوب)ی (أبو طالب المكي) و (الرعاية)ی (المحاسبي)و، زانایانی دیكەی پێش خۆی، كە شتیان لەو بارەوە نووسیوە، لە هەموویان سوودی بینیوە، مەوسووعەیەكی داناوە ،كە پێم وایە: هەتا ئێستا هی وەك وی، دانەنراوە، هەڵبەتە مەوسووعەكەشی تەنیا تەزكیەو تەصەووف نییەو، زۆر فراوانە، هەم ناوەكەی و هەم نێوەڕۆكەكەی:(إحياء علوم الدين) {زیندووكردنەوەی زانستەكانی ئایین}، بەڵام زیاتر بەنەفەسێكی ڕووحیی و تەزكیەیی نووسراوەو، فراوانترین كتێبی تەزكیەو

---

(١) (إبن تيمية)ش دەڵێ: ئەوە هیچ بەڵگەیەكی نییە لە قورئان و سوننەتداو، دواتر هەندێ لە (مشائخ) پێیان پەسند بووەو دایانهێناوە، بڕوانە:(مجموع الفتاوى) ج١ (التصوف) ص٢٧٨،٢٧٩.

تەصەووفە، تاکو ئێستاش، بەر لەوەش چەندان کتێبی دیکەشی نووسیون، دواتر دانانی کتێبی تەصەووف بەردەوام بوو، لەلایەن پسپۆڕانی ئەو بوارەوە.

### ناودارترین ڕێبازەکانی تەصەووف:

ناودارترین ڕێبازەکانی تەصەووف بەپێی زانیاریی من، کە بەدواداچوونم بۆ کردوە، ئەو پازدەیەن، کە ئێستا ناویان دەهێنم، دەشگونجێ زیاتر بووبن، لە هەندێ شوێنی دنیادا هەندێ ڕێباز بووبن، ئێستا نەمابن، شوێنکەوتوویان نەمابن.

ئنجا بەر لەوەی تەریقەتەکان بژمێرم، دەمەوێ لە مەسەلەیەك ئاگادارتان بکەمەوە:

با هیچ کەس وا گومان نەبا: (شێخ عەبدولقادری گەیلانیی) دانیشتبێ گوتبێتی: وەرن مسوڵمانینە! ڕێبازێکتان بۆ دادەنێم، کە ڕێبازی قادرییە، یان (شێخ بەهائەددین نەقشبەندیی) گوتبێ: وەرن مسوڵمانان! بەدوای تەریقەتی نەقشبەندیی بکەون، هەرگیز شتی وا نەبووە.

هیچ کام لە ناودارانی تەزکیەو تەصەووف، ئەوانەی، کە بۆ خوا صوڵحاوبوون، دانەنیشتوە بەخەڵك بڵێ: وەرن بەدوای من بکەون! چونکە عەبدولقادری گەیلانیی و ئەوانی دیکەش کتێبیان هەیە، گوتوویانە: خەڵکینە! وەرن! ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، پەیڕەویی لێ بکەن، بەڵام خەڵکەکە لەدوای وان، لەبەر ئەوەی باش بۆیان ئیستیعاب نەکراوە، لەباتی ئەوەی بڵێن: ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەتێگەیشتنی عەبدولقادری گەیلانیی، یەکسەر گوتوویانە: ڕێبازی فلانکەس، ئێستا من دڵنیام شێخ عەبدولقادری گەیلانیی زیندوو بێتەوە، زۆر ناڕازی دەبێ لەوەی ئەو ڕێبازە بەناوی ئەوەوە، بکەن! چونکە دەبێ هەموو کەس بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەوێ.

له یادداشته‌كانی[1] خۆمدا نووسیومه: له ساڵی (١٩٨٠)دا (شیخ ناظم العاصي)م بینی، به پیاوێكی زۆر چاكم هاته بەرچاو، هەندێ كەرامەتم لێ بینین، سێ شەو له خزمەتی مامەوه له گوندی (سبعة) بوو، لێم پرسی: جەنابت لەسەر چ تەریقەتێكی؟

تەریقەتی نەبهانیی؟

گوتی: له سەرەتاوه سوودمان له تەریقەتی نەبهانیی بینیوه (نەبهانیی شێخێك بووه له سووریا) پێشێ وا بووم، بەڵام ئێستا: {أنا على الطريقة المحمدية} لەسەر ڕێگای موحەممەدییم.

قسەكەی زۆر جوان بوو، لەڕاستییدا ئەو پێشەوایانەی تەصەووف، هەر ویستوویانه خەڵك بانگ بكەن بۆ سەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام زۆر جار شوێنكەوتووەكانیان وا نەبوون و وا تێنەگەیشتوون.

**ناودارترین ڕێبازەكانی تەصەووف:**

١- تەریقەتی قادریی (الطريقة القادرية)، پاڵ دەدرێته لای (عبدالقادر الجيلاني): كه له ساڵی (٥٧١ك)دا كۆچیی دوایی كردوه.

٢- تەریقەتی ڕیفاعیی (الطريقة الرفاعية)، پاڵ دەدرێته لای (أحمد بن أبي الحسين الرفاعي)، كه ناسراوه به (أبو العباس)و له ساڵی (٥٤٠ك)دا كۆچیی دوایی كردوه.

٤- تەریقەتی سوهرەوەردیی (السهروردية) پاڵ دەدرێته لای (شهاب الدين أبي الفتوح محي الدين بن حسن) (٥٤٩-٥٨٧)ك، خاوەنی قوتابخانەی (الإشراق)ه.

ئەو قوتابخانەیه گوتوویانه: ئەگەر ئینسان زۆر خۆی پاك بكات و، خۆی تەزكیەو چاك بكات، دڵ و سینەی بەرامبەر به (اللوح المحفوظ) وەك

[1] چەند مەڵۆیەك له خەرمانی تەمەنم: ١٩٦١-١٩٩١ز.

ئاوێنەیەکی لێدێ، چی لە(اللوح المحفوظ)ی خوادا هەیە، ئەویش بەقەدەر خۆی، ئەو شتانەی لە دڵ و دەروونداعەکس دەبنەوە!

هەڵبەتە ئەو قسەیە هەقی تێدایە، بەڵام ناهەقیشی تێدایە، هەقەکەی ئەوەیە، کە ڕاستە ئینسان، تاکو صاف و ساغتر بێ، چاکتر لە هیدایەتی خواو لە قورئان و سوننەت، بەهرەمەند دەبێ، بەڵام مانا باتیڵەکەی ئەوەیە: ئەوان پێیان وابووە: ئەگەر ئینسان زۆر خۆی صاف و ساغ بکاتەوە، ئەگەر بێت و قورئان و سوننەت و شەریعەتیش نەخوێنێتەوە، هەر بەتەنیا خۆی پاك و چاك بکات، هیدایەتی خوا لە دڵیدا دەدرەوشێتەوە! کە بێگومان ئەوە ڕاست نییە.

ئنجا ئەم (سوهرەوەردی)یە بە فەتوای زانایانی حەڵەب، لەکاتی خۆیدا کوژراوەو تۆمەتبار کراوە بە زەندەقە، صەلاحەددینی ئەییوبیی دوای ئەوەی زانایان فەتوایان بۆ داوە، فەرمانی کردووە بە کوشتنی.

٤- (المدرسة الأكبرية أو مدرسة وحدة الوجود): ئەویش پاڵ دەدرێتە (محي الدين ابن عربي)، کە بە (الشيخ الأكبر) ناسراوە لە ساڵانی: (٥٦٠-٦٣٨ك)دا ژیاوە، ئەو پیاوە مشت و مڕو هەرای زۆری لەسەرە، بەتایبەت کتێبەکەی (الفتوحات المكية)، کە قەت ئامۆژگارییتان ناکەم، بیخوێننەوە، بەحرێکە زۆر کەسی تێدا نقووم دەبێ و هەندێك شتی تێدایە ،کوفر و دەرچوونە لە بازنەی ئیسلام.

کتێبێکی دیکەشی هەیە: (فصوص الحِكم)، کە ئەو کتێبە کوفری بە ئاشکرای تێدایە، نازانم چەندی هی خۆیەتی و چەندی ڕەگەڵ خراوە!

شایانی باسە، ئەم پیاوە خۆی بە(خاتم الأولياء) داناوە، بەڵام گوتوویەتی:(خاتم الأولياء)مەرج نییە هیچ وەلی دیکەی بەدوادا نەیەت، هی دیکەش دێن، بەڵام هیچیان وەك وی نابن!!

هەندێ لە کتێبەکانیشی، وەك کتێبەکانی زانایانی دیکەی مسوڵمانانن، بۆیە زانایەکی پایەبەرزو لێکۆڵەرەوەی وەك(إبن تيمية) دەڵێ: ئێمە دەڵێین: ئەو

قسانە کوفرو شیرکن، بەڵام خاوەنەکەی، تەنیا خوا دەزانێ لەسەر چ حاڵێك مردووە.

ئنجا ئایا قسەکانی هی خۆینی، یان خراونە نێو قسەکانییەوە؟

ئایا ئەو قسانەی، کە کردوونی، لە حاڵەتی ئاسایی دابووە، یان لەحاڵەتێکی وا بووە، کە حاڵ (وَجْد) بەسەریدا زاڵ بێ؟

یان ئایا لەو قسانەی گەڕاوەتەوە، یان لەسەریان مردوە؟

ئێمە نازانین و عاقیبەتەکەی بەس خوا دەزانێ چۆن بووە[1]، چونکە ئینکاریی ناکرێ، زانایەکی زۆر گەورەش بووە، بەڵام قسەشی هەن بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خوا بەیەکگرتندا ناگونجێن، بەتایبەتی لە (فصوص الحکم)دا، کە من بە شەرحەوە خوێندوومەتەوە.[(2)]

٥- تەریقەتی شازلیی (الشاذلیة)، کە پاڵ دراوەتە لای (أبو الحسن الشاذلي)، (٥٩٣-٦٥٦)ك، کە یەکێ لە ناسراوترین شوێن کەوتوانی: (أبو العباس المرسي): (٦٨٦)ك، هەروەها یەکی دیکە لە قوتابییە زۆر ناسراوو ناودارەکانی، کە من زۆریشم خۆش دەوێ: ناوی (تاج الدین أحمد بن عطاءالله السکندري)ە، کتێبێکی هەیە بەناوی (الحکم العطائیة)، تاکو ئێستا لەوانەیە دەیان شەرحی لەسەر کرابن، من لە کتێبەکانی خۆمدا جارجار قسەکانی دەهێنم.

٦- البدویة، أحمد البدوي: (٥٩٦-٦٣٤)هـ.

٧- المولویة، جلال الدین الرومي: (٦٧٢)هـ.

٨- النقشبندیة، محمد بهاءالدین نقشبند: (٧٩١)هـ.

٩- الدسوقیة، إبراهیم الدسوقي: (٦٣٣-٦٧٦)هـ.

---

[1] بڕوانە (جلاء العینین) للعلامة نعمان الآلوسي، ص٥٨.

[2] لە بەشی نۆیەم دا بەدرێژیی باسی بیرۆکەی یەکبوویی (وحدة الوجود) بەگشتیی و (إبن عربي)مان کردوە، بەتایبەت.

١٠- السنوسية، محمد بن علي السنوسي: (١٢٦١-١٣١٩هـ/ ١٨٤٤-١٩٠٢م).

١١- الختمية، محمد عثمان بن محمد أبو بكر بن عبدالله الميرغني المحبوب، ويلقب بالختم: (١٢٠٨-١٢٦٨)هـ.

١٢- البريلوية، أحمد رضاخان بن تقي علي خان: (١٢٧٢-١٣٤٠هـ/١٨٦٥-١٩٢١م)

١٣- المهدية، محمد أحمد المهدي بن عبدالله: (١٢٦٠-١٣٠٢هـ/ ١٨٤٥-١٨٨٥م)، ئەو ڕێبازە لە وڵاتی سوودانە و مەشهووریشە.

١٤- التيجانية، أبو العباس أحمد بن محمد بن المختار بن أحمد بن محمد سالم التيجاني: (١١٥٠-١٢٣٠هـ/ ١٧٣٧-١٨١٥).

١٥- الطيبية، السلطان المغربي مولای طيب: (١٢٨٦)هـ.[١]




[١] الموسوعة العربية، ج٦ ص٥١٣-٥١٧، والموسوعة الميسرة في الأديان ...ج١ ص٢٤٩-٣٠٣.

## تەوەری حەوتەم :
## هەڵسەنگاندنێکی کورت بۆ تەصەووف و تەزکیەی نەفس

بەڕێزان!

لە حەوت خاڵاندا ئەو هەڵسەنگاندنەتان بۆ دەکەم:

**١)- تەزکیەی نەفس و قوتابخانەو ڕێبازەکانی، کە کاریان کردووە**، بۆ ئەوەی مسوڵمانان دەستیان گیربێ لە تەزکیەی نەفس و پاك و چاك بوون، ئائەو ڕێبازانەو، ئەو کەلەپوورە، وەك سەرجەم بەرهەم و ئەزموونی بەشەر، چ لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، چ لە بواری فیقهدا، چ لە بوارەکانی: ئوصوڵی فیقهو، تەفسیرو، فەرموودەناسیی و لە هەموو بوارەکاندا، ڕاست و چەوت و چاك و خراپی تێدایە، ئەوە هیچ گومانی تێدا نییە، چونکە بەشەر هیچ کاتێك هەقیقەتی تەواوو ڕەهای لەلا نییە، بۆخۆی ڕێژەیی (نسبي)یەو، ئەو شتانەش، کە لەبەشەرەوە دەردەچن، وەك خۆینی.

واتە: دەگونجێ ئەندازەیەك ڕاستییان تێدابێ و، هەندێ هەڵەشیان تێ کەوتبێ، هەروەها دەگونجێ بە نسبەت کاتێکەوە: ڕاست بووبن و، بەنسبەت کات و شوێنێکی دیکەوە: هەڵەبن.

بەڵام ئەوەی، کە پەیوەست دەبێ بە وەحییەوەو، لە وەحییەوە سەرچاوە بگرێ، بە ئەنـدازەی ئەوە ،کە لە وەحییەوە سەرچاوەی گرتووە، لە حەقیقەتی ڕەها نزیك دەکەوێتەوە، بەڵام زانایان بنچینەیەکیان داناوە، کە مامۆستا سەعیدی نوورسیی لە کتێبەکانی خۆیدا زۆرجار دەیڵێ: {خُذ ما صَفا دَعْ ما كَدر.......... ئەوەی، کە صاف و چاکە، وەریبگرە، ئەوەشی کە لێڵە، وازی لێ بێنە، }.

ئێمەش دەبێ ئاوا بەپێی ئەو بنچینەیە مامەڵە بکەین، لەگەڵ کەلەپووری بواری تەزکیەی نەفسدا، هەروەك لەگەڵ کەلەپووری بواری: (فیقهـ، تەفسیر، فەرموودەناسیی و ..هتددا).

**٢)- وەك چۆن لە بواری فیقهدا، مەزهەبە فیقهییەکان(المذاهب الفقهية)هەن و، لە بواری عەقیدەدا، قوتابخانە کەلامییەکان(المدارس الکلامية) هەن،** بەهەمان شێوە، لەبواری ئەخلاق و تەزکیەی نەفسیشدا، قوتابخانەکانی تەزکیە (المدارس التزکوية)مان هەن،کە بێگومان ئەوانەش هەموویان ئەزموونی ڕووحیی و دینداریین، خاوەنەکانیان کەم و زۆر بەشوێن پێی پێغەمبەردا هەنگاویان ناوە، ئەوە نەبووە شتەکە پاڵ بدەنە لای خۆیان، قسەیان لە گیرفانی خۆیان دەرنەهێناوە، بەڵکو ئیجتیهادیان کردووە.

دەگونجێ پێکابێتیان، کە بە تەئکید بە ئەندازەی نزیکییان لە وەحییەوەو،بەئەندازەی پابەندییان بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) پێکانیان زیاتر بووە، دەشگونجێ نەیانپێکابێ، بەئەندازەی ئەوە، کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی عەقڵی خۆیان، میزاجی خۆیان، هۆکارە دەرەکییەکان، هەواو نەفس و شەیتان، دیارە جگە لە پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لێبێ)، هیچ کەس لە هەڵەو کەم و کوڕیی پارێزراو نییە.

**٣)- وەك چۆن جەستە پێویستیی بە مەشق و ڕاهێنان هەیەو، پێویستیی بەپارێزگاریی لێکردن هەیە**، وەك خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف

خوای بەرز هەقی جەستە، بەیان دەکات، هەم بەبارە ئەرێنییەکەیدا: (وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟)، هەم بەبارە نەرێنییەکەیدا: (وَلَا تُسْرِفُوٓا۟) پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: { إِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا }.[(١)]

خودی خۆت (ڕووح و جەستەت) هەقی بەسەرتەوەیە، ئنجا وەك چۆن مرۆڤ جەستەی هەیەو، پێویستیی بەوەیە هەقی بۆ جێ بە جێ بکرێ، ڕووحیشی هەیەو ئەو ڕووحەش پێویستیی بە خزمەت هەیە، بە هەردووك باریدا، بە باری ئیجابییدا:

---

(١) أخرجه أحمد برقم: ٦٨٧٨ قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: صحيح, وهذا إسناد حسن.

خۆراکی بدرێتێ، پاك ڕابگیرێ، بەباری سەلبییشدا: پارێزگاریی لێبکرێ و دوور بخرێتەوە، لەو شتانەی، کە لێیان تووشی زیان دەبێ.

ئنجا بە ئەندازەی ئەوە، کە جەستە، مرۆڤ خەمی لێدەخواو، مشووری لێدەخواو، خزمەتی دەکات، بەهێز دەبێ و ساغ دەبێ، ڕووحیش بە هەمان شێوە: بەئەندازەی ئەوە، کە خەمی لێدەخۆی: ڕووحەکە صاف دەبێ، ساغ دەبێ، چاك دەبێ و پاك دەبێ.

بۆ وێنە: دوو کەس وەك یەکن، یەکێکیان: کە خواردنی تەندروست بخوات و، ئاوی پاك بخواتەوەو، ئاگای لە جەستەی خۆی بێ و، بیپارێزێ لە خواردنی زیان بەخش و، وەرزشی پێ بکات و پاکی ڕابگرێ و، دووری بخاتەوە لەو شوێنانەی، کە زیانی لێدەدەن، یەکیان ئاوا لەگەڵ جەستەیدا مامەڵە بکات.

ئەوی دیکەش: کە گوێ نەدا بە پاك و خاوێنیی جەستەو وەرزش پێکردنی و، گوێ نەدا بە خواردنەکەی داخۆ تەندروستە، یان نا؟ نەیپارێزێ لەو شتانەی، کە زیانی لێدەدەن، بە دڵنیایی وەك یەك نابن.

بەهەمان شێوە ڕووحێکیش، کە خاوەنەکەی خزمەتی دەکات، لەگەڵ ڕووحێکدا، کە خاوەنەکەی خزمەتی ناکات، وەك یەك نین، ئەوە گومانی تێدا نییە.

ئامانجی عیلمی تەزکیەش، کە وەك گوتم: بە (عیلمی تەصەووف) ناوی دەرکردوە، بریتییە لە خزمەتکردنی ڕووح، خزمەتکردنی ڕووح بە هەموو شێوەکان، بۆ ئەوەی پاك بێ، چاك بێ و، گەشە بکات و لەخوا نزیك بێ و پابەند بێ بە شەریعەت، ملکەچ بێ بۆ شەریعەت، بەشوێن پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هەنگاو بنێ و، بێزار کراو بێ لە سیفەتە نزمەکان و، ڕازاوە بێ بە سیفەتە بەرزەکان، عیلمی تەزکیەو تەصەووف، ئامانجەکەی ئەوەیە.

**٤)- وەك چۆن بۆ فێر بوونی زانستەکانی دیکە، مامۆستا پێویستەو، کەس لەخۆوە فێری:** پزیشکیی و زمان و فیزیاو کیمیاو، هەر زانستێکی دیکە نابێ، یان بەبێ مامۆستا زەحمەتە فێر بێ، بەهەمان شێوە لە بواری تەزکیەو بۆ خوا

صولّحاندا، ئەگەر ئینسان مامۆستاو چاو ساغێکی هەبێ، ڕێی بۆ کورت دەکاتەوە، بە پێچەوانەشەوە: ڕێیەکەی زۆر بۆ درێژ دەبێتەوە.

هەروەها دەشگونجێ پێی هەڵخلیسکێ و بەم لاو لادا بکەوێ، ئەو قسەیەش، کە پێشتر لەم کتێبی: {ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون}دا هێناومەو شیکردنەوەشم لەسەرکردووە: {مَن لم يَكن لَه شَيخ فَشَيخه الشَّيطان}، ئەو قسەیە ئاوا لەو چوار چێوەیەدا، دەبێ تەماشای بکەین و بارە ڕاستەکەی ئەوەیە: ئەگەر کەسێك مامۆستایەکی نەبێ، چاو ساغێکی نەبێ، دەستی بگرێ، ڕێی لێ تێکدەچێ، ئنجا چ شەیتانێکی ئینسیی خۆی لێدەکات بەشێخ و بە چاو ساغ، چ شەیتانێکی جینیی وەسوەسەو خەیاڵی خراپی بۆ دەکات، ئەوە واقیعێکەو هەیە، ئەوە بارە ڕاستەکەیەتی، بەگشتیی وایە، بۆ هەر شتێك ئینسان پێویستیی بە چاوساغێکە، بەڵام من دەمەوێ ئەوەشتان پێ بڵێم:

بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتووە: ئەگەر ئینسان مامۆستایەکی دەست نەکەوت، بەتایبەت بۆ بواری لەخوا نزیك بوونەوەو بەرەو خوا چوون، پەکی ناکەوێ، چونکە قورئان و سوننەت ئەو دوو سەرچاوە ڕوون و بێ چەندو چوونەن، کە هەموو شتێکیان تێدایە، بۆ لەخوا نزیك بوونەوەی مرۆڤ، بۆ پاك بوون و چاك بوونی مرۆڤ، هیچ گومانی تێدا نییە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە: ئایا هەموو کەس توانای هەیە ڕاستەوخۆ لە قورئان و سوننەت تێ بگا؟

کێشەکە لێرەدا هەر ئەوەیە، ئەگەرنا مامۆستایەکەش، کە دەبێتە چاو ساغ، لەدەرەوەی قورئان و سوننەت، شتێکی دیکەت بۆ ناهێنێ، هەموو ڕێگاکان بەرەو لای خوا بەستراون، تەنها ئەو ڕێگایە نەبێ، کە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم).

کەواتە: هونەری مامۆستاو شێخ و ئوستاد، ئەوەیە، کە دەستت بگرێ و بتخاتە سەر سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی قورئان و سوننەت، کە هەموو کەس ئەو توانایەی نییە.

ئەوە دیارە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مامۆستاو چاو ساغی هاوەڵان (صحابة) بووە، شوێنکەوتوان(تابعين) نەمانبیستوە ڕێبازێکی دیارییکراویان بووبێ.

ئەوە (حەسەنی بەصرای)یە، (ئیبن و سیرین)ە، لەدوای وان شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان (تابعي التابعين)، لەدوای ئەوانیش پێشەوایانی مەزهەبەکان، کە هەشت مەزهەبی نووسراو(مُدَوَّن)مان هەن،کە ئێستا شوێنکەوتوویان هەن، پاشان ئەوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) کۆ کردەوە.

هەروەها ئەو زانایانەی لەبواری تەفسیر، یان فەرمووددا شارەزا بوون، نەمانبیستوە، نەڕێبازێکی دیارییکراویان هەبێ، نە شێخێکی دیارییکراویشیان هەبێ، چونکە توانیویانە یەکسەر شتەکان لە قورئان و سوننەت هەڵهێنجن.

تۆ مامۆستات بۆ ئەوەیە بتباتە سەر سەرچاوەی قورئان و سوننەت، ئنجا ئەگەر بۆخۆت بتوانی دەست بگەیەنییە وێ، ئەوەی دەستی گەیشتە بەحرێ، پێویستی بە جۆگەلان نامێنێ! کەسێ پێویستی بە جۆگەلە ئاوە، دەستی نەگاتە سەرچاوە، دەستی نەگاتە ئاوی ئەو دەریایە.

**٥)- بە گشتیی هەندێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف[١] کارتێکراو بوون، بە سێ شتان:**

**یەك:** فەلسەفەی هیندیی: کە پێی دەگوترێ: (النّرفانا)، ئەم فەلسەفەیە ئامانجی ئەوەیە ئینسان بەرەو نەمان (فناء) بەرێ، لە میانی برسیی بوون و، دنیا بەکەمگرتن و، واز لە دنیا هێنان و، پشت لە ئارەزووەکان کردندا، ئینسان بەرەو ئەوە بەرێ،کە غەریزەکانی خۆی لەبیر بکات و، کپیان بکات، ئەوە لە فەلسەفەی هیندیی دایە، کە ئەوە مەرج نییە هەمووی بە گشتیی ڕەفز بێت، چونکە لە ئیسلامیشدا، خۆ برسیی کردن هەیە، ڕۆژوو گرتن، دنیا بەکەمگرتن، هەیە، بەڵام کاتێك ئەوە بکرێتە ئامانج، یان زێدەڕۆیی تێدا بکرێ، ئەوە خراپە.

---

[١] هەمیشە بە ئینصاف بن بۆ ئەوەی لە دادگەرییەوە نزیك بن، لەنێو صۆفییاندا باش هەن و خراپیش هەن، لەنێو سەلەفییاندا بەهەمان شێوە، لەنێو شەرعزاناندا هەرواو، لەنێو لایەنە ئیسلامییەکانیشدا، خەڵکی چاك هەیەو، خەڵکی کرچ و کاڵیش هەیە.

**دوو:** هەنــدێ لە قوتابخـــانەو ڕێبازەکـــانی تەصـــەووف، کـــارتێکراو بـــوون بەگۆشـەگیریی نەصـرانیی (رهبانية النصـاري)، کـاتی خـۆی گۆشـەگیریی و ژن نەهێنان لە نێو نەصرانییەکاندا زۆر باو بووە، ئنجا لە ژیانی ڕاهیبە نەصرانییەکاندا شتی سەیر سەیر هەیە!

هی وایان هەبووە گوتوویەتی: لەبەر خوا، حەوت ساڵە ئاو بەجەستەم نەکەوتوە! هەیانبووە لە پیاوان و ئافرەتانیان هاوسەرگیریی نەکردووە!

هەبـووە گوتـوویەتی: حەوت سـاڵە بەس گیـام خـواردووە! هەبووەگوتـوویەتی: مـن ئەوە سێ ساڵە، لەنێو بیرێك دام!

خوای پەروەردگاریش ئاماژەی پێدەکات دەفەرموێ:

﴿وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَـآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾﴾ الحديد

واتە: ڕەهبانییەتێکیـان داهێنـا، کە ئێمە لەسەرمان نەنووسیبوون {لەدینـی خوادا ئەوە لەسـەر ئینسـان پێویسـت نیـیە، کە گۆشـەگیر بـێ و دوور بـێ لە کۆمەڵگـا} بۆخۆیان دایانهێنا، {بۆ ئەوەی زیاتر لەخوا نزیك ببنەوە}، بەڵام باشیشیان بۆ ڕەچاو نەکرا {چونکە پێچەوانەی فیترەتە}، ئێمە پاداشتی بڕوادارەکانماندایەوەو زۆریشیان لاڕێن.

ئێستاشـی لەگەڵدا بێ، کـاهین و ڕاهیبەکانیـان لە کەنیسـەکاندا، تووشـی هەڵەو پەڵە دەبـن ، لەبەر ئەوەی کپکردنـی ئەو غەریزانەی، کە خوا بە ئینسـانی داون، زۆر قورس و زەحمەتەو پێچەوانەی فیترەتە.

**سـێ:** هۆکـارێکی دیـکە، کە کـاریگەریی هەبـووە لەسەر ڕێبازەکـانی تەصەووف، فەلسـەفەی یۆنـانیی بـووە، بەتـایبەت بیـردۆزەی (فیض)، وەك پێشـتریش بەکـورتیی ئاماژەیەکمان پێدا.

ئەوانە قەناعەتیان وابووە - کە تا ڕاددەیەك قەناعەتەکەیان هەقی تێدایە- ئەگەر بێت و ئینسان زۆر خۆی ساف و ساغ بکات و ئەزیەتی جەستەی خۆی بدات، بەو

واتـایە، کە خـزمەت بە جەسـتەی خـۆی نەکـات، هەر خەریکـی ڕووحـی بـێ، هەر خەریکی تێوەڕامـان (تأمُّـل) بێ، هەر خەریکـی زیکـرو فیکـرو ویـرد بـێ و، خـۆی دابڕێ لە خەڵکی، ئەوە بێگومان ڕووح بەهێز دەکات، وەك چۆن کەسێکی کافر، یان مسوڵمان، مەشق بە جەستەکەی بکات، جەستەکەی بەهێز دەبێ، ڕووحیش هەروایە، کافرێك یان مسوڵمانێك خزمەتی ڕووحەکەی بکات، ڕووحەکەی هەر بەهێز دەبێ، بەڵام گرفتـی ئەوانە ئەوە بـووە، کە بەتەمـاعی ئەوەی خوا(فیض)یـان بـۆ بڕێـژێتە خوار، خۆیان دوور گرتوە لە شەریعەت.

بێگومان لە ئەنجامی صاف بوونەوەو ساغ بوونەوەو لەبێژینگ درانی دەروونی مرۆڤدا، لە سیفەتە خراپەکان، ڕاستە ئینسان ئامادەیی بۆ پەیدا دەبێ، زیاتر سوود ببینێ لە ئیلهامی فریشتەکان، بەڵام ئەوە کافی نییە، چونکە بەبێ وەحیی، ئینسان ناگاتە هەوارو مەنزڵ.

ئنجا فەلسەفەی یۆنـانیی، بەتـایبەت بیردۆزەی(فیض)و بیردۆزەکـانی ئیتتیحـادو حلوول، کاریگەریی سەلبییان هەبووە، بۆ سەر هەندێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف.

**٦)- هەر کام لە تەوژمی:** صۆفییگەریی و سەلەفییگەریی وەك لە کتێبەکانی دیکەشمدا ئامـاژەم پێـداوە: تێپەڕانـدن و کورتهێنانیـان هەبـووە، بەتـایبەت بەرامـبەر یەکدی: تەوژمی سەلەفیی، هەرچی پەیوەندیی بەتەصەووف و ئەهلی تەصەووفەوە هەیە، هەمـووی ڕەت دەکـاتەوەو، نمـوونە خراپەکـانی صـۆفییگەریی زیـاتر زەق دەکاتەوە.

بۆ وێنە: باسی (ئیبنو عەرەبی) دەکات، باسی (حەللاج) دەکات، باسی چەند هەڵەیەکی کتێبی(إحیاء)دەکات، باسی چوار هەڵەی (مەولانا)و کێ و کێ دەکات! بەڵام باسی چاکەکانیان ناکات.

ئەهلی تەصەووفیش، هەرچی کەلەپووری تەوژمی سەلەفییە، هەمووی ڕەت دەکـاتەوە، ئەویـش دیسـان هەنـدێ هەڵەو پەڵەی سـەلەفییەکان، کە هەن، ئەوە زەق دەکەنەوە.

بۆ وێنە: قسەی سەلەفییەك دێنی، كە گوتوویەتی: ئەو گۆچانەی من لە لاشەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاكترە، لەبەر ئەوەی گۆچانەكەم، دەتوانم ئیشانی پێ بكەم، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەدنیادا نەماوە! كە بەدڵنیایی ئەوە بێ ئەدەبییە، یان ئەو قسەیەی (إبن تیمیة) زۆر زەق دەكرێتەوە، كە لەبەر تیشكی فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دا گوتوویەتی: بارگەو بنە بۆ هیچ شوێنێك ناپێچرێتەوە، مەگەر بۆ سێ مزگەوتان: مزگەوتی حەڕام و، مزگەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، مزگەوتی قودس.

ئنجا ڕاستە وەك مزگەوتان، دەبێ ئینسان تەنیا بۆ ئەو سێ مزگەوتانە بەنییەتی عیبادەت بچێ، ئیبن و تەیمیەش (ڕەحمەتی خوای لێبێ).

بۆ زانیارییتان! هەندێ جار لە كاردانەوەی هەندێ خەڵكی صۆفییدا، تووشی تێپەڕاندن بووە هەمیشە كارو كاردانەوە، وا لە ئینسان دەكات.

ئنجا هەندێ لە سەلەفییەكان ئەوەیان زۆر زەق كردۆتەوە، بۆ نموونە: كەسێ بیەوێ بچێ هەرەمەكانی مصر ببینێ، دەڵێن: نا، ئەوە نییە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: {لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالمَسْجِدِ الأَقْصَى}[1]!!

دەڵێین: ڕاستە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەموویەتی: بەنییەتی تاعەت و عیبادەت، تەنیا سەفەر كردن، بۆ ئەو سێ مزگەوتانە، دروستە، چونكە تەنیا ئەو سێ مزگەوتە، ئیمتیازیان بەسەر مزگەوتەكانی دیكەدا، هەیە، لەو ڕووەوە، كە خێرو پاداشتی نوێژ تێیاندا بەچەندان بەرانبەر خێرترو چاكترە.

بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرمووە: نابێ بچن بۆ دیدەنیی شوێنەوارەكانی، كە ئەو گەلانە جێیان هێشتوون، یان بۆ زانست، یان بۆ صیلەی ڕەحم، یان بۆ سەفەرو گەڕان و، دروست نییە سەفەر بكەن!! كەواتە: ئەو دوانە بۆچی لەیەك دەبەستن؟!

---

[1] أخرجه أحمد برقم (٧١٩١)، والبخاري برقم (١١٣٢)، ومسلم برقم (١٣٩٧)، وأبو داود برقم (٢٠٣٣)، والنسائي برقم (٧٠٠)، وابن ماجه برقم (١٤٠٩)

صۆفییەکان بەگشتیی- نەك هەموویان -کورت هێنانیان هەیە لە پابەند بوونیان بە قورئان و سوننەتداو، سەلەفییەکانیش بە گشتیی - نەك تاك تاکیان - کورت هێنانیان هەیە لە ئیمانێکی شهوودیی و لە گرنگییدان بەلایەنی ڕووحییدا، هەروەها لەبواری پەروەردەیی و ڕازانەوە بەئاکار و ڕەوشتی بەرزداو، بژارکردن لە ڕەوشت و ڕەفتاری زەق و ڕەق و نالەباردا، کە بێگومان ئەوەش بەرهەمی تاعەت و عیبادەت و خوا بەیەکگرتن (توحید)ە، ئینسان ئەگەر بۆ خوا صوڵحا، گەلێك سیفەتی بەرزو خەسڵەتی پەسندی تێدا دێنە دی و، لە زۆر خوو خدەی پەست و نزم بژار دەکرێ.

ئنجا بەڕێزان! هەر بۆیەش بە گشتیی، ئەهلی تەصەووف سەرکەوتووتر بوون لە مسوڵمانانی دیکە، لە بواری: خوا پەرستن و خۆپاراستن لە گوناهان و، خۆڕازاندنەوە بە سیفەتی جوان و، لە هەڵس و کەوتی جوان و چاکدا.

تەماشا دەکەین: شێخێکی تەریقەت، ئەگەر زۆریش چاك نەبووبێ، توانیویەتی سەدان و هەزاران کەس لە گوناهان بگێڕێتەوە!! بەڵام کەسانی دیکە هەبوون و هەن کە لاف لێدان و بانگەشەی گەورە گەورەیان هەبووە، بەڵام نەك خەڵك، خۆیشیانیان پێ نەگەڕاوەتەوە لە گوناهان! ئنجا ئێمە دەبێ بە ئینصافەوە قسە بکەین، لە هەردوو لایاندا تێپەڕاندن و بەزایەدانیش هەبووە.

بەداخەوە مسوڵمانان زۆر جار ئەو ئایەتەیان بەسەردا چەسپیوە، کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الروم

واتە: لە هاوبەش بۆخوا دانەران مەبن، ئەوانەی ئایینەکەیانیان بەش بەش کرد، هەرکامێکیان بەوەی، کە خۆی لەسەریەتی، دڵخۆشە.

ئێستا خەڵکێکی سەلەفیی ناو - مەگەر چۆن و بەدەگمەن - ئەگەرنا بەزۆریی خەریکی ئەوەن: بیسەلمێنن، کە هەبوونی:

١- حیزبی ئیسلامیی حەرامە.

٢- لە تەحییاتدا دەبێ پەنجە بجووڵێنرێ.

٣- دەبێ دەلینگی شەرواڵ و پانتۆڵ کورت بێ.

٤- ئافرەت دەبێ نیقابی هەبێ!

وەك ئەوەی دین تەنیا ئەوەندە بێ، صۆفییەکانیش هەر خەریکی زیکرو، فیکرو، هەندێ عیبادەتی شەخسیین و، دینەکەیان بەش بەش کردوە! لە حاڵێکدا، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاگای لەوەش بوو، لەوەش بوو، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) بەهەمان شێوە.

بۆچی باشترین جیل بۆ ئەوەی ئێمە بیانکەینە سەرمەشق، جیلی هاوەڵانە؟

لەبەر ئەوەی دینداریيان زۆر هاوسەنگانە وەرگرتبوو، دینداریيان لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) وەرگرتبوو، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە شەونوێژدا هێندە دەمایەوە، پاژنەی پێی دەقلێشا، بەڵام لە جەنگ و شەیبەخوونیشدا، هیچ کەس لەو ئازاتر نەبوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێ: کە تەندووری جەنگ گەرم دەبوو، ئێمە خۆمان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەگرت، یانی: ئەو لە هەموو کەس لە دوژمن نزیکتر بوو، لە عیبادەت و تاعەتی شەوێشدا ئاوابوو، ئنجا بۆ عیلم، بۆ زوهد، بۆ هەموو سیفەتێکی بەرز، بۆ سیاسەت، بۆ ئاکارە بەرزو پەسندەکانیش دیارە چۆن بووە!

بەڵام دوایی مسوڵمانان ڕێبازەکەییان بەش بەشکرد: هەندێکی زوهدەکەی وەرگرت و، هەندێکی دیکە زانستەکەی وەرگرت و، هەندێکیان جەنگ و جیهادەکەیان وەرگرت، هەندێکیان لایەنە سیاسییەکەیان وەرگرت، بەش بەشیان کرد، دینەکەیان بەش بەشکردو بوون بە تاقم تاقم!

سبحان الله! خوای پەروەردگار زۆر جار ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە، کە وەك کافرو دەغەڵ و موشریکان، نەکەین، بەڵام ئێمە لەزۆر شتدا، وەك ئەوان دەکەین، بۆ وێنە:

أ- وەك هۆشدارییدان بە مسوڵمانان لە گیرۆدەبوون بە یەکێك لە سیفەتەکانی مونافیقان، کە قسەی بێ کردەوەیە، فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الصف

واتە: ئەی بڕوادارینە! بۆچی قسەیەك دەکەن کردەوەی پێ ناکەن؟

ب- هەروەها دەربارەی جوولەکانیش دەفەرموێ:

﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە:چۆن بەخەڵکی دەڵێن: چاکە بکەن ،خۆشتان فەرامۆش دەکەن، لەحاڵێکدا،کە کتێبی (خوا)ش دەخوێننەوە، ئایا نافامن؟

کەچی چەندان وتاربێژ و بانگەوازکار و مەلایان دەبینی لەسەر مینبەری قسەیان چاکە، دواییش کردەوەکانیان پێچەوانەی قسەکانیانن!

ج- هەروەها خوا دەربارەی نەصرانییەکان دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴾ المائدة:١٤ .

واتە:هەروەها لەوانەش،کەگوتیان: ئێمە نەصرانیی، پەیمانی پتەومان وەرگرت،بەڵام بەشێك لەوەی،کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون لەبیریان کرد

بەڵێ، زۆر لەدەردەکانی: مونافیق و کافرو موشریك و نەصرانیی و جوولەکەکان، لەنێو مسوڵماناندا هەن، لە ئەنجامی دوورییمان لە قورئان و سوننەتدا.

## ٧)- پوختەی بیروڕام دەربارەی تەزکییە[1]:

لێرەدا بەکورتیی بیرو ڕای خۆمتان لەبارەی (تەزکیة)وە، لە حەوت کورتە سەرنجدا بۆ باس دەکەم:

**یەك**: وەسیەتتان لێدەکەم: هەستیار مەبن بەرامبەر بە بەرهەم و ئیجتیهادو کەلەپووری زانایان، لە هەر بوارێکەوە بەرهەمیان هێناوە، بەرامبەر بەهیچی هەستیار مەبن، کە بەڕەهایی ڕەتی بکەنەوە، بەرامبەر هیچیشی دەمارگیر مەبن، کە بە ڕەهایی قبووڵی بکەن!

وەك بەرهەمی فیکری بەشەر تەماشای بکەن، چاکەکەی لێ وەربگرن و، خراپیشی کە تێدایە، ماڵی قەڵپ سەر بە خاوەنییەتی، هیچ کەسیش نەیگوتوە: هەرچی گوتوومە، هەمووی هەقە، بەس فیرعەونم بنیوە لە قورئاندا وابڵێ:

﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾ غافر

واتە: فیرعەون گوتی: تەنیا ئەو ڕایەتان پێدەڵێم، کە پێم پەسندەو، جگە لە سەرڕاستیی و چاکەشتان پێشان نادەم.

هیچ زانایەکی موعتەبەر نەیگوتوە: هەرچی من دەیڵێم، هەمووی وایە، مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەنزیك قەبری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) وەستا بوو، گوتی: {كُلُّ أَحَدٍ يُؤْخَذُ مِنْ قَوْلِهِ وَيُتْرَكُ، إِلَّا صَاحِبَ هَذَا الْقَبْرِ، يَعْنِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ}.

واتە: هەموو کەس قسەشی لێ وەردەگیرێ و بەسەریشی دادەدرێتەوە، جگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە.

---

[1] هەڵبەتە ڕای خۆم لەم کتێبی: {صالح بوون و بەرەو خوا چوون}دا بەتەفصیل لەو بارەوە گوتوە، لێرەدا ناتوانم هەمووی بڵێم، هەروەها لە کتێبی: {ژیانی گیان} لەوێشدا ڕای خۆم لە بارەی {تەزکیەی نەفس}ەوە خستۆتە ڕوو، دیسان لە (الكتاب العاشر)ی {موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله}شدا، باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

**دوو**: گەورە پیاوانی بواری تەزکیە هەر لە (الحارث المحاسبي)یەوە، کە زۆر ناودار بووەو(أبو یزید البسطامي) و (أبو طالب المکي)یەوە، تاکو دەگاتە(غزالي)و خاوەنانی ئەو تەریقەتانەی، کە دیارن: (بەهائەددینی نەقشبەندیی، سەیید ئەحمەدی سەرهەندیی، شێخ عەبدولقادری گەیلانیی)، کوردەکانی خۆمان: (مەولانا خالیدی نەقشبەندیی و، شێخ عوسمانی تەوێڵەیی، کاك ئەحمەدی شێخ و)، ئەوانی دیکەی، کە بەڕێی ئەوانەدا ڕۆیشتوون.

بێگومان ئەوانە هیچ کامیان بێ هەڵە(معصوم) نەبوون، چونکە هیچکەس نییە هەڵەش نەکاو نەشپێکێ، بەدڵنیاییشەوە: ئەو پێشەوایانەی بواری تەزکیە، هیچ کەسیان نەیویستوە بەزم و بازاڕێك بۆخۆی دابنێ و، خەڵك لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە!

هەمووی ویستوویەتی: خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، هەمووی ویستوویەتی: خەڵك لەدەوری ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆ بکاتەوە، بەڵام ئەوە خەڵکن دوایی ئیستیعابی ئەوەیان نەکردوەو گوتوویانە: ڕێبازی قادریی، ڕێبازی نەقشبەندیی، ڕێبازی فلان و فلان، کە لە هەقیقەتیشدا هەموویان خەڵکیان بۆ ڕێبازی (محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم) بانگکردووە، کە ئەویش وەك ڕێباز ڕێبازی ئەو بووە، ئەگەرنا ئایین و بەرنامەکە، تەنیا هی خوایەو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك جێبەجێکردنی شەریعەتی خوا لەسەر ئەرزی واقیع، ئاوای بۆ بەرجەستە کردووین.

**سێ**: مەرج نییە ئینسان هەر دەستگرتوو بێ بە ڕێبازێکی تەصەووفەوە، بەیەکێك لەو قوتابخانانەوە، ئنجا بکاتە ئامانج، ئەوە مەرج نییە، چونکە ئازایەتیی و ڕۆڵ و هونەری ئەو مامۆستایانەو ئەو ڕێبازانە، هەر ئەوەیە، ئێمە بگەیەنن بە سەرچاوەی قورئان و سوننەت، سەرچاوەی شەریعەت، بەڵام

هەمـوو کەس توانـای نەبـووە لە قورئـان و سـوننەت و شـەریعەت هەڵهێنجـێ، ئەگەرنا لەدوای قورئان و سوننەت، بۆ کوێ دەچی؟

لەدوای قورئان و سوننەت، چی دیکە هەیە بۆ دینداریی؟

هیچی دیکە نییە، تەماشای کتێبەکانیشیان بکەن، هەر ئاماژە دەکەن بە قورئان و سوننەت، بە وەحیی بێ هەڵەو پەڵەی خوا.

**چـوار:** مەرج نییە ئەوانەی، کە ناویان وەك شێخی مورشیدو ئوستاد نەڕۆیشتوە، پشك و بەشیان نەبووبێ لە تەزکیەی نەفس و تەصەووفدا، بۆ وێنە: پیاوێکی وەك (إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ (مجموع الفتاوى)یەکەی سی و پێنج (٣٥) بەرگە، دوو بەرگـــی، کە (١٠و ١١)ن بەنـــاوی: (علـــم السّـــلوك والتصوف)ەوەن.

عـاریفێکی گەورە چـی دەڵـێ، ئەویـش هەر ئەو قسانەی کـردوون، زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە باسی شێخە کامڵەکان دەکات و دەڵێ: ئەهلی تەصەووف، وەك هەر چینێکـی دیـکە، خەڵکـی زۆر چاکیـان تێـدایەو لادەریشـیان تێـدایە، بەداخەوە زۆر لە ئەهلـی تەصـەووف نـازانن (إبـن تيميـة) وایە، هەر لەخـۆوە ڕەفزی دەکەن.

(إبن القيم) کتێبێکی هەیە بەناوی:(مدارج السالکين)، کە شەرحی(منازل السائرين)ی شێخی(هروي) دەکات،کە شێخێکی ئەهلی تەصەووفە.

هەروەها (إبن تيمية) نـامیلکەیەکی شێخ (عبدالقادر)ی گەیلانیی شەرح دەکات بەناوی: (فتـوح الغيب) لە یەکێ لەبەرگەکانی (مجموع الفتـاوى)داو، هەر جارێ ناوی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی دێ دەڵـێ: (قُـدِّسَ سِـرُّهُ)، کە ئەوە زاراوەیەکە ئەهلی تەصەووف زۆر بەکاری دەهێنن، یـانی: خوا ڕووحی پاك بکا!

هەروەها لە زانا کوردەکانیش هەرکام لە: مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسیی و، کاك ئەحمەدی موفتی زادە و، کاك ناصری سوبحانیی، قسەو هەڵوێستی یەکجار بەرز و شیرین و کاکڵداریان هەن لە بواری تەزکیەی نەفس دا.

**پێنـج**: زانایانی ڕۆچوو و چاك تێگەیشتوو، ئەو دابەشكارییەی ئێستا هەیە: ئەوە سەلەفییەو پەیوەندیی نییە بە تەصەووفەوەو، ئەوە صۆفییەو پەیوەندیی نییە بە سەلەفییەتەوە! یان ئەوە كاری سیاسی دەكاو، هەقی زانستی شەرعیی نییەو، ئەوە فیقهـ دەزانێ و هەقی سیاسەتی نییە!

ئەو لێكـدابڕانە، عـادەتی موشـریكەكانەو زانایـانی ئـێمە وانەبـوون، بـۆ وێـنە:(إبن تيميـة) ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، بۆخـۆی دەگێـڕێتەوە ،كە: هەر مەسەلەیەكی شەرعیی، كە لێی دەوەستاو تێی نەدەگەیشت، دەچووە دەشتێك سەری لەسەر عەرزێ دادەناو دەیگـوت: (يا معلِّم إبـراهيم علِّمـني.......... ئەی مامۆستای ئیبراهیم! فێرم بكە! ).

هەروەها (إبن القيم) لێی دەگێڕێتەوە دەڵێ: كە نوێژی بەیانی دەكرد، هەتا چێشتەنگاو، دادەنیشت و خەریكی زیكرو فیكر دەبوو، دەڵێ: پێم دەگوت: بۆچی پشوویێك نادەی؟

دەیگوت: من بەوەوە ماوم، ئەگەرنا وزەم نامێنێ!

**شەش**: ئێوە ئەوە بزانن! هیچ پێشەوایەكمان نییە خەڵك سوودی لێ بینیبێ و، لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحیی و تەزكیەو تەقواوەو، پشكی باشی نەبووبێ، ئیدی وریا بن! وەك كاك ئەحمەدی موفتیزادە {خوا پلەی بەرز بكاتەوە} گوتەنی: خۆتان مەكەنە هەمبانەی مەعلوومات! تەنیا زانیاریی ساردوسڕ كۆ بكەنەوە، پێی نـاگەنە هـیچ، دەتـوانی كتێبـان بنووسـی و قەرەبالغ بی، بەڵام بۆخۆت سوودێك نابینی!

**حـەوت**: كۆتـا قسەشم ئەوەیە: ئینسـان بـۆ ئەوەی بەخۆی بزانێ: ئایـا نەفسی تەزكیە بووە، یان نەبووە؟!

نیشانەكانی تەزكیە بوونی، چەند شتێكە، من لەو كتێبانەدا، كە ئاماژەم پێدان، باسم كردوون:

١- ئینسان لەززەت لە عیبادەت بكات و، عیبادەتی لەسەر شان سووك بێ و بەدڵخۆشییەوە بیكات.

٢- یەکێکـــی دیـــکە لە نیشـــانەکانی ئەوەیە، ئینســـان لەگەڵ خەڵکـــدا مامەڵەیەکی جوانی هەبێ، چاوەڕوانیی لە خەڵك نەبێ، مەدحی خەڵك، مەغـرووری نەکاو، زەممی خەڵك زۆر نـاڕەحەتی نەکات، کەسێك خۆی بناسـێ، ئەگەر یەکـێ زۆر بەرزی بکـاتەوە، دەڵـێ: زۆر ڕۆیشـتی و، ئەگەر زۆر نزمـی بکـاتەوە، دەڵـێ: زۆر بەرەو خـوار چـووی! نەوام و نەواشم، بەندەیەکی خوام!

٣- لە ئەنجـامی تەزکـیە بـوونی نەفسـدا، مـرۆڤ حـاڵەتێکی ئـارامیی و دامەزراویـی و نەلەخشـاویی بـۆ دروسـت دەبـێ و، هەمیشـە لە هەڵـبەزو دابەزو هەڵکشان و داکشاندا نابێ.

٤- بەهۆی تەزکییە بوونی نەفسەوە، مرۆڤی مسـوڵمان ڕاستییەکانی ئیمان و ئیسلام (حقائق الإیمان والإسلام)ی لە عەقڵ و دڵ چەسپاوو درەوشاوە دەبن و، لەگەڵ ڕەشەباو گەردەلوولی هیچ شوبهەو شەهوەتێکدا، نـالەقێ، نەك بە هەر پشووەبای شوبهەو شەهوەتێك بەملاو لادا بچێ!

ئەوەش بـزانن، کە قوتابخانەکـانی تەصـەووف، بـۆ پێگەیانـدنی لایەنـی ڕووحیـی مسولْمانان بوون، وەك چۆن قوتابخانە فیقهییەکان بۆ پێگەیاندنی مسـوڵمانان بـوون، لەڕووی یاســا ڕواڵەتییەکــانی شــەریعەتەوە، بەهەمــان شــێوە هەمــوو زانســتە ئیســلامییەکانی دیــکەش، هەر بــۆ ئەو ئامــانجی بەرزی: بــاش دینــداریی و دنیادارییکردنی مسولْمانان، بەرهەم هێنراون.

## مصادر تخريج الأحاديث

١) الموطأ، تأليف: مالك بن أنس، الناشر: مؤسسة زايد بن سلطان آل نهيان الطبعة: الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م)، تحقيق: محمد مصطفى الأعظمي.
٢) (المُسند) للإمام أحمد بن حنبل، تأليف: أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، الناشر: مؤسسة قرطبة، القاهرة، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.
٣) صحيح البخاري (الجامع الصحيح المختصر)، تأليف: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، دار ابن كثير، اليمامة، بيروت، الطبعة الثالثة، (١٤٠٧ -١٩٨٧) تحقيق: د. مصطفى ديب البغا أستاذ الحديث وعلومه في كلية الشريعة، جامعة دمشق.
٤) صحيح مسلم (الجامع الصحيح)، تأليف: أبو الحسين مسلم بن الحجاج بن مسلم القشيري النيسابوري، دار الجيل بيروت + دار الأفاق الجديدة، بيروت، ثمانية أجزاء في أربع مجلدات.
٥) صَحِيح ابْنُ حِبَّان، للإمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني، تحقيق: حقوق أصولُهُ وخَرَّجَ أحاديثه: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).
٦) صحيح ابن خزيمة، تأليف: محمد بن إسحاق بن خزيمة أبو بكر السلمي النيسابوري الناشر: المكتب الإسلامي – بيروت، (١٣٩٠-١٩٧٠)، تحقيق: د. محمد مصطفى الأعظمي.
٧) سُنَن أبي داود، للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).
٨) سُنَن التِّرمِذِي، للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).
٩) سُنَن النَّسَائي، للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م).

١٠) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ(ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م).
١١) الْمُستَدرَك على الصحيحين، للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري، تحقيق: صالح اللحَّام، دار ابن حزم، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).
١٢) المعجم الكبير، للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَراني، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الأصالة والتُّراث، الطبعة الأولى (١٤٣١هـ - ٢٠١٠م).
١٣) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ أَلفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلَّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارِسَهُ: الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا، دار المصطفى، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).
١٤) مشكاة المصابيح، تأليف: محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م).
١٥) السنن الكبرى، تأليف: الإمام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبد الغفار سليمان البنداري وسيد كسروي حسن الجزء الأول دار الكتب العلمية بيروت – لبنان الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١م).
١٦) شعب الإيمان، تأليف: أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي، دار الكتب العلمية، بيروت الطبعة الأولى، (١٤١٠) تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول.
١٧) المعجم الصغير (الروض الداني)، تأليف: أبو القاسم سليمان بن أحمد الطَّبَراني، المكتب الإسلامي، دار عمار، بيروت، عمان، الطبعة الأولى، (١٤٠٥ هـ - ١٩٨٥م) تحقيق: محمد شكور محمود الحاج أمرير.
١٨) الأدب المفرد، المؤلف: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي دار البشائر الإسلامية – بيروت الطبعة الثالثة، (١٤٠٩هـ - ١٩٨٩م)، تحقيق: محمد فؤاد، الأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.
١٩) صحيح الترغيب والترهيب، تأليف: الشيخ محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الرياض، الطبعة: الخامسة.
٢٠) سلسلة الأحاديث الصحيحة، المؤلف: محمد ناصر الدين الألباني الطبعة الثانية.

# بەرهەمەکانی دانەر

| ژ | کتێبەکان | جۆرو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | أ / کتێبە کوردییەکان | | |
| | قورئانو سوننەت | | |
| 1 | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/ ١٩٨٤<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| 2 | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووک کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/ ٢٠٠٨<br>چاپی دوو/ ٢٠١٥ | |
| 3 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/ ٢٠١٢ | |
| 4 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/ ٢٠١٢ | |
| 5 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/ ٢٠١٣ | |
| 6 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/ ٢٠١٤ | |
| 7 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 8 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/ ٢٠١٦ | |
| 9 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/ ٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 10 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| 11 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | |
| 12 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سوورەتی: (هود) | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | |
| 13 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| 14 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سوورەتەکانی: (الرعد، إبراهیم، الحجر) | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| 15 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٣) سوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| 16 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٤) سوورەتی: (الإسراء) | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| 17 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٥) سوورەتەکانی: (الکهف) و (مریم) | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| 18 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٦) سوورەتەکانی: (طه) و (الأنبیاء) | | |
| 19 | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 20 | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | | |
| 21 | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچکان | چاپی یەك/ ١٩٨٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٦ | |
| 22 | ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/ ١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |

| ژ | کتێبەکان | بەروار چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 23 | پرۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/ ١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) |
| 24 | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| 25 | بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠٠١<br>چاپی چوار/ ٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| 26 | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی شەش/ ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیی و تورکیی و فارسییش |
| 27 | خواناسیی، ئایین، ئیمان (دەروشاوەیی ئیسلامو پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ/ ٢٠٢٠ | |
| 28 | ناوە هەرەجوانەکانی خوا "سبحانە وتعالی" | چاپی یەك/ ٢٠١٣ | |
| | **مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ)** | چاپی یەك/ ٢٠٠٦-٢٠٠٨<br>چاپی دوو/ ٢٠١٦ | |
| 29 | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چییەو چۆنە؟ | | |
| 30 | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| 31 | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەتو لەپەرستراوێتییدا | | |
| 32 | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| 33 | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: رۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | - |
| 34 | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیرەوانی رێبازی راست | | |

| ژ | کتێبەکان | ژمارەی چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 35 | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| 36 | تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان | چاپی یەك/ ٢٠٠٨<br>چاپی سێ/ ٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| 37 | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٢<br>چاپی سێ/ ٢٠١٤ | |
| 38 | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـه حاویی | چاپی دوو/ ٢٠١٧ | |
| 39 | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طه حـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 40 | سیکۆلاریزمو دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/ ٢٠١٦ | وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبیی، شێوەزاری کرمانجیی |
| 41 | درەوشاوەیی ئیمانو پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماکو عەقڵو زانستو وەحییدا | چاپی یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی دوو/ ٢٠٢٠ | |
| | **مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیعدا** | | - |
| 42 | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەتو سەرگوزشتەو سەرچاوەکانو گرنگیی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | - |
| 43 | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | - |
| 44 | کتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | |
| 45 | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | - |
| 46 | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | - |

| تێبینی | بەرواری چاپ | کتێبەکان | ژ |
|---|---|---|---|
| ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسوعەی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە | زنجیرەی: باچاکتر ئیسلام بناسین! | | - |
| - | چاپی یەك/ ١٩٨٨ | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | 47 |
| - | چاپی یەك/ ١٩٨٩<br>چاپی دوو/ ١٩٩٠ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاه والسلام" | 48 |
| | چاپی یەك/ ١٩٩٠ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | 49 |
| دوایی خرایە نێو کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) | - | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | 50 |
| | چاپی یەك/ ١٩٩٠ | بیرو بڕوا | 51 |
| | فیقهی ئیسلامیی | | |
| | چاپی یەك/ ٢٠٠٠<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٩ | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | |
| | | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاكو خاوێنیی | 52 |
| | | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | 53 |
| | | بەرگی سێیەم: زەکاتو ماڵ بەخشین | 54 |
| | | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەجو عومرەکردن، زیکری خواکردن | 55 |
| بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە | چاپی یەك/ ١٩٩٩ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | 56 |
| | چاپی یەك/ ٢٠١٣ | جەژن و یادو بۆنەکانو هەڵسەنگاندنێك | 57 |
| بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە | چاپی یەك/ ٢٠٠٩<br>چاپی دوو/ ٢٠١٥ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | 58 |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 59 | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵو سامان بەخشین لەرێی خوادا | چاپی یەك/ ٢٠١٣ | |
| | تەزکیـــەی نەفس و ڕەوشت و ئاکـــار | | |
| 60 | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/ ١٩٨٧ | |
| 61 | ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سونەتدا | چاپی یەك/ ١٩٩٠<br>چاپی شەش/ ٢٠٢٠ | وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارســیش |
| 62 | تەزکیەو تەبایی‌و، یەکرِیزیی‌و برایی | چاپی یەك/ ١٩٩٨ | |
| 63 | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/ ١٩٩٩ | |
| 64 | گەرانەوە بۆ لای خـوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخانو، وازهێنان لە گوناه و ســەرپێچیی‌و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/ ٢٠٠١<br>چاپی شەش/ ٢٠٢٠ | |
| 65 | شـەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هـەیە؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 66 | باسـێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 67 | گیانی ژیـان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 68 | مەوســووعەی: ڕەوشتو ئاکاری ئیســلامیی لەبەر ڕۆشــنایی قورئانو ســوننەتدا | چاپی یەك/ ٢٠١٦ | |
| 69 | ئەدەبو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی‌و عەقڵدا | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| | بانگـەوازو کــاری ئیســـــلامیی | | |
| 70 | کۆمەڵی خــوا | چاپی یەك/ ١٩٨٨ | |
| 71 | پێشمەرگەی ئیسـلام، یان مـسـوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/ ١٩٨٨<br>چاپی چوار/ ٢٠٢٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 72 | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/ ١٩٩٠ | |
| 73 | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| 74 | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووریانی مان و نەماندا | چاپی یەك/ ١٩٩٥ | |
| 75 | هەڵسەنگاندن و هەڵوێستمان لەم قۆناغەدا | چاپی یەك/ ١٩٩٥ | |
| 76 | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| 77 | چەند ڕێرووننییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| 78 | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعییەکان و بنچینە ئەخلاقییەکان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| 79 | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| 80 | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| 81 | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 82 | هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| 83 | چۆن لە جیهاد تێبگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| 84 | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجێ و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 85 | جیهاد لەرێی خواداو/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 86 | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| 87 | چەند ڕێرووننییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 88 | ئیسلامو مسوڵمانەتیی‌و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | |
| 89 | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| 90 | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>**ئاڵقەی یەکەم**: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>**ئاڵقەی دووەم** : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| 91 | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/ ٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| 92 | با لادان‌و تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی‌و گومان | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| 93 | پەرگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەرگیران، هۆکارەکانی پەرگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 94 | هەڵوەشاندنەوەی پەرگیریی | چاپی دوو/ ٢٠١٨ | کۆی سێ نامیلکەی پێشووە |
| 95 | بەرەو بانگەوازێکی ڕاست‌و ڕەسەن | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| 96 | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن‌و پێگەیشتن |
| 97 | کێ شایستەی مینبەرو میحرابە؟ | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| 98 | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 99 | ئاڵقەی دووەم‌و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| تێبینی | بەرواری چاپ | کتێبەکان | ژ |
|---|---|---|---|
| وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | ئاڵقەی چوارەم: شێخ ئەبوو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | 100 |
| | چاپی یەك / ٢٠٢٠ | چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟ | 101 |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | | |
| | چاپی یەك/ ٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | 102 |
| | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | راپۆرتی: ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | 103 |
| | چاپی یەك/ ٢٠١٦ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠/ ٥/ ٢٠١٥ | 104 |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد** | | |
| | چاپی یەك / ١٩٨٩ | کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | 105 |
| | چاپی یەك / ١٩٨٩ | مەسەلەی کورد چییەو چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێ؟ | 106 |
| | چاپی یەك/ ١٩٩٠<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٥ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | 107 |
| | چاپی یەك/ ١٩٩٠<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٥<br>چاپی چوار/ ٢٠١٨ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | 108 |
| | چاپی یەك/ ١٩٩٢ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | 109 |
| | چاپی یەك/١٩٩٦ | چەند ڕێنموویەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | 110 |
| | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان | 111 |

| ژ | کتێبەکان | بەروار چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | سیاسەت و حوکمڕانیی | | |
| 112 | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| 113 | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشتو بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| 114 | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستەمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| 115 | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان): یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| 116 | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| 117 | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/ ٢٠٠٩<br>چاپی دوو/ ٢٠١٧ | |
| 118 | قورئانو پاکسازیی‌و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | |
| 119 | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی سێ/ ٢٠٢٠ | |
| 120 | واقیعی دژواری ئوممەت: هۆکارو چارەسەر | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| | ئافرەت و خێزان | | |
| 121 | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 122 | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | مێژوو | | |
| 123 | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٩<br>چاپی سێ/ ٢٠١٣ | |
| 124 | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 125 | بەرکوڵێکی کارو چالاکیی و ڕووداوەکانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/ ٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| | دیدار و گفتوگۆ | | - |
| 126 | سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆر حسین محمد عزیز) | چاپی یەك/ ٢٠٠١<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٤ | - |
| 127 | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوە و چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوە و چاوەڕێی چاپە |
| 128 | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | | |
| 129 | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 130 | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| 131 | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | - |
| 132 | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 133 | سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 134 | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 135 | قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و چەند سەرنج‌و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 136 | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 137 | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 138 | قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن‌و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| 139 | واقیعی هەرێمی کوردستان ، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| 140 | سروشت‌و پایەکانی خێزان‌و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/ ٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| 141 | کاری ئیسلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| 142 | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| 143 | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| 144 | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 145 | ناڤیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| 146 | ڕەوەندی کورد لە هەندەران‌و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 147 | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 148 | گەنج‌و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر(٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| 149 | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **ب/کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| | **موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله** | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| | كە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| 150 | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/ ٢٠١٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| 151 | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط الثانية/ ٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی تورکیی و فارسیی وەرگێردراوە |
| 152 | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/ ٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی تورکیی و فارسیی وەرگێردراوە |
| 153 | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/ ٢٠١٧ | تا بەرگی ١٢ کارکردن تێیدا بەردەوامە بۆ تەرجەمەکردنی بۆ سەر هەردوو زمانی تورکیی و فارسیی |
| 154 | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/ ٢٠١٧ | |
| 155 | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/ ٢٠١٧ | |
| 156 | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/ ٢٠١٨ | |
| 157 | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/ ٢٠١٨ | |
| 158 | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/ ٢٠١٨ | |
| 159 | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/ ٢٠١٩ | |
| 160 | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/ ٢٠٢٠ | |
| 161 | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/ ٢٠٢٠ | |

| ژ | کتێبەکان | باروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 162 | نقض فكـرة التطـرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، - القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | ترجم إلى اللغات: الفارسية والإنجليزية والتركية |
| 163 | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |
| 164 | لقاء خاص (مقابـلـة مع قنـاة العـالم) | ط الاولى/ ٢٠٠٦ | |
| 165 | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى/ ٢٠١٦ | |
| 166 | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| 167 | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/ ٢٠١٣ | |
| 168 | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/ ٢٠١٤ | |
| 169 | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| 170 | علماء الإسلام: أوصافهم النبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| 171 | الأصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| 172 | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| 173 | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |
| 174 | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| 175 | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| 176 | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |

# ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن

| | |
|---|---|
| 177 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سوورەتی: (الناس) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تاکو هەمووی چاپ دەکرێ |
| | **زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن، کە لە: (١٢) کتێب پێکهاتوە** |
| 178 | بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئوممەت: هۆکارو چارەسەر |
| 179 | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی |
| 180 | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگاو پاکسازیی‌و چاکسازیی تێداکردنی |
| 181 | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاستو ڕەسەن |
| 182 | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی‌و، ڕوونکردنەوەی ئیمان |
| 183 | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا |
| 184 | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان |
| 185 | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی‌و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان |
| 186 | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان |
| 187 | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگو هەستیار |
| 188 | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەبایی‌و یەکڕیزیی مسوڵمانان |
| 189 | بەرگی دوازدەیەم: بنەرەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاستو هاوسەنگ |
| 190 | قورئانو سوننەت وەك ڕوحو جەستە تێکهەڵکێشن |
| 191 | قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەرەدا |
| 192 | سەرکردایەتیی کردنو مەرجەکانی |



# کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
# مامۆستا عەلی باپیر

- ناو: عەلی باپیر وەتمان .
- لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.
- زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیەو سلێمانیی)و لە لای زانایانی کوردستانی عێراقو "دواتریش کوردستانی ئێران" بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپیری لەبەر کردوە.
- لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتووەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.
- لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراقو لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامییو...هتد.
- یەکەمین بەرهەمی لەساڵی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) پاشان کتێبو بەرهەمەکانی بەردەوام بوون کە ئێستا ژمارەیان لەسەد (١٠٠) تێپەڕیوە، لە مەوسووعەو کتێبو نامیلکەو، بەزمانی کوردییو عەرەبییو، هەندێك لە کتێبەکانیشی کە بەزمانی کوردیی نووسیونی، بۆ زمانەکانی: عەرەبییو، فارسییو، تورکییو، ئینگلیزییش وەرگێڕراون.
- لەساڵی (١٩٨٧ز)دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامییدا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانی سەدەی پێشوودا ڕێکخستنە نهێنییەکانی دامەزران، چۆتە چیاو دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعسو، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.
- لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

- لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز)داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەستو ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی‌و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا.
- تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.
- لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلي في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب‌و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسیی‌و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.
- تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێب‌و نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی‌و عەقیدەو فیقهو حوکم‌و سیاسەت‌و تەزکیەی نەفس‌و ئەخلاق‌و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان‌و...هتددا.
- لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.
- کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز)داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.
- ئێستا پرۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردووە، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپ‌و بڵاوکراوەتەوە.

بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net



# نێـوەڕۆك

## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجـەم

## ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەک و ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەک لەبواری: تەزکیەی نەفسدا.......................................... ٢٠٩

## بەشی شەشەم

## دوایین بۆچوون و سەرنجەکانم لەمەڕ تەزکیەی نەفس ........٢٥٩

## بەشی حەوتەم

## بەشی هەشتەم

## بەشی نۆیەم



## بەشی دەیەم

# ڕێگای
# صاڵح بوون و
# بەرەوخواچوون

ئەم کتێبە کە هەتا ئێستا شەش جاران "بەکوردیی" چاپکراوە و، لەهەرشەش چاپەکەشیدا دەستکارییم کردووەو کەمو زیادییم تێداکردوە، بەسەرچاوەیەکی گرنگی خۆپاكو چاککردن (تزکیە النفس)و، صاڵح بوونو بەرەوخواچوونی دەزانمو، دەتوانم بڵێم: پوختەو گوشراوی سەرجەم کتێبو سەرچاوەکانی ئەو بوارەیەو، شیلەو ڕاپازنەراوی ئەزموونی تایبەتیی خۆشمەو، کتێبێکە، سی (30) ساڵی ڕەبەقە: کاری تێدادەکەمو بژاری دەکەمو دەیگەیەنم، بۆیە هیوادارم لەم چاپی شەشەمەیدا، لەجاران پتر مایەی بەهرە لێوەرگیران بێ‌و، هەرکەس بە جیددیی‌و قووڵ ڕامانو تێگەیشتنەوەو بەمەبەستی پاكو چاك، یان پاکترو چاکتربوون، بیخوێنێتەوە، دڵنیام دەبێتە هاوکاری چاکتر تێگەیشتن‌و باشتر پێگەیشتنی.



www.alibapir.net

/alibapir1

/alibapir





**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com


